بیرەوەری

# بە خەونی گەورەوە کەوتینە ڕێ

**بەرگی دووەم**

**٢٠٢٠**

# به خەونی گەورەوە کەوتینە ڕێ

نووسینی: مامۆستا جەعفەر (فازیل کەریم ئەحمەد)

بابەت: بیرەوەری

دیزاینی بەرگ و ناوەوە: ئومێد محەمەد

تیراژ: ٣٠٠٠ دانە

نرخ: ٨٠٠٠ دینار

چاپی یەکەم: بەرگی دووەم ٢٠٢٠

چاپ: چاپخانەی تاران

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە
گشتییەکان ژمارە( ١٦٨٤ )ی ساڵی ٢٠١٩ی پێدراوە

---

**پێشکەشە بە:**

عەبدولرەزاق فەیلی
نمونەی مرۆڤی خاوەن هەڵوێست و جوامێری و
رەوشت بەرزی گەلەکەمان

---

# پێرست

## سوپاس و پێزانین

زۆر سوپاسی ئەم هاوڕێ و هەڤاڵانە دەکەم، کە بۆ ئامادەکردنی ئەم کتێبە یارمەتیان دام و زانیاری بە نرخیان بیر هێنامەوە و کتێبەکەیان دەوڵەمەندتر کرد:

سالار عەزیز، مەلا بەختیار، فوئاد قەرەداخی، شێخ ئەشرەف تاڵەبانی، فوئادی مەجید میسری، موحسین عەلی ئەکبەر، عیماد ئەحمەد، سامان گەرمیانی مامۆستا جەلالی شێخ کەریم، شێخ تاهیری خاوێ، کەمال شاکر، هادیە سور، د. موشیر، شێخ محەمەد عەزەدین، محەمەدە سوری شێنێ، ئەحمەد ساروخ، پشکۆی سەعید ناکام. کاوەی مەلا مەحمود، شێخ میقداد شێخ بەهائەدینی داربەڕوو، ئازاد تۆفیق، ئەسەد حوسێن، دلاوەر ئەحمەد مەجید، ڕۆستەم کەرکوکی ، د. سەیوانی عەلی ڕەزا، مەلا صەبار (سەبار) چرچەقەڵا، سەلامی فەقێ عەلی، حەمەی ئیعلام. بەهادین ئیعلام (بەهائەدین عەبدوڵڵا)، خەباتی شێخ جەناب، شاڵاو خەراجیانی، شلێری مامۆستا غەفور ژاژڵەیی، عەتا قەرەداخی، عبدولکەریم مەولود....

حەسەن یاسین ئەرکی هەڵەبڕی لە ئەستۆ گرت، ماڵی ئاوا بێت و هاوار تۆفیق بە تایپکردن، سەبری ئەیوبی نواند، سامی هادی کارئاسانی زۆری بۆ کردم و سەرپەرشتی پاژێکی گەورەی کارەکانی کرد..

# پایتەختی شۆڕش
## (١)

- ((ئەرێ کوڕەکە! ڕەدووم ناخەیت؟))

پاش قۆناخی چاوبڕکێ، چاوداگرتن، زەردەخەنە و بە یەک گەیشتن لەبن دار هەناراندا. کیژێکی شۆخ و شەنگ ئەم پرسیارە زۆر سادەیە لە پێشمەرگەیەکی نەکردەو بێ ئەزموون دەکات.

ئەویش بەکورتی وڵامی دەداتەوە:

- ((من خۆم ڕەدووی* شۆڕش کەوتووم!))

پێشمەرگەکە لەبن باری تفەنگ و تاقم و ئایدیۆلۆژیای زەردو سوور خۆی بارکردبوو. ئەو دڵە گەورەیەی ئەو، جگە لە شۆڕش، جێگەی خۆشەویستی تێدا نەدەبووەوە. ئێمە بە هەڵە لە ژن و ژیان و شۆڕش تێگەیشتبووین!

شێنێ ئەو زەمانە پایتەختی سەربەرزی شۆڕش بوو. ڕەنگە تاقە گوندی کوردستان بووبێت، کە بە هەڵمەتی بەرەنگاری و لوولەی تفەنگ، ڕژێم نەیتوانی رایبگوێزێت. هێرشە یەک لەدوای یەکەکانی سوپای ڕژێم لەسەر دەستی ژن و پیاوی ئەم دێیە تێکشکێنران..

---

* ڕەدووکەوتن: لەخۆشناوەتی دەبێتە (بەدووکەوتن) لە گەرمیان دەبێتە رفاندن. کچێک و کوڕێک پێکەوە دەڕۆن، بەبێ مەلا و مارەیی و ڕەزامەندی ماڵی باوکی کچەکە و لەهەندێ شوێنی کوردستان خوێنی لێدەکەوێتەوە. لەچەندین دەڤەریش (ڕەدووکەوتن) نەریتە. لەبن کاریگەری کولتووری عەرەبی رووبەری جوگرافیای (ڕەدووکەوتن) بەرتەسک بۆتەوە.

سـەد خێزانـی ئـازاو دەسـتڕەنگین لێـرە دەژیـان، سـەنگەری پێشەوەی شۆڕش بوون.

ئـەم گونـدە لـەناو ڕەزو بـاخ و لێرەواردا، سـێ وەرزی سـاڵ سەری سەوزە. زستانان جلی بووکێتی سپی لەبەردەکات و بە بـزەو پێکـەنینی کیـژە جوانـەکانی خـۆی دەڕازێنێتـەوە. شـێنێ کۆرپەیـەکی سـاوایە و لـە ئـامێزی شـاخی مامەنـدەدا خـەوی لێکـەوتووە. بەرخۆڵەیـەکی زیوینـە و خـۆی گرمۆڵـە کـردووە. مامەندە دیواری چینی مەزنە و ئەم دێیە دەپارێزێت.

شـێنێ و زەڵـێ و خـڕی نێرزەنگی(کەشـتی نـووح)ی شـۆڕش بـوون. لافـاوو تۆفـان هەڵیـدەکرد، کەشـتی بەسـەر دەریـادا دەڕۆیشـت (وإستوی علـی الجـودي). خـەڵکی شـێنێ ئاسایشـی خۆراکیان بۆمان دابین دەکرد، شوورەی پۆلایینی شۆڕش بوون. تـۆڕێکی بازرگـانی کـارا و رایەڵـەی کـارو کەسـابەتی فراوانیـان لەسـەر سـنوور دامەزرانـدبوو. ئەحمـەد سـاروخ* خـاوەنی گەورەترین ئیمپراتۆریەتی ئابووری و دراوی ئەو چەمە بوو:

((کاک ئەحمەد دەنگ و باس چییە؟))

---

* ئەحمـەد سـاروخ: ئەحمـەد عەبـدوڵڵا رەسـوول، خـەڵکی شـێنێیە و لەدەوروبەری ساڵی ١٩٣٨ لەدایکبووە. نازناوی ساروخیش لەوەوە هاتووە: لە شۆڕشی ئەیلوو لە بەشی مەشق پێکردنی ساروخ و هاوەندا بووە. بۆیە پێیان وتوە ئەحمەد ساروخ. ئەحمەد ساروخ گوتی: مام جەلال(٧٠.٠٠٠) حـەفتا هـەزار دینـاری بـە قـەرز لێوەرگرتم..)) ئـەم دەزانێت بـاری دارایـی شۆڕش کزەو ئـەوان نـاتوانن پارەکە بـە ئاسـانی بدەنـەوە، بـە مـام جـەلال دەڵێت: مام جەلال من پارەم بەدیاری داویتی و بە قەرز نەبووە.

((چل و هەشت تمەن و چوار قران!))*

شۆڕش گومرگی خۆی هەبوو. بەو پارەیە پێویستیەکانی خۆی دابین دەکرد. ئەحمەد ساروخ کێشە داراییەکانی (کەشتی نووح)ی بە ئاسانی چارەسەر دەکرد. هەرچەندە ئەو نەخوێندەوار بوو، بەڵام پارە گۆڕینەوە، پارە رەوانەکردن، قەرزی گەورەش بۆ (مەکتەبی دارایی) بەهاوئاهەنگی لەگەڵ ئەودا جێبەجێدەکرا. وەزیری دارایی ئەو سەردەمە بوو..

ئەحمەد ساروخ گوتی: ئێمە حەوت ساڵ شۆڕشمان بەخێوکرد. ئێمە دڵی شۆڕش بووین. دوای سەرکەوتن، روویان لێوەرگێڕاین.. دەسەڵاتی پایتەختی دێرین و زێرینی خۆیان لەبیرکرد.

(( ئەی لە ئەکەتیو نیم!))

ولاخدارێکی شێنێیی لەهێسترەکەی توورە ببوایە بەم شێوەیە جوێنی بە (ئەکەتی) دەدا. بەردێکیش لەو ئاسمانە بەربوایەتەوە، ئەو هەقی بەسەرەوە نەبوو، یەکێتی بە تاوانبار دەزانی و جوێنی مزری خۆی دەدا (ئەی لەئەکەتیونێم!) رۆژی سەدجار بەرگوێت دەکەوت..

- (ئەی لە فسێت نێم ئەکەتی!).

لە دامێنی رۆژهەڵاتی دێکە، چەمی (پشکاوێ) عیراق و ئێران لە یەکتر جیادەکاتەوە. تۆزێ سەرووتر، ئەم چەمە ناوی چۆمی نۆکانە. لەخوار ئاشی پشکاوێشەوە ناوی دەبێتە (زەندان) و لای ژاراوە و مارەدووان دەبێتە چەمی ژاراوە.

---

* مەبەستی نرخی یەک دیناری عیراقی بەرامبەر تمەنی ئێرانی بووە.

گوندی گۆڕەشێر بەرامبەر شێنێیە. چیای بێدەلانیش بەرامبەر شاخی مامەندەیە. پردێکی دارینی رزیوی خۆکرد، لای ئاشی پشکاوێوە دوو پاژی کوردستان بە یەکەوە گرێدەدات. بێدەلان شاخێکی سەوزە. تەنیا لێرە داربەڕووی زۆر بەرزو ڕێک و پێکم بینیوە، هەرچی داروبەڕووی کوردستان هەیە، هەمووی نزم و خوارو خێچن.. شێنێ کانیاوی زۆرە. باخ و بێستانی ئەم دەڤەرە جوان و رازاوەیە.

# ڕەدووکەوتن

## (٢)

دێهاتی ئەم دەڤەرە، هەر لێرەوە تا سەردەشت، بەکراوەیی لەسەر ڕەدووکەوتن دەدوێن. کانی زەرد، بەنوخەڵەف، بێوران، (خڕی نێرزەنگێ) بەسەردەشتەوە گرێدەدەن. ژنم لە مەجلیسی پیاواندا بینیوە، هانی کوڕێکی داوە فلانە کچ ڕەدووبخات. لەگەڵ شێرکۆ عەبدوڵلادا* لە دۆڵی سویسنایەتی بووین. ژنێک وا بەگەرمی باسی ڕەدووکەوتنی دەکرد. شێرکۆ لەپەناوە پێیگوتم:

((مامۆستا زوو هەستە با بڕۆین! نیو سەعاتیتر لێرەبین دەمانخەنە سەر کەلکەڵەی ڕەدووخستن و ئێمەیش هیچی لێنازانین!))

من (ئایشە سوار)م بینیوە. ئەوکاتە ژنێکی سەرەبوو، پرسیم: ((چما ئەم ژنە ناوی ئایشە سوارە؟))

---

* شێرکۆ: حسێن عەبدوڵلا کادرو پێشمەرگەیەکی بەڕێز بوو.پیاوێکی قسە خۆش و خاوەن هەڵوێست بوو. زۆر حەزی لە گاڵتە و پێرابواردن و قسە و قسەڵۆک نەبوو. ماوەیەک فەرماندەی کەرتی ڕاگەیاندن بوو. ڕۆژی ١٩٨٨/١٠/١١ لەگەرمیان شەهید کرا. ئازادی سەگرمە بۆی گێڕامەوە:

((ڕۆژێک پێش هێرشی سوپای ڕژێم پێکەوە بووین. پێمگوت: کاک شێرکۆ سبەی ڕژێم هێرش بۆ ئێرە دەهێنێت. ئێوە دەتوانن دەربچن. ئەو گوتی: من لەم هەل و مەرجە چۆن ئێوە جێدەهێڵم. ئامادەم بمرم، بەڵام ئامادە نیم یەک هەنگاو لێتان دوور بکەومەوە..! بەڕاستی پیاوێکی ئازاو بە هەڵوێست بوو. چی هەوڵمدا بڕوات نەڕۆیشت. ڕۆژی دواتر هەلیکۆپتەرەکان پەلاماریان داین. یەکەم ساروخ بەر ئەو کەوت...))

((تاقە ژنە لەم دەڤەرەدا، کە بەسواری ئەسپ و دەهۆڵ و زورنا، شایی و هەڵپەڕکێ، مەلاو مارەبی، لەماڵی باوانەوە بۆ ماڵی زاوا بەڕێ کراوە!))

ژنانی ئێرە وەکو ژنە فەرنسیەکانی شاری لۆزان جوێن دەدەن: ((ئەگەر ژنێکی جوان بای رەدوویان دەخستیت!)). ژنان لەم دێهاتانەدا بەم شێوەیە، یەکتر وەبەر تانە و تەشەر دەدەن. بەشێک لە گەنجانی ئەمڕۆی شێتێ بە ئەقڵی ئەمڕۆیان بیر لە دیاردەیەکی کوردانەی کۆن دەکەنەوە. هەروەکو چۆن ئەمڕۆ لەپاریس و ئەمستەردام و پراگ(رەدووکەوتن) عەیبە نییە، لەزۆر ناوچەی کوردستانیش رەدووکەوتن عەیب نەبووەو باو بووە. هاتنی کولتووری عەرەبی نەریتەکەی گۆڕیوە. هەڤاڵ کوێستانی جارێکیان بە پوورە کەسکەی گوت:

((پوورە کەسکێ چەند جاران رەدووکەوتووی؟))

((ئەمن حەفت جاران رەدووکەتیمە!)).

مام ئەحمەد مێردی پوورە کەسکێ بوو، هەر لە حەمە کەوڵەی باوکی خولە پیزە دەچوو. سەرو گوێلاکی لەوە نەدەچوو ژنانی رەدوو خستبێت، کەچی بەرسیڤی پرسیارەکەی هەڤاڵ کوێستانی بەم شێوەیە دایەوە:

((ئەمن سێ جاران ژنم رەدوو خستیە!)) ئەمەیە رۆڵە..

پوورە کەسکێ (١٩٠٥ــ ٢٠١٥) لە تەمەنی ١١٠ ساڵیدا ماڵئاوایی لەژیان کرد. ئەو نەماوە سێبەرەکەی ئەو بەسەر زەڵێ، کێوە سوور و گۆجاردا هەست پێدەکرێت و قسەکانی لە گوێمدا دەزرنگێنەوە.

لەناو گوندی شێنێ و دەوروبەری دیالێکتی خۆیان هەیە:

- ئامۆزامە ⟵ دەبێتە: ئامۆزانم
- برازامە ⟵ برازانم
- هی خۆمانە ⟵ ئی دەخۆنە
- یەکێتی ⟵ ئەکەتی
- ئاوها: ئاوا ⟵ ئیوهەی

لەوێ، لەسەر (رەدووکەوتن) نوکتە و قسەی خۆش و سەربوردەی سەیر هەیە، ئەوان لەگەڵ دۆست و ئاشنای خۆیاندا بۆ کۆڕگەرم کردن و مەجلیس رازاندنەوە، چیرۆکی ئەوتۆ دەگێڕنەوە لەهیچ کتێبێکدا بەرچاوت ناکەوێت. من زۆر حیکایەت و داستانم بیستووە، ئەمە یەکێکیانە:

کیژێکی شێنێیی دووگیان دەبێت، داماوە خۆیشی نازانێت ئەم منالە منالی کێیە؟ خەریکە بارودۆخی ناو دێ بەهۆی نادیاری ناسنامەی باوکەوە، بەتەواوی تێک دەچێت. پاژێک لەتەم و مژی گومان لە جغزی (ئی دەخۆنە) چەق دەبەستێ!

پاژێکی تری سێبەری گومان دەکەوێتە سەر پۆلیسی مەخفەرەکە. پیاوێکی زۆر ئاقڵ، پیاوانی دێ کۆدەکاتەوەو چارەسەرێکی زۆر زانستی و لۆژیکی بۆ کێشەکە دەدۆزێتەوەو بە چارەسەری سیحری و ئەفسوناوی دادەنرێت و پیاوانی دێش هەر هەموویان بەگونجاوترین و باشترین چارەسەری دەزانن.

((با جارێ ماوەیەک چاوەڕوان بین و هیچ دەنگێ نەکەین. ئەو کیژە منالی دەبێت، یان ئی دەخۆنە یان ئی پۆلیسانە! ئەگەر

ئەو منالە قۆپچە و ماشەڵلای پێوەبوو، ئەوە ئی پۆلیسانە. ئەگەر هیچی پێوە نەبوو ئەوە ئی دەخۆنە. ئیدی بابم هیچ قسەی ناوێت و چاوەڕان دەبین..))

((قەحبۆکێ.. قەحبوکێ..))

بەیانیان بەدەنگی فڕۆکە و ڕێژنەی گوللە بە ئاگا دەهاتینەوە، کەچی پوورە کەسکێ وشەی قەحپەی بچووک کردبوەوەو لەگەڵ بەهائەدین باسی شۆڕشی درێژخایەن دەکرا. بەم شێوەیەش بانگی کچە بچووکەکەی دەکرد.

پیاوانی ئەم ناوە زۆربەیان نێویان خدر، ڕەسووڵ، عەوڵڵا، ووسووە. ئەمە زنجیرەی مەلیک و شاکانی فەرەنساو ئیسپانیای جارانم بیردەخاتەوە: لویسی چواردە و لویسی پانزە.. کارلی دووەم کارلی و سێیەم و کارلی چوارەم.. ناوی زۆربەی کوێخاکانی ئەم وڵاتە کوێخا خدر بوو. کوێخا خدری شێتێ، کوێخا خدری زەڵێ، کوێخا خدری بەنوخەڵەف، کوێخا خدری نەلاس و....

چیرۆک و داستان و (خدرنامە)کان ئێجگار زۆرن و من یەکێکتان بۆ هەڵدەبژێرم:

کوێخا خدر لەگەڵ دەمڕوتێک تووشی قرەقرو پێک هەڵپڕژان دەبێت. کوێخا خدر خراپ تووڕە دەبێت و بڕیاری تۆڵە سەندنەوە دەدات و هەڕەشەی زۆر توندی لێدەکات:

((سەگباب! چاو بەرەو ژێرانت دەکەم!

ئەگەر کوێخا خدربم شەرت بێت نەهێڵم ئەمەت بەسەرەوە بچێت. دەبێ چاو بەرەو ژێرانت بکەم! سەگباب!))

کوێخا خدر، هەر خۆی کوێخا خدر بوو. پیاوێکی ژیر، زانا، دانـا، زۆرزان، خـاوەن ناووناوبانـگ، خـاوەن دیوەخـان لەگـەڵ حەمـەد ناوێـک لەسـەر مێگـەڵ لەوەڕانـدن دەیکاتـە هـەرا. بـە بەرچاوی پیروکاڵەوە هەڕەشەی توندی لێدەکات. دەچێتەوە ماڵێ و نەخشەو پلانێکی زۆر ورد و ترسناک دەکێشێت.

فاتۆڵەی کچی حەڤدە ساڵان دەبوو. زۆر جوان، ئەبرۆ کەوان، لێو قەیتانی فەرەنگی زۆرئاڵ، مەمک پرتەقاڵ، رووگەش، لە مێک ئاپ و ئارایش بێبەش، چاو سیحراوی و خـان و مـان. زمـان، هەنگوینی کوێستان. باوک بە کچ دەڵێت:

((حەمەدی کوڕی ووسووە چاو گێڕی دەناسیت؟))

((بەڵێ بابە!))

((ئەگەر لە رێگەی سـەرکانی چاوت پێی کەوت، دوو قسـانی لەگەڵدا بکە! بەخودای ئەتۆ کچی بابی خۆتی..))

فاتۆڵـە بـە پیتـۆڵی و ژیری خـۆی لەمەبەسـت و پلانـی بـابی تێگەیشت.

فاتۆڵـە و حەمـەد لەسـەر رێـی کـانی بـە یـەکتری دەگـەن. (رۆمیۆو جۆلێت)) و ((شیرین و فەرهاد)) داسـتانێکی نـوێ تۆمـار دەکەنەوە. کات و جێ ژووان دیاری دەکەن.

راستە کوێخـا خـدر نەخوێندەوار بـوو، بەڵام دەیتوانی دەنکە جۆ بە دیواراندا هەڵگێڕێت. ئاگای لە خشەی مارو مێروو بوو.

حەمـەد زوو زوو لەگـەڵ فاتۆڵـەی بـە یـەکتر دەگـەن. کوێخـا خدر چاودێری باروزۆخەکە بەجوانی دەکات. رۆژێک لەناو پەڵە چنارێکی بەرامبـەر دێبەرەکـە دەبێت. هـەردووکیان دەبینـێ روو لـەکادێنی دەکـەن. بـەدوو قەڵـەمبازان دەگاتـە لایـان و لـەژوور

سەریانەوە دەست لەسەر مشتی خەنجەری دەبان دەوەستێت. ئەو چرکەیە هەردووکیان پیس لە یەکتر هاڵابوون، حەمەد هەر بەراستی چاو بەرەو ژێران دەبێت! کوێخای زۆرزان و لەبلەبان بە دەنگێکی نێرانە دەڵێت: ((حەمەد! هەتیم! ئیوەهەی چاو بەرەو ژێرانت دەکەم!))

من بڕوا ناکەم لە فلۆرەنس و لۆزان و سانفرانسیسکۆش تۆڵە سەندنەوە بەم شێوەیە سپۆرت و پۆست مۆدێرنە بێت!!

# بارەگا

## (٣)

ناوەڕاستی نۆڤەمبەری ١٩٧٨ وێڕای چوار (پ. م) بەرەو زەڵێ و خڕی نێوزەنگ بەڕێ کەوتین. مام جەلال، نەوشیروان و ملازم سەید کەریم لەدۆڵەکۆکێ مانەوە. هەر لەبەندەنی بێدەلان بەم دیودا هاتین، هەستێکی سەیرم لا دروست بوو: لەجیهانێکەوە بۆ جیهانێکی تر چاومان کردەوە. پێنج مانگ دابڕان لە کۆمەڵ و ژیانی ئاسایی. ژنان بۆ مێرگۆلان دەچن. گوند، خانوو، جووتیار ماڵەغانی لەسەر شان داناوە. قیڕەی قاز، قەل، مریشک، زەڕەی نێرەکەر، وەڕین، دوکان، قاچاخچی و بارهەڵگر... تاد. لەسەیرکردنی هیچ شتێک تێر نەدەبووین. پێشمەرگە و کادرەکان لەوسەری (زەلی)وە، لەبن رەشماڵێکی گەورەی ماڵی پوورە کەسکێ بوون. دلێری سەید مەجید، عەلی شامار، م. سەلام عەبدوڵلا، م. نووری حەمە عەلی جەباری، پشکۆی سەعید ناکام، مولازم جەمال مەندلاوی و عەبدولخالق (ئاکرەیی) لەبن ئەو تاوڵەدا پێشوازییان لێکردین. چەند شەقاوێک لەماڵی پوورە کەسکێ و مام ئەحمەدەوە دوور بووین.

یەکەم رۆژ وەستایەکەمان دۆزیەوە ناوی (حەسەنی حاجی ئەحمەد) و دانیشتووی شێنێ بوو. ئیدی خۆی ئەندازیار و ئەرشتێکت و بەڵێندەری گشتی بوو. لەسەر کرێ و کرێکار و کات رێکەوتین. شوێنی دوو ژوورمان، بەبێ گوریس دیاریکرد: ژوورێک بۆ مام جەلال و ژوورێک بۆ (م.س) رەچاوکرا. وەستا حەسەنی حاجی ئەحمەد گوتی: ((سەرووی ئێرە (زینۆی سوور)ە و ئێرە سێ چوار کانی جوانی لێیە و هەرەس

نایگرێتەوە..)) من هەر بیرم لای بۆردومانی فڕۆکەی جەنگی و تۆپبارانی ڕژێم بوو! کوێ دەگرێتەوە و کوێ ناگرێتەوە؟

پەڵە هەور، زۆرجار ئاسمانی دادەپۆشی. لەنێوان کێبڕکێی وەستاو کرێکار لەگەڵ وەرزی باران و تەڕوتووشی رامابووم. زوو دیوار بەرز بکەینەوە. تۆزێک شارەزای سروشت و کەش و هەوای کوێستان بووم. دەمزانی هاتنی (م.س) بۆ نێوزەنگ و هاتووچۆی هێزی (پ.م) نوایەکمان لە وەرزی سەرماو سۆڵەدا نەبێت، هەمووومان پەرێشان دەبین. خەڵکی کوێستان لەناوەڕاستی زستاندا، پاچ و خاکەناز لەسەر شان دانانێن. چوار چین دیوار بەرزکرایەوە، سێ چوار ڕۆژ باران دایکرد. دوو ڕۆژ خۆشی کرد، چوار پێنج چینیتر بەرزترکرانەوە.. بە بیوران کەوتینە داربەڕوو بڕینەوە: کاریتە، دنگە و دارەڕا. بە پەلە پەل، بە جەگەن* و لقی دارو گەڵا داپۆشرا. بە چەند سەعاتێک گڵەبانمان کرد. شەو تا بەرەبەیان دیسانەوە بەخوڕ باری.

پاش نیوەڕۆ سەرەوژوور هەڵکشاین. لە دوورەوە ژوورەکەمان لەجێگەی خۆی مابوو، کوڵێک دڵمان پێی خۆش بوو!. ڕێکەوتێکی زۆر سەیر. درزو و تلیسانم بە دیوارەکانەوە نەبینی. بەگەرمی فەرموو! فەرموویان لێکردم بچمە ژوورەوە. تەنیا یەک هەنگاوم نا. هەستم بە باڵەفڕەو سەمای کاریتە و بنمیچە کرد. هەروەکو فیشەکی گڕدار بەرەو دواوە پاشەوپاش گەڕامەوە. پێش ئەوەی رستەیەک بڵێم: ((ئاگاداربن! سەربانەکە دەڕووخێت بکشێنە دواوە)) سەربان هەرەسی هێنا. لەنێوان ژیان و گۆڕی بەکۆمەڵ، چاوترووکانێکی تەلیسماوی جیای کردینەوە.

---

* جەگەن: زەل: ڕووەکێکە لەناو زۆنگاو قەراخ ڕووبار شین دەبێت.

## کۆبونەوەی شێنێ
## (٤)

کۆمەڵە لەنێوان ٣ ـ ١٩٧٨/١١/٢٦ زنجیرەیەک کۆبوونەوەی کرد. تا شەوی ١٩٧٨/١١/٨ سەرکردایەتی و کادرە پێشکەوتووەکان کۆبوونەوەکەیان* لە شێنێ لەدیوەخانەکەی عەبدوڵڵای کوێخا رەسووڵ بوو. ئەم کۆبوونەوەیە لەسۆنگەی پەلاماری گوندی شێنێ لەلایەن سوپای عیراقەوە، کە نۆ رۆژی خایاند (٨ ـ ١٩٧٨/١١/١٧) پچڕانی تێکەوت. دوای کۆتایی پێهاتنی شەڕەکە (ناوەندی کۆمەڵە) هەڵبژێردرا:

١. نەوشیروان مستەفا
٢. سالار عزیز
٣. مەلا بەختیار
٤. ئازاد هەورامی
٥. مامۆستا جەعفەر

لەکۆتایی کۆبوونەوەکەدا، پەیامێک بڵاوکرایەوە، کە ئەمە ناونیشانەکەیەتی (فرمانەکانی قۆناخی ئێستای خەبات مان

---

* ناوی ئەوانەی لەم کۆبونەوەدا بەشداربوون:

((نەوشیروان مستەفا، مەلا بەختیار، مولازم عومەر عەبدوڵڵا، ئازادی سەگرمە، دلێری سەید مەجید، رێباز، مامۆستا نوری حەمە عەلی جەباری، جەلال تۆفیق، ئیحسان نەجم ـ ئەبو شەهاب، ئاوات قارەمانی، وەهاب ـ بەهائەدین شێخ ئەحمەد ـ شۆڕش ئیسماعیل ـ مەحموود ـ ، حەمە سەعید، هاوڕێ جەبار، زێڕۆی عەبدوڵڵا رێوی، شێخ تالیب بەرزنجەیی، عەلی ئامەخان، ئیبراهیم جەلال، م. جەمال مەندەلاوی، نەبەز، شاخەوان، جووتیارو مامۆستا جەعفەر...)).

لەکۆبونەوەی فراوانی کادرانی کۆمەڵەدا) بریتییە لە (١٨) لاپەڕە و ناوی (ناوەندی کۆمەڵەی مارکسی ـ لینینی کوردستان)ی لەسەر نووسراوە. نەوشیروان مستەفا ئەم دەقەی داڕشتووە. ئازاد هەورامی و شێخ عەلی و عەلی شیعە و حامیدی حاجی خالید لای پ. د. ک دەست بەسەر بوون. چارەنووسیان دیار نەبوو. بۆیە وەکو ڕێزلێنانێک بەبێ سێ و دوو کردن ئازاد هەورامی لەناوەندی کۆمەڵە دانرایەوە..

مەبەستی کۆبوونەوەکە، بەڕووکەش شتێک بوو، لەدیوی ناوەوە شتێکی تر بوو. ئەم کۆبوونەوەیە تەنیا شەش مانگ پاش کۆبوونەوەی نۆکان کرا، کە تێیدا سەرکردایەتی و ناوەندی کۆمەڵە هەڵبژێردران. نە سەرکردایەتی بڕیاری کۆبوونەوەی دابوو، نە هیچ پێویستیەک لەئارادابوو. کۆدێک بەدڵی کەسێک نەبوو، ویستی کۆدێک لەبەرچاوی بێت، کە بە دڵی خۆی بێت، ئەوەش سەری نەگرت و ڕەشەبا بەدڵی ئەو هەڵینەکرد.

نەوشیروان بە زارەکی ڕاپۆرتێکی لەسەر هەلومەرجی ((کارەساتی هەکاری)) هێنایە سەر زمان. کادرەکان تێبینی و سەرنجی خۆیان لەسەری دەربڕی. هەریەکە تیشکی خستە سەر بارودۆخی ڕێکخستن لە سنووری کارو چالاکی خۆی.

یەکێک لە سەرکردەکانی کۆمەڵەی ئەودیو وەکو میوان لەوێ ئامادە بوو. تێبینی ئەوەی کرد: لە کۆبوونەوەکەدا ئەوەندە بایەخ بە خەباتی چینایەتی نەدراوە، خەباتی نەتەوەیی پتر زەقکراوەتەوە.. نەوشیروان تێبینی ئەو سەرکردەیەی بەدڵ نەبوو، دەم و چاوی بە یەکدا دا. بە کورتی وەڵامی دایەوە، گوایە ئێستا کاتی خەباتی چینایەتی نەهاتووە.

رۆژی ۱۹۷۸/۱۱/۷ مام جەلال بەشداری کۆبوونەوەکەی کرد. نزیکەی دوو سەعات لەسەر پێکهاتن و پێکهاتەی یەکێتی و گرنگی یەکێتی بۆ کۆمەڵە قسەی کرد. خۆی سەرلەنوێ بەدامەزرێنەری کۆمەڵە دانا. گوتی: دروستکردنی یەکێتی بۆ بەهێزکردنی کۆمەڵە بووە. یەکێتی گۆماوێکە و کۆمەڵە دەتوانێت بە ئارەزووی خۆی مەلەی تێدا بکات.

مام جەلال گوتارەکەی نەگەیاندە کۆتایی، پێشمەرگەیەک هاتە ژوورەوە و گوتی: ((ئەژدەر ـ کملک ئەندامی کۆمەڵەیە و ئێستا لە شارەوە هاتووەو دەنگوباسی ناو شاری سلێمانی پێیە و دەیەوێت بێتە ژوورەوە..)) گوتارەکەی تەواو کردو رێگە درا ئەژدەر ـ کملک* بێتە ژوورەوە. ئەژدەر بە کلێتە و کوڵەباڵ و پوزەوانە و جلی خاکیەوە، وەکو رەشەبای ئاگر خۆی بە ژووردا کرد. بەگەرمی بەخێرهاتنی کرا.

مام جەلال پرسیاری لێکرد:

((ناوت چییە؟))

((ئەژدەر ـ کملک!))

((لەشارە حەیاتەکەوە هاتووی؟))

((بەڵێ مامە گیان!))

((کۆمەڵەی یان یەکێتی؟))

---

* ئەژدەر ـ کملک: عومەری زێرنگەر: ئەژدەر پیاوێکی قسە خۆش و بەهیمەت بوو، لەسەر رووداوەکانی ئەوکاتە رۆژانە شیعری دادەنا. ئەم بەیتەم بیرماوە، کە لەسەر زێرۆی عەبدوڵلا رێوی دایناباو: سەگێک پەلاماری ئەژدەری داوەو وتویەتی لەسەگ نەترسی: ئەو

سەرکردەیەکی بیری مارکسی

بە پێشمەرگەی دەگوت لەسەگ نەترسی

بە ئەوپەڕی حەماسەوە ((مامە گیان کۆمەڵە! کۆمەڵە! کۆمەڵە!))

((لەسلێمانی کارت چی بوو؟))

بەدەنگێکی زۆر بەرز و زوڵاڵ: ((کرێکار! کرێکار! کرێکار!))

هەر جارێک هەڵدەساو دەستی راستی بە مست نووقاووی، سێ چوار جار بەرز دەکردەوە:

((لەکوێ کرێکار بووی؟ لەکارگەی چیمەنتۆ؟ کارگەی جگەرە؟ لەکوێ ؟))

خۆی لە پشت دوو سێ پ. م شاردەوەو بە دەنگێکی زۆر کزو نزم: ((زێڕنگەر!))

بوو بە پێکەنینک و کەس نەیتوانی خۆی بگرێت.

ئێوارەی ئەو رۆژە نامەیەک بۆ مام جەلال هات. رژێم هێزێکی زۆر گەورەی بەرەو (قوتەی مامەندە)) بەڕێ کردووەو ئەمشەو هێرش دەکات. نامەکە جەختی لەسەر ئەوەش کردبوو، چل هەلیکۆپتەری جەنگی و سەربازهەڵگر لای قەڵادزەن. ئیدی ناچاربووین بڵاوەی لێبکەین!

لەم کۆبوونەوەیەدا بە هیچ شێوەیەک باسی گۆڕینی ناوی کۆمەڵە نەکراوە*. پاش ئەم کۆبونەوەیە چوار ژمارەی (کۆمەڵە) دەرچووە، کە ئۆرگانی کۆمەڵەی مارکسی ـ لینینی کوردستان بووە و گۆڕان بەسەر ناوەکە دا نەهاتووە. پەیامی کۆبوونەوەکەش هەر بەناوی (ناوەندی کملک) ەوە بووە.

---

* بڕوانە: نەوشیروان مستەفا: لەکەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناو زەنگ ل ٣٥٨

مانگی ئەیاری ١٩٧٩ ناوی کۆمەڵە (کملک) گۆڕدرا بۆ کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان (کۆرەک).

# شەڕی مامەندە
# (٥)

شاخی مامەندە بەسەر هەموو دەشت و دۆڵ و دێهاتی ئەمبەرو ئەوبەری سنووردا دەڕوانێت. هەر لایەک (قوتەی مامەندە) داگیر بکات. بە ئاسانی دەتوانێت دەسەڵاتی ڕەهای خۆی بەسەر جموجۆڵ و هات و چۆی ناوچەکەدا بسەپێنێت. سوپای ڕژێم شەوی ١٩٧٨/١١/٨ سەعات ١:٢٠ یەک و بیست دەقیقە، بەهاوەنباران و تۆپباران پەلاماری قوتەی مامەندەی دا. دەستەیەک (پ. م) ی کەم ئەزموون لەوێ بۆ پاسەوانی بە بەردەوامی جێگیرکرابوون، بە چەند سەعاتێک هەڵکەنران. سەربازەکان سەنگەرە چۆڵکراوەکانیان داگیرکرد.

مولازم عومەر عەبدوڵلا بە ئەوپەڕی گیانی بەرپرسیارێتییەوە، ئەرکی سەرپەرشتیی بەرەکانی شەڕی دەستۆگرت و بۆ هەر هێرش و پەلامارێک خۆی لەپێشی پێشەوەی پێشمەرگەکانەوە بوو.

مەلا بەختیار و دەستەکەی لەشەڕەکاندا ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبوو. کاتێک زانرا پێشمەرگەکانی ئەو قۆڵە خۆیان پێنەگیراوە، قادر خەبات و زۆربەی پێشمەرگەکانی هەرێمی حەوتی باڵەیان، کە بەڕێکەوت بۆ سەردان هاتبوون، نەیان هێشت سەربازەکان سەنگەر لێبدەن و بحەسێنەوە، هەروەکو هەڵۆی تووڕە هەڵیان کوتایە سەریان و قوتەی مامەندەیان لێسەندنەوە. ئەم هەڵمەتە ڕەوتی هێرشەکەی ڕژێمی هەڵوەشاندەوە و چارەنووسی یەکێتی

و رژێمیشی گۆڕی. هەڵۆی قەندیل، جارێکیتر شۆڕشی قەرزار کردەوە..

پلانی هارپینی سەرکردایەتی و هێزی پ. م لەنێوان دوو بەرداشدا، بە تۆکمەیی، تان و پۆی چنرابوو. سوپای عیراق لەرۆژاواوە بەرزاییەکان بگرێت و سوپای ئێران لەرۆژهەڵاتەوە تۆپبارانمان بکات و لەگۆشەیەکی تەسکدا بمان پڵیشێنەوە.

شاندی سەربازیی هەردوولا، چەندین کۆبوونەوەیان کردبوو. لەسەر وردەکاری و هاریکاری و هاوئاهەنگی رێکەوتبوون. کات و شوێن دیاریکرابوون. وێنە و نەخشەو زانیاریی وردیان بە یەکتر دابوو. ئێمە پێمانوابوو تەنیا لەیەک قۆڵەوە هێرش دەکرێت. ئاگامان لەوە نەبوو، ئەم دیو، چ رێکەوتنێکی عەسکەریی لەگەڵ سوپای عیراقدا ئیمزا کردووە.

هاوینی ١٩٧٩ ژمارەیەک ئەفسەری پلە باڵای کوردی سوپای ئێران لەتووژەڵە سەردانیان کردین (سەرهەنگ سمکۆ عەلیار، سەرهەنگ رەبیعی، سەرهەنگ ئێرەجی قادری، سەرگورد حەبیبوڵڵای عەباسی، سەروان ئەحمەدی جاویدفەڕ (هەژار) و سەرگورد کەریم)*، زانیاریی ئەوتۆیان لەسەر شەڕی مامەندە داینێ، ئێمەیان تووشی سەرسووڕمان کرد:

(رۆژی١٩٧٨/١١/٧) ئێمە لە پادگانی بێوران بووین، ژەنەراڵێکی تەورێزی فەرماندەی ئەو پادگانە بوو، کۆبوونەوەی پێکردین و پلانی پەلاماری هاوبەشی سوپای عیراق و ئێرانی

---

* مەبەستم ئەوە نییە، هەموو ئەفسەرەکان لەبێوران بوون: سەرهەنگ سمکۆ عەلیار بۆ نموونە ئەوکاتە لە شوێنێکی تر بووە.

خسته بەردەستمان، کە دەبێ ئێمە بە هێزێکی گەورەوە بڕۆین و پشتیان لێبگرین و نەهێڵین ئەو گروپە یاخییە دەربازیان ببێت..

ئێمەیش گوتمان، جەنابی ژەنەڕاڵ، دونیا ساردی کردووەو ڕێگاوبان قوڕ و چڵپاوە، دێو بەدێویی خۆی ناگاتە ئەو شوێنە. ئەو گروپەی تۆ باسیان دەکەیت، ئەوانە، کەسانی بێ دەرەتان و هەژار و داماو و لێقەوماون، عیراق دێهاتەکانی وێران کردوون، ئەوانیش لەناو بەردو ئەشکەوت خۆیان قایم کردووە. گریمان ئێمە ڕۆیشتین و لێماندان، سوودی بۆ دەوڵەتی شاهنشاهی ئێران چییە؟

ئەوان سنووریان نەبەزاندووە و زیانیان بۆ ئێمە نەبووە. ئەو ناوە ئێستا بەفر و تۆفان و زریانە. بڕۆین نیوەی سەربازەکانمان لەسەرماندا ڕەقدەبنەوەو زیانێکی زۆر دەدەین. ئەمڕۆ لەسەرانسەری ئێراندا خۆپیشاندان و نا ئارامی هەیە و کەس نازانێت چی ڕوودەدات؟ ئێمە سەرمان نائێشێت و سێتامان پێوە بەستووە!

ژەنراڵە تەورێزییەکە خۆی مرۆڤێکی باش و ڕێک و پێک بوو، قسەکانی ئێمەی سەلماند. گوتی: ((چی بەسەرەوەی خۆمان بڵێین؟)). ئێمە گوتمان: ((برووسکەیەکیان بۆ لێدەدەین: کە بەفرێکی زۆر باریوەو ڕێگاوبان تێکچووە. بڕۆین زیانێکی زۆر دەدەین. فەرمانتان بە چییە؟

تا وەلامی سەرووەمان پێدەگاتەوە، دوو هەفتەی پێدەچێت. ئەوکاتە کاتی پەلاماردانەکە کۆتایی پێدێت)).

فەرمانده بە قسەی کردین و برووسکەی بۆ تاران لێداو هەروەکو پێشبینیشمان کردبوو، وەڵام نەهاتووەو ئێمەش لەجێگەی خۆمان نەجوولاینەوە).

هەلیکۆپتەرەکان ژمارەیان هێجگار زۆر* بوو. زۆربەیان وەکو داڵ بەسەر شێنێ و سوونێ و لووتکەی جاسووسان دا دەسووڕانەوە. دوو دۆشکەمان هەبوو. یەکێکیان محەمەد سیاسی** لەسەری بوو. دووەمیان ئەحمەد خدر! ڕۆژی چوارەم ئەحمەد خدر بە پەلە بۆ لامان هات. مام جەلال، نەوشیروان، سالار عەزیز و بەندە لەسەر (زینۆی سوور) وەستابووین و سەیری سووڕانەوەی هەلیکۆپتەرەکانمان دەکرد. ئەحمەد خدر گوتی: ((هەلیکۆپتەرەکان تەقەیان لێکردم و گوللەیەک بەر دۆشکەکەمان کەوت و شکاندی))! قسەکانی تەواو نەکرد، هەلیکۆپتەرەکان بەدوایەوە بوون. ئێمەیشیان بەر دەستڕێژدا. مام جەلال هاواری کرد: بڵاوە بکەن و هەریەکە خۆی بداتە بن بەردێک.

ئێمە تۆپەڵ تۆپەڵ وەستابووین، چاودێری سووڕانەوەی واشە ئاسنینەکانمان دەکرد. ئەوان شەلم کوێرم هیچ نابوێرم، هەرچییان دەبینی دایان دەدووری. مام جەلال بیست دەقیقە پێش ئەو ڕووداوە بۆ لامان هات. چادرێکی بچووکی لە

* چەند کەسێک نووسیویانە پەنجا هەلیکۆپتەر دەبوون. خەڵکی شێنێ دەیانگووت (٧٣) حەفتا و سێ هەلیکۆپتەر بووە!

** محەمەد عەبدوڵلا رەسوول پێشمەرگەیەکی قارەمان بوو. پیاوێکی فیداکارو قسەخۆش، ڕۆژێکیان ئەوەی بۆ گێڕامەوە: مام جەلال زۆر هەوڵی داوە دڵی رابگرێت و چەند نامەی بۆ نووسیوە، بەم شێوەیەی خوارەوە: (برای خۆشەویست و بەڕێزم کاک محەمەدی سیاسی و عەسکەری..). ئەو نامەیەم پیشانی دکتۆر مەحمود دا. ئەویش گوتی: ((خەمت نەبێ سێ چوار ڕۆژی تر دەنووسێت: برای خۆشەویست و بەڕێزم کاک محەمەدی سیاسی و عەسکەری و ئیقتسادی و جوگرافی..)). بەداخەوە ئەم کادرە پێشکەوتووە بەدەستی غەدر و خیانەت لە ڕۆژی ١٩٨٨/٨/٨ لە سابڵاخ شەهید کرا.

سەرلووس، رووکاری ئەودیوی (زینۆی سوور) هەڵدابوو. گوتی: ((ریشم دەتاشی هەلیکۆپتەرەکان چادرەکەیان بەر دەستڕێژدام. چادرەکەم کون کون بووە. پێم جوان نەبوو بێمە دەرەوە. ریش تاشین تەواو نەکەم و بەدەم و چاوی کەفاوییەوە بێمە دەرەوە. ریشم تاشی ئینجا بۆ ئێرە هاتم..))!

دانیشتوانی گوندی شێنێ، کە زۆربەیان پ. م بوون، ژن و پیاو، گەورەو بچووک شەڕی مان و نەمانی بەرەنگارییان دەکرد. رۆڵێکی قارەمانانەیان دەگێڕا لەپێناوی ئەوەی دیکە، بە تێکشکاوی و دۆڕاوی بەردەستی سوپای داگیرکەر نەکەوێت. شەوو رۆژ ئێشکیان دەگرت و چاودێریی زەوی و ئاسمانیان دەکرد، نەوەک لە کەلێنێکەوە، لەدرزێکەوە، دەستەیەک دزە بکەن و گورزی کوشندەی خۆیان بوەشێنن.

لەرۆژانی کۆتایی شەڕدا، هەواڵێک بە (م.س) گەیشت، هێزێکی بچووکی سوپا بەرزاییەک لەبەرازییەکانی رۆژاوای شێنێی گرتووە، بە مەبەستی ئەوەی مەخفەری کۆنی چۆڵکراوی گوندەکە بگرنەوە. ملازم عومەر، بە پەلە هێزێکی هەڵبژاردەی پێکەوەنا: (ئازادی سەگرمە، ئەحمەد مولوود، وەهاب*، عیزەت شەمساوایی، مستەفا سەرگەڵوویی)) ئەو هێزە زوو دەگەنە ناو شێنێ و دەبینین هێزەکە شوێنێکی قایمی گرتووە. م. عومەر پێشیان دەکەوێت و هێرشیان بۆ دەبەن. ئەحمەد مولوود ئازایەتییەکی کەم وێنە دەنوێنێت. بەو سەرما پڕوکێنەرە پاڵتۆکەی لەسەر بەفر رادەخات و ناهێڵێت هیچ سەربازێک سەر بەرز بکاتەوە. هێزە عەسکەرییەکە لەماوەیەکی کورتدا

---

* وەهاب: بەهائەدین شێخ ئەحمەد.

تەفروتوون دەکەن. سەربازێک بە رەشاشێکی (دیکتاریۆف) تەقە لەناو ئاوایی دەکات. حەسەنی عەولا، کە خەڵکی شێنێ بوو، گوللەیەک بە عەسکەرەکەوە دەنێت و دەستی راستی بەردەکەوێت، ئیدی چەکەکەی جێدەهێڵێت وەکو تاژی را دەکات.

سێ رۆژی دوا دوایی رۆژەکانی شەڕ، ئەوەندە بەفری تێکرد، ورچ بە ورچیی خۆی نەیدەتوانی رچە بشکێنێت. مام جەلال قسەیەکی ناپلیۆنی دووبارە دەکردەوە، کە ژەنراڵە روسەکان ئەویان نەشکاندووە، ژەنراڵ بەفر سەرکەوتوو بووە. هەر بەراستیش لەم شەڕەدا ژەنراڵ بەفر لەدە لاوە سوپای رژێمی عیراقی تەفروتوون کردو برستی لێبڕین و ژمارەیەکی زۆریان لەو شاخ و کێوەدا رەق بوونەوە.

ئێوارەی رۆژی ١٩٧٨/١١/١٧ مەلا بەختیار لە شێنێ گەڕایەوە. مام جەلال پرسیاری بەرەکانی شەڕی لێکرد. مەلا بەختیار گوتی: ژمارەیەک سەرباز بۆ سیلەی ئاوایی دزەیان کردبوو. ئێمە بەردەممان گرتن. گڕیان بەردایە گوێسەبانەی ماڵێک. لەدوو لاوە پەلامارمان دان. بە پەلەپروزێ خۆیان دەرباز کرد. لەهەموو لایەکەوە پاشەکشەیان کرد...

کۆتایی بەهاری ١٩٧٩ دەستەیەک لەکادرو پێشمەرگەکانی راگەیاندن و خەڵکی شێنێ و کادرو پ. م بۆ سەر قوتەی مامەندە بەرێکەوتبوون. لەوێ کلاشینکۆف و جیهازی بێ تەل، خودە و مەتارەو کەل وپەلی عەسکەرەکانیان دۆزیبووەوە. هاوڕێ کاوە یار ئەحمەد* چەندین وێنەی گرتبوون. وێنەی ئەو

---

* هاوڕێ کاوە: کاوە یار ئەحمەد : ساڵی ١٩٧٦ لەشاری سلێمانی رێکخراو یان گروپی (یەکێتی ئازادیخوازانی کوردستان) دادەمەزرێنێت. پاش دوو ساڵ خەبات و چالاکی رایەڵ و پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵە (کملک) دروست

عەسکەرانە چەند سامناک بوو، کە لەناو بەفر رەقببوونەوە. ئێسک و پرووسک بە پۆستاڵ و جل و بەرگەوە، لەبن تاشە بەردەکاندا گیانیان سپاردبوو. خەڵکی شێتێ و کەسانی خێرخواز ئیسکەکانیان شاردەوە.

---

دەکەن و لەناو کۆمەڵە و ریزەکانی ی. ن. ک درێژە بە خەباتی خۆیان دەدەن. دیارترین ئەندامانی ئەم گروپە ئەمانەی خوارەوە:

١. کاوە یار ئەحمەد.

٢. بەرهەم ئەحمەد ساڵح (پاشتر دکتۆر).

٣. هۆشیار ساڵح (پاشتر شەهید بووە).

٤. جەبار محەمەد فەرەج (پاشتر شەهید بووە).

٥. رزگار فەتاح.

٦. ساڵح نانەوا.

٨. سەتار محەمەد هیندی (سەتار کاراتە).

چالاکترین ئەندامانی ئەم گروپە (کاوەیار ئەحمەد و بەرهەم ساڵح)بوون. دوو قۆڵی گۆڤاری (دوارۆژ)یان دەرکردووە: کاوە: سەرنووسەرو بەرهەم: بەرپوەبەری نووسین بووە. لەماوەی دوو ساڵدا چوار ژمارەیان بڵاوکردۆتەوە. هەردووکیان بابەتەکانیان نووسیوە، هەرچەند ئەوکاتە هەردووکیان گەنج و مێرد منال بوون. بە گوێرەی توانا و تێگەیشتنی خۆیان هەوڵیان داوە بیری نەتەوەیی و گیانی بەرەنگاری بڵاوبکەنەوە.

کاوە لەماڵەوە تایپێکی گەورەی هەبووەو بە کاغەزو کاربۆن و ماندبوونێکی زۆر ژمارە ژمارە گۆڤارەکەیان بەیەکەوە ناوەو بەناو ئەندام و لایەنگرانی خۆیاندا بڵاویان کردۆتەوە. حەمە حسێن (ئەفسەری ئاسایش، پاشان لە ٢٠٠٣/٨/٢٧ لە سەهۆڵەکەی سلێمانی تیرۆریستێکی ئیسلامی شەهیدی کرد). ئەندامی گرووپەکە نەبووە، پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ یەک دوو ئەندامی گرووپەکە هەبووە..

# رۆژی ۱۹۷۸/۱۱/۲۱
## (٦)

یادی لەسێدارەدانی شیهاب شێخ نووری، مامۆستا جەعفەر عەبدولواحید دلێر و ئەنوەر زۆراب لە مزگەوتی شێنی کرا. مام جەلال گوتارێکی چڕوپڕی لەسەر ئەم یادە پێشکەش کرد. مەلا بەختیار خوتبەیەکی حەماسی لەسەر ئەم یادە جەرگبڕەدا. پێشمەرگە و کادرەکان زۆر بەماتی، بەڕیز لەبەر رووناکی لۆکس دانیشتبوون.

سەیرە تەنیا چوار رۆژ پاش ئەو شەڕە خوێناویە یادی ئەو سێ شەهیدە کرایەوە.

لەبری ناوبڕ دلێری سەید مەجید بە پەلە پەل تیپێکی مۆسیقاو سروودی نیشتمانی و سروودەکانی کۆمەڵەی پێکهێنابوو. وەهاب: بالابەرز، شۆڕش: کورت، سەیفەدین هاواری بالابەرز، سەیوان عەلی رەزا: کورت.. لەپشت ئەمانەشەوە تەسجیلیکی قەبە دانرابوو. تیپەکە سروودێکی دەگوت، ریکۆردەکە سروودێکی تری دەچڕی. هەر بۆ نمونە تیپەکە سروودی:

رێی خەباتمان چەندە سەخت و دووربێت
با چوار دەورمان گڵپەی ئاگربێت

لەسەر ریکۆردەکە:
ئەی هاوڕێیان... قارەمانان

ئێوەن پێشەنگی کاروانی ڕێی تێکۆشان

ڕۆژی دواتر ناوەندی کۆمەڵە لەگەڵ دلێری سەید مەجید کۆبوونەوەیەکی کرد و بەتوندی ڕێژنەی ڕەخنە دایکرد و سالار عەزیز پێیگوت: تیپی مۆسیقاکە شیعرەکانیان باش لەبەر نەبوو، ئاوازەکەیان نەدەزانی. دلێر بێدەنگ بوو. سالار گوتی: ((ئەم تەسجیلە حیزە چی بوو لە پشتەوە داتنابوو! یان، تەسجیلەکە کاری بکردایە یان تیپەکە سرودی خۆیان بگوتایە!)).

دلێر گوتی: ((کاک سالار بەسەری تۆ ئەو تەسجیلە نەبوایە جەماعەت عالادلعونەیان* دەگوت..)).

---

* گۆرانییەکی میللی عەرەبی زۆر باو بوو (علا دلعونا علا دلعونا).

# کادرەکان کادربوون

## (٧)

لەدەراوی گورگـان بـۆ مـاوەی دە رۆژێـک یەکـەم خـولی کادرانمان کردەوە: مام جەلال و د. مەحمود، نەوشیروان، بەندە وانەمان تێدا دەگوتەوە.

- مام جەلال: یەکێتیی نیشتمانی کوردستان.
- د. مەحمود عوسمان: مێژووی پ. د. ک.
- نەوشیروان مستەفا: ئابوری کوردستان.

پاش رۆژانی شـەڕو ئاگرباران، هاوینـە چکۆلـە هـات. ئەگەر پاش بەفرو بارانی زۆر، دوو سێ هەفتەیەک دونیا خۆشی کرد، ئینجا سەرماو سۆڵەو بەفربارین و رێبەندان دەستی پێکردەوە، ئـەو نـاوبڕە (هاوینـە چکۆلـە)ی پێـدەگوترێ. دوو ژوورەکـە قوتکرانەوە. لەناوەوە بەجوانی سواخ دران. سالار عەزیز، مەلا بەختیار و ملازم عومەر عەبدوڵلا ئەوانیش لەسەرووی ئەم دوو ژوورە هەریەکەیان یەک دوو ژووریان دروست کرد.

کۆتایی مانگی نۆڤەمبەر، دکتۆر مەحمود عوسمان پێیگوتم:

((نزیکـەی ٢٧ کادرێـک لێـرە کۆبوونەتـەوە. مـن پێمباشـە خـولێکی پێگەیانـدن و پـەروەردەکردنی کـادران بکەینـەوە. مـن و مام جەلال پێمانباشە تۆ ببیتە بەڕێوەبەری دەورەکە.

١. مام جەلال باسی پێکهاتن و مێژووی یەکێتی دەکات.

٢. دکتـۆر مـەحمود باسـی مێـژووی بـارزانی و پـارتی دیموکراتی کوردستان.

٣. نەوشیروان لەسەر مێژووی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران (حدکا) چەند لێکۆڵینەوەیک پێشکەش بکات.

هەر ئێوارەیەک یەکی سەعاتێک دەتوانین قسە بکەین و کادرەکان لەکۆتایی وانەکاندا دەتوانن پرسیاری خۆیان بکەن..)).

ئەم خولە ١٩٧٨/١٢/١ دەستی پێکرد و ١٩٧٩/١/١ کۆتایی پێهات.*

راستە خولێکی چڕوپڕ بوو، بەڵام بۆ کادرەکان زۆر بەسوود بوو. مام جەلال بە زمانێکی پاراو دەربارەی پێویستی لەدایکبوون و پێکهاتنی ی. ن. ک دەدوا. فۆکۆسی ئەو لەسەر گرنگی کارکردن بوو لەناو ریزەکانی ی. ن. ک و پەیداکردنی ئەندام و کادر و لایەنگر بۆ یەکێتی.

نەوشیروان زانیاریەکی وردی لەسەر مێژووی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران (حدکا) پێشکەش کرد. دیاربوو لەگەڵ ئەو بابەتە زۆر خۆی ماندبوو کردبوو.

دکتۆر مەحمود عوسمان، نوکتە و قسەی خۆش و مێژووی پارتی دیموکراتی کوردستانی تێکەڵاو دەکرد. ئەمە وای لەگوێگرەکان دەکرد، بە جوانی گوێ بۆ قسەکانی رادێرن و تووشی باوێشک و وەنەوز نەبن. ئەو سیاسەتی پشت بە ئێران بەستنی بە گەورەترین هەڵە دادەناو ئەویش لەگەڵ مام جەلال

---

* ناوی بەشێک لەکادرەکانمان بیرماوە: مامۆستا عەزیز سەرسپی، دلاوەر، مەلا سلێمان، محەمەد مەحمود سێکانی، ئەژدەر ـ کملک، سامان زۆراب هەورامی، عەبدولخالق ئاکرەیی، عومەر عەلی هەڵەبجەیی، (عومەری سەلمە) جووتیار (طه)،، سەیفەدین هاواری، سەیوانی عەلی رەزا هاواری، خەبات، شێخ ئەحمەدی سەرگەڵوو، نەبەز (جەمال) یاوەر ئەنوەر سادق، فوئاد سابیر سادق، سەعدی خەلیل... تاد.

لەم خاڵەدا یەکیان دەگرتەوە: دەبێ سیاسەتی پشت بەخۆبەستن بگرینە بەر. سیاسەتی پشت بە دوژمنی داگیرکەر بەستن، شۆڕش تووشی پووکانەوەو داڕمان دەکات و هیچ ئاسۆیەکی رووناکی نییە.

رۆژی ١٩٧٨/١٢/٢٣ عومەر شێخمووس گەیشتە خڕی نێوزەنگێ و ئەویش چەند وانەیەکی پوخت و نایابی لەسەر شەڕە دەنووکی نێوان چین و سۆڤێت پێشکەش کردین.

# پێشێلکردنی مافی مرۆڤ
## (٨)

ژوورەکـــەمان جمـــەی دەهـــات، لــــەپڕ دوو (پ. م)، پێشمەرگەیەکی چەککراویان هێنا. پیاوێکی دامەزراوبوو، تەمەنی سەرووی سی ساڵ دەبوو. پێشمەرگە پاسەوانەکە گوتی: ((ئەم پێشمەرگەیە بەهەڵە پێشمەرگەیەکی کوشتووە.. هێناومانە بۆ لای تۆ، بەڵکو لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکەیت..)). ئەوەی راستی بێت من دەمزانی لێپێچینەوە کاری من نییە، پێشم جوان نەبوو، دەست بە روویانەوە بنێم. گوتم:

((مـام جـەلال دەبیـنم و باســی بابەتەکـەی لەگەڵـدا دەکـەم. بەسەرچاوان..)).

پێشمەرگە گیراوەکە گوتی:

((مــن لــەنزیک رەبییــەک خــۆم مــات کردبــوو. دەمویســت سـەربازێک دەربکـەوێت و تەقـەی لێبکـەم. لـەئاقاری رەبییەکەوە، یەکێک تەقەی لێکردم. منیش وامزانی سەربازی سوپای عیراقە، تـەنیا یـەک فیشـەکم پێوەنـاو رۆیشـتم. مـن وامزانـی سـەربازە. پێشبینی ئەوەم نەکردبوو پێشمەرگەی خۆمانە..)).

کادرەکــان بــە وردی گوێیــان بــۆی رادەدێــرا. هــەموویان پێشنیازیان کرد، لیژنەیەکی شارەزا و بە ئەزموون لێپێچینـەوەی لەگەڵدا بکات: پێشـمەرگەیەک لەسـەر هیچ لەدەست چوو. نـابێ پێشمەرگەیەکی تر لەسەر هیچ لەدەست بڕوات!

مام جەلال و دکتۆر مەحمودم بینی. ڕووداوەکەم وەکو خۆی گێڕایەوە. لیژنەیەکی لێپێچینەوە بەسەرپەرشتی زێرۆی عەبدوڵلا ڕێوی پێکهێنرا. یەکسەر دەست بەکار بوون. مەفرەزەیەک تۆمەتبارەکەیان بۆ شوێنی ڕووداوەکە بردو پاژێکی شیکاری خۆیان لەوێ کرد.

لیژنەی لێپێچینەوە بە گەرمی کاری خۆی دەکرد و بەوردی گوێی بۆ کابرای تۆمەتبارو شایەتەکان دەگرت. شەوێک دەستەیەک (پ. م)ی بزووتنەوەی سۆسیالیست (باڵی ڕەسووڵ مەمەند) دەرگای زیندان دەکەنەوەو پێشمەرگە دەست بەسەرگراوەکەیان بردبوو. لەزەڵی بە بەرد سەریان پان کردبووەوە!

ئەم هەواڵە کادرەکانی وروژاند و هەموویان هەڵچوون و ئاگریان دەکردەوە، بەکادرەکانی بزووتنەوەشەوە. یەکسەر بەیانێکیان نووسی و کارەکەیان بە پێشێلکردنی مافی مرۆڤ و دڕندانەو و فاشیانە وەسف کرد.

سەرکردایەتی بزووتنەوە هەمان ڕۆژ بەیانێکی توندیان دژی مام جەلال نووسی و بە کەسایەتیەکی دیکتاتۆر و تاکڕەو دانرابوو. گوایە ئەو دەوری لەهاندانی کادرەکان هەبووەو.. تاد. ئەوەی ڕاستی بێت ئەوان لەبری ئەوەی دان بە هەڵەی خۆیاندا بنێن، داخی دڵی خۆیان بە مام جەلالدا ڕشتبوو.. مام جەلال ئاگای لە بەیانی کادرەکان هەر نەبوو، بەلایەوە سەیربوو ناوی ئەو لەخۆڕایی خراوەتەوە ناو ناوانەوە. ویستی هێزێک ڕەوانە

زەڵێ بكات و سەركردایەتی بسک بەجوانی تەمێ بكات. دكتۆر مەحمود و من كەوتینە هێوركردنەوەی مام جەلال، ساردمان كردەوە، ئیدی دەستبەجێ بەیانێكی نووسی* و ناردی بۆ ئێمە بۆی تایپ بكەین. تایپ كرا. لەبری سكرتێری گشتی ی. ن. ک، من (كۆمیتەی سەنگەسەر)ی (ی. ن. ک)م لەبنەوەی بەیانەكە نووسی. مام جەلال ناوگۆڕینەكەی بەلاوە سەیربوو. من گوتم: ((ئاستی بەیانەكەی ئەوان زۆر لاوازبوو. هی ئەوە نییە تۆ وەكو سكرتێری گشتی وەڵامیان بدەیتەوە. با لە ئاست كۆمیتەی سەنگەسەر دابنرێت و وەڵامی كۆمیتەیەک بدەنەوە نەک سكرتێری گشتی..)). ئەو بیرۆكەكەی پەسەند كردو بەیانەكە بڵاوكرایەوە.

دكتۆر مەحمود گوتی: مام جەلال پیاوێكی رۆشنبیرە و هەرچی بوێت، دەتوانێت، بە قسە قەناعەتت پێبكات و ئەو لەسەر راستەو تۆ لەسەر هەڵەیت. كەچی خراپ توورە دەبێت و هەوڵ دەدات كێشە بچووكەكان بە توندوتیژی و زەبروزەنگ و دەنگە دەنگ چارەسەر بكات. ئەگەر مرۆڤێكی هێمن و لەسەرخۆ بوایە دەیتوانی قازانجی زیاتر بە گەلی كورد بگەیێنێت و خۆیشی كەمتر تووشی سەرئێشەی لابەلا دەبوو.

---

* سەیوان عەلی رەزاو مامۆستا سەیفەدین هاواری دوو لاوی خوێن گەرم و قسە خۆش بوون، پشكۆ تایپێكی لە نەوشیروان وەرگرتبوو هەر بۆ ئەوەی خۆی فێری تایپكردن بكات، هەرسێكیان پێكەوە بەیانەكەیان نووسی و كادرەكانی تریش ترش و خوێیان پێوە كرد و هاودەنگ بوون لەسەر بەدەنگەوە هاتن.

# خۆپیشاندانی شارەکانی ئێران
# (٩)

دەوروبەری سەری ساڵ بوو. ئێواران مام جەلال، د. مەحمود، د. جەعفەر، ئازادی سەگرمە.... تاد، هەریەکە رادیۆیەکی بچووکی بە دەستەوە دەگرت، گوێمان لە BBC و مۆنتیکارلۆ و تاران دەگرت. رۆژ بە رۆژ شەپۆلی مانگرتن و خۆپیشاندان بەرفراوانتر دەبوو. رۆژی ئەوتۆ هەبوو دە ملیۆن هاووڵاتی دەڕژانە سەر شەقامەکان و داوای ڕووخانی رژێمی شایان دەکرد. دیواری ترس هەرەسی هێنابوو..

لەسەردەشت و سابڵاخ و بۆکانەوە دەستە دەستە لاوان سەردانیان دەکردین و چەک و دەرمان و جل و بەرگیان دەهێنا. ئەوەندەی کوردی ئەودیومان دەبینی، چارەکی ئەوەندە کوردی ئەمدیو لایان لێنەدەکردینەوە. زۆرجار لاوانی ئەودیو داوایان لەمام جەلال دەکرد، لەدیوی ئەودیویش ڕێکخستنی یەکێتی دروست بکرێت. مام جەلال بیرۆکەکەی پەسەند نەدەکرد. هانی دەدان ڕێکخستنی تایبەت بەخۆیان دروست بکەن و دوور بکەونەوە لە جەنجاڵیی کۆپی کردن و لاساییکردنەوە و دۆستی ئێمەبن سوودی زۆرترە.

لەماوەی دوو ساڵی رابووردوودا لە هەڵگیرساندنی شۆڕشەوە تا ڕووخاندنی رژێمی شا، سنوور بەچڕی تەنرابوو. رژێمی ئێران هەر زۆر ئازاری دەداین و گوشاری دەخستینە سەر. پێشمەرگەیەک شەوارە بووبێت یان بەهەڵە پێی خستبێتە

ناو خاکی ئێرانەوە، بەکورتترین کات دەگیراو رادەستی عیراق دەکرایەوە. خەباتی شێخ جەناب تەمەنی زۆر منداڵ بوو، گرتن و رادەستکردنی تەنیا سێ هەفتەی خایاند. مامۆستا داود عەلی پیاوێکی زۆر ئازاو چاونەترس بوو، کاتێک سەربازی ئێرانی گەمارۆیان دا و داوای چەک دانانیان لێکرد، ئەو گوللەیەکی بەخۆیەوە نا..

## حەمە ئەمین ئاغاو عومەر فەتاح
## (١٠)

حەمە ئەمین ئاغای باری، پیاوێکی مەزن و ئازاو قسە خۆش و زۆر بەڕێز و قوورس و گران بوو. ئەو مامی گەورە و جێگەی بڕوای من بوو. لە شۆڕشی ئەیلول سەرلق بوو. لەکاتی پەلاماردانی سەنگەرێک لەسەنگەرەکانی رژێم لەکوڵەجۆ گوللەیەک بەر قۆڵی کەوتبوو، قۆڵی وردوخاش کردبوو. تا شوێنەکەی بەتەواوی نەگرتبوو، بە پێشمەرگەکانی نەگوتبوو: بەخەستی بریندارم!

لەدیوەخانی ئەم پیاوەدا ساڵی ١٩٧٦ عومەر فەتاحم ناسی. باسی بارودۆخی کوردستانمان پێکەوە کرد، گەرمەی شالاوی راگواستن و دێهات وێران کردن بوو. دوای ئەم دانیشتنە: من دڵنیابووم ئەو کۆمەڵەیە، ئەویش یەکسەر زانی من کۆمەڵەم. ئەوکاتە هەردووکمان رەبەن بووین، بەڵام پاژێکی فراوانی قسەکانمان دەربارەی (ئازادی ژنان) بوو. هەردووکمان دژی چەوساندنەوە و توندتیژی بەرامبەر ژن بووین. نازانم بۆ پێی لەسەر (زەواجی کاتۆلیکی) داگرت. گوتی: ((من بڕوام بە زەواجی کاتۆلیکی نییە!)). دوو سێ ساڵ لەمەوبەر پێم گوت: ئەوە پێش چل ساڵ دەتگوت: (( بڕوام بە زەواجی کاتۆلیکی نییە!))، واتە : ژن و مێردایەتییەک، تا دوا رۆژی ژیان، جیابوونەوە و لێکترازانی تێنەکەوێت. ئەو زۆر بە قسەکەم پێکەنی و گوتی: (ئیستاش بڕوام بە زەواجی کاتۆلیکی نییە! بەڵام من و کافیەخان هاوسەرو هاوڕێی ژیانین..).

حەمە ئەمین ئاغاو سەرداری کوڕی و چەند پێشمەرگەیەک بۆ لامان هاتن. ئاغا هەر لەکۆنەوە هاوڕێی مام جەلال بوو. چەند جارێک یەکتریان بینی. ئەو زۆربەی کات نوکتەو قسەی خۆشی دەگێڕایەوە. ئێوارەیەکیان ئەژدەر بۆ یەکتر ناسین و دیدەنی میوانەکان هات. حەمە ئەمین ئاغا پرسی: ئەم پیاوە کێیە؟ منیش گوتم: ((ئەمە ئەژدەر ـ کملک))ە. ئاغا هەر زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنی کردو ڕێزی لێگرت. ئەژدەر دوو سێ چای فڕکردو گوتی: سەردانی مام جەلال دەکەم.. ڕۆیشت. ئاغا گوتی: ((مامۆستا خێرت دەگات بۆمان ڕوونکەرەوە بزانە ئەم ئەژدەر ـ کملک چییە و چی دەگەیێنێت؟))!

منیش گوتم: ((ئەم پیاوە عومەری زێڕینگەرە و لەپێشمەرگایەتی ناوی خۆی گۆڕیوە بۆ ئەژدەر ـ کملک کورتکراوەی کۆمەڵەیە... تاد)).

حەمە ئەمین ئاغا گوتی: ((ئەم کاک ئەژدەرە مانگ و نیوێک لەمەوپێش لەبناری گمۆو سورکێو بوو، نامەیەکی دوورودرێژی بۆ ناردم و لەکۆتاییدا نووسیویە ئەژدەر ـ کملک)) نامەکەی لەبەر باخەڵیا بەگەرمی پاراستبوو. نامەکەی کردەوەو دەستمان بەخوێندنەوەی کرد، لەبنەوەش نووسرابوو ئەژدەر ـ کملک.

ئاغا گوتی: ((کاک ئەژدەر نامەی بۆ سەرجەم ئاغاکانی ئالان و سیوەیل ڕەوانە کردبوو. داوای لەهەمووی کردبوو، بە زووترین کات واز لەئاغایەتی بهێنن و ببنە ئەندامی کۆمەڵە. هەموو خەڵکی کوردستان بۆتە مارکسی ـ لینینی هەر ئێوە ماون و ئەوە من بۆ لاتان دێم و دەبێ ئێوەش جێگای خۆتان لەناو کۆمەڵەدا بکەنەوە..)).

ئاغـا چایـەکی تـری نـۆش کـرد و بـەردەوام بـوو لەسـەر گێڕانەوەی داستانەکە:

((هـەرچی پێشـمەرگە و کـادرو خوێنـدەوار و مامۆسـتاو مـەلا هـەن هـەر هـەمووومان لـەدیوەخانێک کۆبووینـەوە دەمانویسـت بزانین ئـەم سـەرکردە نوێیـە کێیە و نـاوی چییـە؟ هـەر یەکـەمان ناوەکەی بەجۆرێک دەخوێندەوە:

یەکێک دەیگوت: ئەژدەر ـ بێ کلک!

یەکێکی تر گوتی: ئەژدەر ـ کملک.

یەکێتی تر دەیگوت: نە بابە وانییە، هەبێ و نەبێ ئـەژدەر ـ لـە کلکـە! دوو سـەعات کۆبوونـەوەمان لەسـەر ئـەم نـاوە کـردو نەگەیشتینە ئەنجام. خـوا خێرت بنووسێت گرێکوێرەکـەت بۆمـان کردەوە)).

# بەرەو سابلاخ

## (١)

دوا رۆژەکانی ساڵی ١٩٧٨ دیاربوو رژێمی شا خۆی ناگرێت و گۆڕانکاری ریشەیی بەڕێوەیە. شەقامی شارەکانی ئێران لەسەرپێ بوون. رژێمی شا لە قۆناخی گیانەڵادا بوو. زەبروزەنگی رۆژهەڵاتی شکستی خواردو نەیتوانی جەماوەری گڕگرتوو کپبکاتەوە. ئایەتوڵلا خومەینی لەتاراوگەی (نۆفل لۆشاتوو) لە پاریس بەتۆپی دوورهاوێژی سەدەی دوانزەهەمەوە فەرمانڕەوایی ناڕەوای شاهنشای ژێروژوور کرد.

بە ئاماژەیەکی ((ئیمام)) بە ملیۆن دەڕژانە سەر شەقامەکان.

بەهەزاران، خەڵک کفنی سپی لەبەردەکرد. لەسەر شەقامەکان دادەنیشتن، تانک بەسەریاندا دەڕۆیشت. دەپلیشانەوە، ژن و پیاوی پێکەوە هەڵدەشێلا، کەس نەدەبزووت: بۆ نمونە: هەینی رەش (جمعەء سیاه) کە لەرۆژی ١٩٧٨/٩/٨ روویدا و هەزاران قوربانی لێکەوتەوە. کۆمیتەی شۆڕش (شورای انقلاب) لەشارو لادێ بەکردەیی وڵاتی بەڕێوەدەبرد. خراپ نەخۆش کەوتم. خیزەی سینگم دەهات، سییەکانم هەویان کردبوو! دکتۆر جەعفەر دەیگوت: ئامێری پشکنین و دەرمانمان بە گوێرەی پێویست نییە. چەند جارێک (ئەنتی بیۆتیکا)م وەرگرت، هیچ سوودێکی ئەوتۆی نەبوو. ئەی بێ دەرمانی؛ توونی بابا و ئاوی ئاموون چی! رۆژێکیان پێیگوتم: ((ئەرێ جەفە گیان! رژێمی شا هەر بەناو ماوە! ئەگەر ئەم نەخۆشیەت هەروا بڕوات، ماوەیەکی

تر چاكبوونەوەت دەچێتە كەلی شەیتانەوە! برۆ بۆ سابلاخ و لەوێ سەردانی دكتۆرێكی باش بكە. بزانە لەشارەكانی ئەودیو چباسە! برۆ بەچاوی خۆت ئینقلاب ببینە!)).

من و دكتۆر جەعفەر دەربارەی رووداوەكانی ئەودیو سنوور دەدوایـن، مـام جـەلال لەژوورەكـەی هاتـە دەرەوە. گـوتی: ((مامۆسـتا جەعفـەر! بـۆ سـەردانێكی سـابلاخ ناكـەیت؟ لـەوێ دكتـۆری باشـی لێیـە و خـۆت چارەسـەر بكـە و وەرەوە. ئـەوە لەگـەڵ دكتـۆر جەعفـەر و هـەڤالانی ئـەودیو جێورێـت بـۆ دابـین دەكـەین. مـەلا ئەحمـەدی بـانیخێلانی گەیشـتۆتە ئێرە و ئـەویش دەیەوێت سەفەری ئێران بكات. پێكەوە برۆن باشترە!)).

دەستەیەك (پ. م) و پیاوێكی رێزان و شارەزا ئامادەبوون. مەلا ئەحمەد هات. بە گەرمی بەخێرهاتنمان كرد. دوور بەدوور بەهۆی برای شاعیرو نووسەری گەورە ئەنوەر قادر محەمەدی خوشكەزایەوە یەكترمان دەناسی. لەو رۆژەوە ئێمە بووینە خزم و هـاورێ و جێگـەی بـرِوای یـەكتر، هەرچەنـد سـەنگەری ئایدیۆلۆژیمان زۆر لەیەكەوە دووربوو. ئەوان سەر بە فێرگەی ((كرملین)) و ((سۆڤێت)) و ((برجنێڤ)) بوون. ئێمەیش ((بەیژین)) و ((تیان ئان مین))و ((ماوزەتۆن))! مام جەلال هەر زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنی كردن. بەهیوای ئەوەی ئەوان پشتیوانی سیاسـەتی یـەكێتی بـن. ماڵئـاوایی لەسـەنگەری بەغـدا بكـەن و لەسەنگەری ((خرِی نێرزەنگێ)) جێگەی خۆیان قایم بكەن! مام جەلال ئەوكاتە پێیوابوو: پارتی كۆمۆنیستی عیراقی، كە لە ١٩٧٤ چەكیان لە شۆرش هەڵگرت، درێژە بە دژایەتی پارتی دەدەن. ئیدی هەردوولا بە ئاسانی پارتی لەگۆرەپانەكە وەدەرنێن یان

پەراوێزی دەخەن و یەکێتی سۆڤێت دەبێتە دۆستی (ی. ن. ک) و سۆڤێت ناچار دەبێت دەست لە بەغدا بەردات، یان لایەنی کەم لەمەودوا کێشەی گەلی کورد پشتگوێ نەخەن! دەمەو ئێوارە ماڵئاوایی کرا. بەرەو نۆکان شۆڕبووینەوە. لەڕێگا پرسیاری سنوور بەزاندن و پاسەوانی سنوور و ڕێگاکانمان کرد. ڕێزانەکەمان گوتی: (( پاسگاو سەرباز، تەنیا پاسەوانی خۆیان دەکەن و سەرەڕێگا لەکەس ناگرن. ((داوداوێ)) و ((مامکاوێ)) سەرەرێمان بوون. ئێمە پەڕی ئاواییمان گرت. سەعات یەکی شەوێ گەیشتینە گوندی ((گردێنە))و ڕۆژمان لەم دێیە کردەوە. بەرچاییمان کرد. خانەخوێ دەیگوت: ((ئەمە نانی ئێوە نەبوو. بەخوا هیچتان نەخوارد)). مەلا ئەحمەد گوتی: ((تێرخواردن شەرتە، نەک زۆر خواردن!)). ماوەیەکی کەم بە پێیان ڕۆیشتین. هەرەسی بەفری دوو مانگ لەمەوپێش گوندێکی خنجیلانەی لە شیرینی خەودا ڕامالیبوو. یەک کەس نەیتوانیبوو لەخەو هەڵسێت!

لە نزیکی گوندێکی سەر ڕێگای سەردەشت ـ ڕەبەت لامان دا. سواری ماشێن بووین و بێ وەستان بەرەو سابڵاخ ڕۆیشت. شوفێرەکە رادیۆی داگیرساندبوو. تێگەیشتین (شاه رفت- شا ڕۆیشت)، شای ئێران ڕۆژی ١٩٧٩/١/١٦ خاکی ئێرانی جێهێشتووە. شاپوور بەختیار دوو هەفتە و چەند ڕۆژێک ببووە سەرۆک وەزیران. ئەو یەکێک بوو لەسەرکردەکانی (جبهەء ملی ایران) کابرایەکی سەرسەخت بوو. شا درەنگ و بەنا بەدڵی پاژێک دەسەلاتی پێسپارد. ساڵێک پێشتر بوایە و هەڵبژاردن بکرایە و سیستێمی مەلەکی دەستووری بچسپێنرایە، ڕەنگە

بیتوانیبایە هەندێ مانۆڤەری سیاسی بکات، بەڵام پاش (جمعەء سیاە) و هاتنەوەی خومەینی بۆ تاران لە ١٩٧٩/٢/١، مێزەکەی بەسەر شاپوور بەختیاردا قڵپکرایەوە..

پاشان لە سابڵاخ رۆژنامەی ئەو رۆژەم بینی (اطلاعات)، مانشێتەکەی (شاەرفت)بوو. رووناکبیرانی ئەوێ گوتیان: (( ئەمە سوکایەتی کردنە بە ((شا))! پێشتر رۆیشتن و گەڕانەوەی شا بە ئەوپەڕی ستایشەوە رستەکان دادەڕێژران. ئەمە هەروەکو ئەوەیە بنووسرێت: (شا ملیشکاند) و حەوت بەرد بەدویدا بدە.

ئێمەیان گەیاندە ماڵی ئەندازیار (باقی نەغەدەیی)، پیاوێکی چالاک، گورج و گۆڵ، سادە، رووخۆش، خاوەن پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی فراوان. برازای (ڕەسووڵ نەغەدەیی)بوو، کە یەکێک بووە لە کەسایەتییە ناسراوەکانی (ژ.ک) و لەسەردەمی کۆمار ئەفسەر بووە. پاش رووخاندنی کۆماری کوردستان رەسووڵ نەغەدەیی و سێ ئەفسەری تر لەسێدارە دران. سی و سێ ساڵ بەسەر شەهیدبوونی رەسووڵ نەغەدەیی تێپەڕیبوو، کەچی ئەو ماڵە بە شێوەیەک بۆی خەمباربوون، پێتوابوو هێشتا ئەوان پرسە دەگێڕن.

باقی لەخۆپیشاندانەکانی سابڵاخدا، لەپێشی پێشەوە دەبێت، سەربازەکان گوللەبارانیان دەکەن، گوللەیەک بەر تەپڵی سەری کەوتبوو. گوللەیەک نەیتوانیبوو حەماس و گیانی بەرەنگاری ئەو سارد بکاتەوە. رۆژانە بەدەیان چالاکیی جەماوەرییەوە سەرقاڵ بوو. نووسینگەیەکی ئەندازیاری لەسەری سەرەوەی تەلارێکی بەرز کردبووەوە، هاوڕێکانی ناویان لێنابوو (هێلانەکەی باقی). باوک و دایک و براکانی باقی هەر زۆر میهرەبان بوون. ئەم

ماڵە ناوەندی چالاکیی جەماوەری بوو. مەلا ئەحمەد دوو ڕۆژ لامان مایەوە. دەیویست خۆی بگەیێنێتە ((مۆسکۆ)) و ((لینینگراد)) لەڕێگەی حزبی (تودە)ی ئێران و (حدکا)وە. ئەم دوو حزبە هەر زۆر بەهاوئاهەنگی کاریان دەکرد. باقی ناسنامەی ساختەی بۆ دەرکردین. من بوومە (ئەحمەد مورادی) و ئەویش (ئەحمەدی ئەحمەدی) و کارمەندی بەنداوی مەهاباد بووم.

پێکەوە سەردانی (غەنی بلوریان)مان کرد. ماوەی بیست و پێنج ساڵ زیندانی کرابوو. هەستت دەکرد، ئەم پیاوە بیست و پێنج ساڵ لەناو بەستەڵەک شاردراوەتەوە. تازە لەناو بەستەڵەک دەرچووە. نەیدەزانی چی لەو ژیانە ڕوو دەدات؟ شێوەی ئاخاوتنی، لە ڕۆبۆت دەچوو. خەرەندێک لە شەختە و سەهۆڵبەندانی نامۆیی، ئەوی لەکۆمەڵی ئەو سەردەمە جیا دەکردەوە.

نیلسۆن ماندیلا پاش بیست و حەوت ساڵ زیندانی ئازاد کرا. بە قسەو کرداری جوان و مۆدێرن، کۆمەڵی مرۆڤایەتیی لەسەرانسەری جیهان تووشی فروسمان و سەرسوڕمان کرد.

سێ چوار مانگ دوای ئازادبوونی (مام غەنی) لە زیندان، خەڵکی مەهاباد خۆپیشاندانیان دەکرد و دەیانگوت:

مام غەنی قارەمان

بگەڕێوە بۆ زیندان

بەراستی ئەمە لووتکەی کارەساتە بۆ مرۆڤێک نیوەی ژیانی بەفیداکاریو زیندان و ئازار بەسەر بردبێت، لە ئەنجامدا لەناو کەس وکاری خۆیدا خۆپیشاندان دژی بکرێت و سووکایەتی پێ بکرێت..

# شێخ عیزەدینی حوسەینی
## (٢)

بەشداریم لە کۆڕێک کرد، کە شێخ عیزەدینی حوسەینی گوتارێکی بە پێزی پێشکەش کرد. پیاوێکی سەنگین و قسەزان. دەنگی نووسابوو، بە زەحمەت قسەی دەکرد. لەماوەی چەند مانگێکدا بووە گەورەترین و ناسراوترین سەرکردەی کورد. پیاوێکی ئاینی بوو، بەڵام وەکو مرۆڤێکی کراوە و پۆست مۆدێرن و رۆشنگەر دەدوا، نەک وەکو مەلایەک، کە گوتاری ئەوان چوارچێوەی و کلێشەی دینیی دیاریکراوو هێڵی گشتی خۆی هەیە.

ئەو دەیگوت: ((راستە ئێمە موسڵمان و خواپەرستین، ئەمە بڕوای ئێمەیە و هەرکەس دەتوانێت نوێژی خۆی بکات و رۆژووی خۆی بگرێت، بەڵام من بڕوام بە سۆسیالیزم هەیە. ئەمە شێوەیەکە لەشێوەکانی رێکخستنی ژیان و کۆمەڵ..)).

دوای کۆڕەکە ((باقی)) پێیگوتم: ((با سەردانی شێخ عیزدەینی بکەین. ئەم سەرکردەیە، ئێستا دەورێکی زۆر گرنگ دەگێڕێت..))

کەسایەتیەکی سادە. زوو سەرنجی دڵانی بۆ لای خۆی رادەکێشا. ئەو دەیان پرسیاری لێکردم سەبارەت بە بارودۆخی شۆڕش و سیاسەتی رژێمی بەعس.

گوتم: ((ئێمە کۆمەڵەین و بەم زەقییە ناوێرین باسی سۆسیالیزم و خەباتی چینایەتی بکەین!)).

ئەو گوتی: ((تا لەم وڵاتەدا سیستێمی سۆسیالیستی جێبەجێ نەکرێ، ئەم کۆمەڵە خێرو خۆشی لەخۆی نابینێت! من بڕوام بە

ئاینی ئیسلام هەیە. دین و سیاسەت نابێ تێکەڵاوی یەکتر بکرێن. ئەوانەی بەناوی ئاینەوە دەسەڵات دەگرنە دەست، ناتوانن دیموکرات بن، حەزیان لەتاکڕەوی و سەرکوتکردن و خۆسەپاندنە! دەبێ دوای سەرکەوتنی شۆڕش، مەلاکان بۆ مزگەوتەکانیان بگەڕێنەوە. سیاسەت و ئیدارەی وڵات رادەستی سیاسی و کەسانی شارەزا بکرێ! جارێ ئێمە دەمانەوێ رژێمی شا بڕوخێنین. هیوادارم دوای شا، رژێمێکی دیموکراسی حوکم بگرێتە دەست..))!

یەکەمین جاربوو لەگەڵ زانایەکی ئاینی گەورەدا دابنیشم، کە بە بێ دوودڵی، خۆی بە ((سۆسیالیست)) دابنێت و داکۆکی لەمافی چەوساوەو هەژاران بکات. هەستێکی ئەوتۆی پێدەبەخشی، کە ئەو دەیەوێت ((پەیام))ەکەی قازی محەمەد بە نۆژەنی پێشکەش بکات. جارێکی دی ((کۆماری کوردستان)) رابگەیەنرێت و ((ئاڵا))ی کوردستان بەرز بکرێتەوە. دەیزانی کات و سەردەم گۆڕانیان بەسەردا هاتووە. سەرەتا خۆپیشاندنەکان شەقڵێکی ((چەپ)) و ((سیکۆلار))یان پێوە دیاربوو. رووناکبیرو شارییەکان پێشەنگ بوون.

شێخ عیزەدین و ئایەتوڵڵا خومەینی جارێک لە قوم چاویان بە یەکتر کەوت، زۆربەی خەڵک پێیانوابوو: ئەگەر ئەم دوو زانا ئاینیە یەکتر ببینن، دەتوانن کێشەکان چارەسەر بکەن. یەکتریان بینی و هیچی لێ سەوز نەبوو. ئەم دووانە لەهەموو شتێکدا جیاوازبوون: خاڵی یەکانگیرو هاوبەش لەنێوانیاندا کەم بوو. هەریەکە جیهانبینی و تێڕوانین و پلانی سیاسی خۆی هەبوو. بواری بە یەک گەیشتن و تێگەیشتنی هاوبەش نەبوو. شێخ

عیزەدین پیاوێکی سەرراست بوو، نەک لەبلەبان و فرەزان و فرتوفێڵباز، بتوانێت کڵاوبخاتە سەر هەموو لایەک و کەس هەستی پێنەکات. ئەگەر شێخ عیزەدین دڵنیای ئایەتوڵڵای خومەینی بکردایە، کە دەبێتە شیعەو بەڵێن دەدات کورد هەموو بکاتە شیعە و ناهێڵێت کەس ورتەی لێوەبێت، ئەوە پێشوازی لێدەکراو جێگەی خۆی دەکردەوە. ئەو نەیدەتوانی کاژگۆڕکێ و ڕۆحگۆڕکێ بکات.

پاییزی ساڵی ١٩٨٠ لە دێیەک یەکترمان بینی. ئەو ماڵ و حاڵی خۆی و سابڵاخی جێهێشتبوو. زۆر قسەمان پێکەوە کرد. ئەو بۆچوون و تیۆرییەکانی ترۆتسکیی بەراست دەزانی و بەڕاشکاوانە داکۆکی لێدەکرد و ڕەخنەی توندی لەستالین و خرۆچێڤ دەگرت.

شێخ عیزەدین، وەکو مەولانا خالیدی نەقشبەندی، سەرکردەیەکی بێ چەک بوو دامەزراوەی سەرکوتکەری دەوڵەتی بەدەستەوە نەبوو: نە سوپای هەبوو، نە میلیشیا، نە سەرچاوەی دارایی لەبن نەهاتوو..

ترۆتسکیش سەرکردەیەکی بێ چەک بوو. تەنیا قەڵەم و بیروباوەڕی خۆی هەبوو. حزبی بۆلشەویکیش رادەستی ستالین کرا. بۆیە هەر زوو تووشی ڕاوەدوونان هات و پاشان لەتاراوگە بەئاسانی تیرۆرکرا.

ئەوکاتەی لە سابڵاخ بووم نەوشیروان مستەفا بە ئەوپەڕی سۆزو پەرۆشییەوە ئەم نامەیەی بۆ نووسیم. مام جەلالیش بەسەری دەکردمەوە. هاوڕێکانی ترمان کەمتر تاقەتی نامەنووسین و هەواڵپرسینیان هەبوو. ئەم نامەیە بەڵگەی بڕوا

بە یەکبوون و نزیکاتییە، نەک سارودو سڕی و گرژی، بۆیە من لێرەدا بەبێ دەستکاری وەکو خۆی دایدەنێم:

**هاور[redacted]ی بەڕیزو خوشەویستم مامۆستا جەعفەر**

سلاویکی گەرم. هیوادارم تەندروست و لەش ساخ بیت و ئیستا نەختیک ماندویەتی و نەساغیت کەم بوبێتەوە. چەند نامەیەکت بو هاتبوو وا بۆم ناردی وەزعی لای ئیمە هەروەکو ئەوساکە وایە کە خوت بەجێت هیشتوە. بەڵام بەداخەوە فرج تریفەیی امر کەرت و قادر عەولای امر مفرەزەی خۆمان و بکر سێکانیانی قارەکانەکەی دوکان شەهید بون. لە سلیمانی هەندی چالاکی نوێنراوە لەوانە نزیکەی ٢٣ ئافرەتی جاسوس وخراپ کوژراون. تەقە لە علی عارف* کە خەبەری لە جمالەرەش دابو وە هەروەها لە قاسم رەش کراوە بەلام برینداربون و نەمردون. چەند هاورییەکی پیشکەوتو هاتونەتە دەرەوە لەوانە دکتور بەختیار و یەکیک لە لیپرسراوانی

---

* ئەم ناوە بە هەڵە نوسراوە. من ناوی راستی ئەو کەسە دەزانم، بەلام نایننووسم. بەهیوای ئەوەی کەسێک بێ لایەنانە راستیەکان وەکو خۆی بنووسێتەوە. زۆرجار پیاوی پاک و بێوەی لە سۆنگەی زانیاری هەڵە کوژراوە. پیاوی ناپاکیش وەکو بەرزەکی بانان بە (پاکی) خۆی دەرباز کردووە!

ڕێکخراوی جەماڵەڕەش لەسلیمانی کە خریجی اقتصادە.

کاک دلیر قسەو بابەتەکانی ئێرەت بۆ ئەگێڕیتەوە. وەزعی ناو شار باشە تا ئیستا چارەنوسی ماموستا عزیز و ئەوان دیار نیە و هەر لە کەرکوکن. خوت بۆ گفتوگۆ و ئامۆژگاری و سەرپەرشتی برایانی لای خۆمان چی بە باش ئەزانیت بیکە و چەندی بمێنیتەوە خۆت بریاری بدەو ئەم شتانەمان داوەتە دەست تقدیری خوت.

برادەران هەمو سلاوو تمنیاتی قلبی یان هەیە بالشفاء العاجل

ئیتر خۆشیت

نەوشیروان
١٩٧٩/١/٢٦

# زانکۆی تەوریز
## (٣)

ماوەی هەفتەیەک لە تەوریز گیرساینەوە. نەغەدەیی و یونسی پەیوەندی باشیان لەگەڵ مامۆستاکانی زانکۆدا هەبوو. لە زانکۆ چالاکیی رۆشنگەری فراوان کەوتبوون سەرپێ: (هفتەء همبستگی باخلق کرد) یەکێک لە چالاکیەکان بوو. هۆڵەکان پڕبوون، لە خوێندکار: ئازەری،فارس، قەشقائی، تورکن سەحرایی و کوردی قوچانم ناسی.

**ئای! ئای رەشیدخان**
**سەردار کورد قوچان**

کورد قوچان، ئەم گۆرانیە فۆلکۆرییەی پەری زەنگنەی بیرخستمەوە. دکتۆر حسێن لەبن چادرەکەی دۆڵەنێ، رۆژێ بیست جار هەڵیدەکردەوە، چونکە هەریەک کاسێتمان هەبوو. چوارسەد ساڵ راگواستن و سیاسەتی تواندنەوە هەستی نەتەوایەتی نەسڕیوەتەوە.خوێندکارو مامۆستا جمەیان دەهات: کۆڕیان دەبەست، سیمیناریان دەگێڕا، پێشەنگای فۆتۆگرافی و نامیلکەی پشتیوانی بۆ گەلی کورد بلاو دەکرایەوە. کەش و هەوایەکی پڕ لە ئومێد و خۆشی: رژێمێکی دیکتاتۆری، نا دیموکراسی دەڕوات: یەکسانی و ئازادی و کامەرانی وڵات دادەپۆشێت. سەرپۆش و ژنی بالاپۆشی خەلیجی بەرچاو

نەدەکەوت. روومەتی گەش، خەندە لێوانی جێنەدەهێشت. پەیوەندی دۆستانەو شادی لەنێوان گەلاندا هەستی پێدەکرا. زۆربەی مامۆستا پێشەنگەکانی رۆشنگەری دەرچووی زانکۆکانی کالیفۆرنیا، سۆربۆن و ئۆکسفۆرد بوون. لەدڵەوە پشتیوانیان لە گەلی کورد دەکرد. کاتێک ئەم روناکبیرانە دەبینیت، پێتوایە لەناو ئازەرییەکاندا رک و کینە و رەگەزپەرستی دژی گەلانی تر ئەفسانە و درۆن. کەچی کاتێک تورکێکی شۆڤێنی دەم دەکاتەوە، کە بەخوێنی سەری ئەرمەنی و یۆنانی و کورد تینووە، وا دەزانیت تورکی مرۆڤدۆست، مۆدێرن و ناڕەگەزپەرست، دەرمانەو لە قوتوی هیچ عەتارێکدا دەست ناکەوێت.رۆژی ١٩٧٩/٢/٩ دیاردەیەکی سەرنجڕاکیشم بەرچاو کەوت: بەهەزاران خوێندکارو مامۆستا و کارمەند لەناوەڕاستی زانکۆدا کۆبوونەوە، دەیانویست رێپێوان بکەن. سەرەتا دروشمی چەپ، دژە رژێمی شا، داوای دادپەروەری و دیموکراسی بەرزکرایەوە. ئاپۆرەکە بەرەو دەرگای سەرەکی جوڵایەوە. کۆمەڵێک فەقێ و مەلا، بە نەعل و عەمامە و عەباوە، پێشی پێشەوەیان گرت و رەوتی رێپێوانەکەیان گۆڕی: (اللە اکبر خمینی رهبر) و چەپ و مەپ هەر بە پاڵان تا بەردەم من راماڵران. من لەسەر پلیکانەکانەوە چاودێری زۆرانبازییەکەم دەکرد. مامۆستایەکی ناساوی زانکۆم ، کە شەش مانگ پێشتر لە لۆس ئەنجلس بە بڕوانامەی ئەندازیارییەوە گەڕابووەوە، بە پەشۆکاوی پێیگوتم:

((ئەگەر وا بڕوات شۆڕشەکەمان لەدەست دەردەهێنن. ئێمە شۆڕشمان هەڵگیرساند، ئەمانە هەروا بە ئاسانی دەیانەوێت

لەدەستمان برفێنن.. ئەمانە شۆڕش بەرەو مزگەوتەکان دەبەن! چیمان گۆڕی!))شەوی شۆڕش ٢/١٠ لەماڵی مامۆستا خەلیقی بووین. لەرێگە تەلەفزیۆنەوە چاودێریی رووداوە خێراکانی هەرەسهێنانی رژێمی شامان دەکرد. مەهدی بازرگان لەلایەن خومەینییەوە بە سەرۆک وەزیران دانرابوو. شاپوور بەختیار دوا چرکەکانی داڕووخانی رژێمی دەژمارد. سوپاو پۆلیس، لایەنگری خۆیان بۆ حکومەتی نوێ دەردەبڕی. گومان لەوەدا نەما، کە سبەی سەردەمێکی نوێ لەدایک دەبێت و گزنگی هەتاوی قۆناخێکی جیاواز دەرگاکانمان پێدەکەنەوە.

لە سابڵاخەوە پەیوەندییان بەو هاوڕێیانەوە کرد: دەبێ گەلی کورد، هەل بقۆزێتەوە، بە زوترین کات دەست بەسەر ((پادگان))ەکاندا بگیرێت و گەلی کورد بە لوولەی تفەنگ و هێز مافە رەواکانی خۆی بسەپێنێت.بەرەبەیان، مەهاباد بمانگرە و هاتین. تەورێز شەوی ٢/١١ تا خۆرهەلاتن نەنوستبوو. ئۆتۆمبێلەکان پڕبوون، هۆرن لێدەدرا، هاوارکردن، چەپڵەو سەماکردن. شەقامەکان: لایەک شادی و هەڵپەڕکێ و خەڵک پیرۆزبایی لە یەکتر دەکرد، لەلایەکی ترەوە راوی پاشماوەی رژێم بوو. ئەوانە خۆیان دەشاردەوە. لەم لا بۆ ئەولا هەڵدەهاتن، هەر کەسێک بەر دەستی جەماوەر بکەوتایە، پەت ئامادە بوو، ملیش لەموویەک باریکتر. دادگای سەر شەقامەکانم بەرچاو نەکەوت، پەت و عامووديش کەم نەبوون.

لەدەرەوەی شار ئەو رۆژەم بینی، کە قەرەوەیسی تێدا کوژرا. دەریایەک خوێن، سەدان لاشە بەسەر یەکدا کەوتبوون. دادگایی ئاساییە و سزادان بەگوێرەی قانون، بەشێکە لە

دادپەروەری. بەڵام شەلم کوێرم هیچ نابوێرم، ئاماژەیەکی باش نییە. مانگەشەو سەر لەئێوارە دیارە.. ئەم دیمەنەم قەت بیرناچێتەوە. دەریایەک خوێن. نامەوێت یەک دێڕی لەسەر بنووسم، چونکە دڵنیام هەر کەسێک نووسینەکەی منیش بخوێنێتەوە رەنگە دوو سێ مانگ باری دەروونیی بشێوێنێت.

پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ گەیشتینەوە سابڵاخ. کەسانی بێئەزموون و خوێن گەرم، چەکیان کردبووە شان و دەستە دەستە، بەرەو پادگان رۆیشتبوون. هەر لەدوورەوە تەقە دامەزرێنرابوو. رۆژەڕێیەک لە دەرگای پادگانەوە دووربوون، بە گوللەی وێڵ و تەق و توقی بێ ئامانج، حەوت شەهید و سی چل بریندار. پادگان بڕیاری تەقەکردنیان نەبوو. ئامادەش نەبوون هەروا خۆیان بەدەستەوە بدەن.

# بەرەو بۆکان

## (٤)

### دەچمە سەر ئاڵەشکێنی بەرامبەر بە بۆکانی

حەسەن زیرەک

یەک دوو رۆژێک لە مەهاباد مامەوە. دلێری سەید مەجیدیش پەیدابوو. سەرقاڵی سەردان و پەیوەندی و بەسەرکردنەوەی لایەنگرانی یەکێتی بوو. رایەڵ و پردی دۆستایەتی لەگەڵ گروپە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی ئەوێندەرێ گرێدابوو. دوو ناسیاو بەدوامدا هاتن. نامەیەکی مام جەلالیان دامێ وەکو چکلێت پێچرابووەوە: عومەر دەبابە و د. فوئاد مەعسووم لە بۆکان چاوەڕوانم دەکەن. خومەینی برووسکەیەکی بۆ ناردبوو، داوای کردبوو شاندێک بەرزووترین کات سەردانی بکات. سیقۆڵی بۆ تاران بڕۆن و هەوڵبدەن پەیوەندی توندوتۆڵ لەگەڵ حکومەتی نوێ دامەزرێنن.

بە ئۆتۆمبێل منیان گەیاندە بەردەم ماڵی د. جەعفەر. ئەوەی دەنکە جۆیەکی ماڵی پاشای خواردبوو لەوێ بوو، (عومەر دەبابە، د. فوئاد، جەعفەری شەفیعی، سەلاحەدینی موهتەدی،...تاد)، دیوەخان جمەی دەهات. سەماوەر دانراوەو چای دیژلەمە بێوچان دادەنرا. دوو رووباری لەیەک دابڕاو، لەیەکیان دایەوە. هیوایەکی گەورە لەسەر سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێران هەڵچنرابوو. شارەکانی رۆژهەلات لەسەرپێ بوون:

داوای ئۆتۆنۆمی (خودموختاری)یان دەکرد. شا ڕۆیشت، کورد زۆر دڵی خۆش بوو، کە زوڵم وزۆرو دیکتاتۆریەت کۆتایی پێهات، بەڵام ئەم گەلە خاوەن دامەزراوەی نەتەوەیی یەکگرتوو نەبوو: نە هێزی سیاسی یەکدەست و نە بەرچاوڕوونیی هەبوو. دەوڵەتی ناوەندی سەرجەم یەکە کارگێڕییەکانی بە ناوەندەوە گرێدابوو: سیاسەتی تواندنەوەو سڕینەوەی کولتووری و هاڕینی نەتەوەیی پەیڕەو دەکرا. هێزو گروپە سیاسییەکان بیریان لای خۆپڕچەککردن و پەیداکردنی تەقەمەنی و داهات بوو.

ڕێگەی شارەکان پچڕێنرابوون: هات و چۆ لەبازنەیەکی داخراودا بە ئاسانی ڕێگەی پێدەدرا. پاشماوەکانی ڕژێمی پێشوو، لەوە لاوازتربوون بتوانن بەرەنگاریی بەهێز بکەن: بەرەی شۆڕش هێجگار فراوان و بەتوانا و دەسەڵات بوو. د. جەعفەرو هاوڕێیانی تری کۆمەڵە بە تەلەفۆن دەنگوباسی ڕێگایان دەپرسی. لەبۆکانەوە تا تەورێز ڕێگاکان کێشەیان نەبوو.

عومەر دەبابە، د. فوئاد، د. جەعفەر، مامۆستا محەمەدی بۆکانی و بەندە بەبێ کێشە و سەرئێشە گەیشتینە تەورێزی پایتەختی ئازەربایجانی غەربی. لەوێ گوتیان: هات و چۆ بۆ تاران ڕێگە پێنەدراوە، تەنیا ڕێگەی ئاسمانی هەیە. ئەوان هەموویان پاسپۆرت و ناسنامەیان هەبوو، تەنیا من هیچ شتێکم پێنەبوو. پێنج قۆڵی بۆ لای ئایەتوڵڵا (طباطبائی) چووین. نووسینگەکەی لەشارە زەردەواڵە دەچوو. هەر ژوورێک سی چل کەسێکی تێدا خزابوو، بواری هەناسەدان و هات و چۆی ئۆکسجین نەمابوو. خۆمان گەیاندە لای (طباطبائی) و گوتمان

دەمانەوێت سەردانی ئیمام بکەین و بانگهێشت کراوین. سەیری دەموچاوی نەکردین و پرسیاری نەکرد. کاغەزێکی داینێ بۆ فڕۆکەخانە و تکتمان بڕی و بەرەو تاران فڕین. ئەمە یەکەمین جار بوو، گەشتی ئاسمانی بکەم.

## سەردانی خومەینی
## (٥)

ژوورێکی پێنج کەسیمان لە ئوتێلێکی مام ناوەندی گرت. من یەکەمین جاربوو گەرمکردنەوەی ژوور بە (شۆڤاز) ببینم. حەمامێکی رۆژئاوایشی هەبوو. خۆم دەزانم لە قەندیل چەنێک رشک و ئەسپێمان پێوەبوو. جاری ئەوتۆ هەبوو، بە سێ مانگ فریای خۆشتنێک نەدەکەوتین. د. فوئاد و عومەر دەبابە دەیانزانی ((کاڤیار))چییەو چۆن دەخورێت! منی لادێی داماو یەکەمین جاربوو لە دوکان و بازاڕدا چاوم بە ((کاڤیار)) بکەوێت! ئەوان دەیانزانی سوودی چییە؟. من تەقەی سەرم دەهات. عومەر دەبابە دەیگوت: کێشەی دڵم هەیە و دەبێ پارێز بکەم. ئەوان خواردنیان لەبازاڕ دەکڕی و دەبوایە لەبەر پارێز و پارێزگاری نانخواردنی ئێواران بە گوێرەی دڵی ئەوان بێت. (زەلاتە، ماست، پەنیر، نانی گەرم، کاڤیار...) لەسەر مێز دادەنران.

خومەینی لە (مدرسەء علوی)بوو. د. جەعفەر شارەزای تاران بوو. لە ژمارەی تەلەفۆن پەیداکردن و کات دانان کارامە بوو. ژمارەیەک کەسانی نزیکی (ئیمام)ی دەستکەوت و پەیوەندی لەگەڵدا گرتن. ئەوان گوتیان: سبەی سەعات حەوتی ئێوارە لای دەرگای سەرەکی چاوەڕوانتان دەکەین. ئێمەیش لەسەر بەڵێنی ئەوان بۆ شوێنی دیاریکراو رۆیشتین. دەیان هەزار کەس لەبەردەم قوتابخانەکە ئاپۆرەیان بەستبوو. هەزاران کەس بە عەمامە و عەبا و نەعلەوە وەکو رۆژانی عاشوورا دەسووڕانەوە. کەس کەسی نەدەناسیەوە! خەڵک هەموو هاواریان دەکرد: (ما

منتظر دیدار تویم خمینی)* پێنج دەقیقەیەک سەد هەزار کەسێک لە کەللەی سەرەوە هاواریان دەکرد. دەرگایەک لەسەرەوە کرایەوەو ئیمام هاتە بالکۆنەکە و دەستی راستی بەرزکردەوە. یەک وشەی لەزاری دەرنەچوو. خەڵک بە توندتر هاواریان دەکرد (زندە باد خمینی! زندە باد خمینی!). هەرجارە دەستی راستیان بە مست نوقاوی بەرزدەکردەوە.

سەرنجی محەمەد و د. فوئاد و عومەر دەبابە و د. جەعفەرم دا، سۆزو هەڵچوون و حەماسیان لەو خەڵکە گەرمتر بوو. من تاقەتی دەست بەرزرکردنەوە و هات و هاوارم نەبوو. د. جەعفەر بە تەنیشتمەوە وەستابوو، سەرنجی دام، نەدەست بەرز دەکەمەوەو نە هاوار دەکەم.

گوتی: ((جەفە! دەست بەرز بکەرەوە!)).

((دەست بەرز ناکەمەوە!))

بەدەستی چەپی مەچەکی دەستی راستی گرتم و بەتۆپزی بەرزی دەکردەوەو لەبری منیش هاواری دەکرد:

(زندەباد خومەینی)). دوو سێ دەقیقەیەک ((ئیمام)) دەرکەوت و گەڕایەوەو دەرگاکە داخرا. د. جەعفەر گوتی: ((دیمەنێکی سەیر بوو!)).

من گوتم: ((نازانم پێنج شەش مانگی تر چی روودەدات؟)).

پاش دە ساڵ لە ئەڵمانیاو زانکۆ تێگەیشتم ((کاریزما)) چییە و بۆ دکتۆر جەعفەر ئەو چرکەیە ئاگای لەخۆی نەمابوو! وەکو دەروێشێک ((حاڵ))ی گرتبووی، سوور سوور ببووەوەو هاواری دەکرد.

---

* ئێمە چاوەڕوانی دیداری تۆین خومەینی.

زۆر چاوەڕوان بووین! چاوەڕوانی و پرسیار هیچ سوودێکی ئەوتۆی نەبوو.

ڕۆژی دووەم و سێیەم و چوارەم.. کاتیان دیاری دەکرد، ناونیشانی وردیان دەداینێ. لەو سەرەوە بەدەستی بەتاڵ دەگەڕاینەوە. هەفتەیەک هەموو ڕێکاکانمان تاقیکردەوە.

ڕۆژێکیان محەمەد گوتی: (( ئەرێ برا ئێوە کەستان عەرەبی نازانن؟ ئەمجارەیان یەکێک بە عەرەبی قسەیان لەگەڵدا بکات!)).

دکتۆر فوئاد بەعەرەبی داوای کرد، کەسێکی بۆ بانگ بکەن عەرەبی بزانێت. عەرەبیزانەکە زاوایەکی خومەینی بوو. سبەی سەعات هەشتی بۆ دیاریکردین و بەردەم دەرگایەکی چکۆلەی سەوز بوەستین!

لە کات و شوێنی دیاریکراودا ئامادەبووین. سەعات هەشتی ڕێک دەرگا کرایەوە. پیاوێکی گەنجی سادە، عەرەبیزانێکی باش پێشوازی لێکردین. بە پلیکانەکاندا سەرکەوتین. کۆریدۆرێکی دووورودرێژ. سەدان ئاخوند بە عەمامە و عەبای ڕەشەوە دەهاتن و دەچوون. ژورەکان پڕپڕبوون لە ئاخوون و عەمامە بەسەر. درمان بە قەڵەباغیەکەدا.

حسین خومەینی*، کوڕەزای ((ئیمام)) لاوێکی تازە پێگەیشتووی زۆر بەڕێزو کراوەبوو، بە گەرمی بەپیرمانەوە هات. تەوقەی لەگەڵداکردین، ئەم لاو ئەولا ماچکردین.

ژوورەکە ژوورێکی زۆر سادە بوو. کومبارێکی بۆری چڵکن ڕاخرابوو. خومەینی لەسەر دۆشەگێکی ئیسفەنج چوار مەشقی

* حسین کوڕی مستەفا خومەینییە: تەمەنی بیست ساڵ دەبوو، ماوەیەک پشتیوانی لە ئەبو حەسەنی بەنی صدر دەکردو ((ئیمام)) فەرمانی دەرکرد، ڕەوانەی تاران بکرێتەوەو ئەگەر بە قسەی نەکردن گوللەیەکی پێوەبنێن..

دانیشـتبوو. قەنەفـە و کورسـی و مێـزی لێنـەبوو. وێنـە لەسـەر دیـوارە سـەوزباوەکە هەڵنەواسـرابوو. ئـەم ژوورەش جمـەی دەهات. کامیرامانێک وێنەی دەگرتین. ژن و پیاو بە دیوارەکانەوە نووسابوون و چاوەڕوان بوون ((زیارەت))ی ((ئیمام))بکەن.

خومـەینی تەمـەنی (٧٩) سـاڵ دەبـوو. گـوێی لەمیوانـەکانی دەگرت. ژنێک بـە منالێکـەوە داوای (دوعـا)ی لێکرد، زاواکـەی و حوسـێنی کوڕەزای تکایان لەمیوانـە منجڕەکان کرد، کە دەمێک بـوو دانیشـتبوون، جێگـەمان بـۆ چـۆڵ بکـەن. لەبـەر هەڵسـان و (تعارفات)ی ئێرانیم لـەودا بـەدی نـەکرد. دانیشـتین! حسـێن کـاری وەرگێڕانی دەکرد و د. جەعفەر و محەمـەد بـە فارسـی دەدوان و ئەوانیش هەریەکە چەند دێڕێکی وەرگێڕا.

د. جەعفـەر گـوتی: ئێمـە شـاندێکی کـوردین و بـۆ پیرۆزبـایی هـاتووین! ((ئیمـام)) هـەروەکو کەسێک پێشـتر زانیـاری و زەنگی مەترسـیداری پێگەیشـتبێت و چـاوەڕوان بووبێـت، لـە دەسـتی یەکەمەوە زانیاری پێبگات. یەکسەر گوتی:

((این زمزمه چیست که من در کردستان میشنوم؟))*

د. جەعفەر و حسین زوو فریاکەوتن و گوتیان ئەمانە کوردی عیـراقن و دژی سـەدام حسـین خـەبات دەکـەن و ئـەوەی رووی داوە لە کوردستانی ئێران روویداوە..

خـوڕەی قەڵبـەزەی گلـەیی و گازنـدەی قـووت دا، سـەرێکی لەقاندو بۆ سەر هێڵی گشتی بایدایەوە:

---

* واتـە: (ئـەم هەرایـە چییـە، کـە لەکوردسـتانەوە پێمـان دەگـات؟). مەبەسـتی لەرووداوی پەلاماری پادگاکانی سابلاخ و شوێنەکانی تر بوو.

((ئـــەم شۆڕشـــەی ئێمـــە دژی (طـــاغوت) و ســـتەمە، بـــۆ ڕزگارکردنی (مستضعفین)ە، خۆی لە سنووری ئەم مەملەکەتە قەتیس ناکات. ئەمە شۆڕشی هەموو گەلانی موسڵمانە دژی زوڵم وزۆر و ستەمکاری..)). ئیمام وەکو ئیمام دەدوا، نەک وەکو سەرکردایەتی سیاسی ڕۆژهەڵاتی ئاسایی. گفتوگۆو دانوستاندن و دیالۆگ نەبوو. بیروڕای خۆی دادەڕشت و بۆچوونی لەسەر شۆڕشی ئیسلامی و ئێران و ئیسلامی شیکردەوە. تێبینی ئەوەم کرد، لەکاتی وەرگێڕانی قسەکانی بۆ عەرەبی لەلایەن حسێنی کوڕەزایەوە، ئەو ویرد و دوعای بەسەر منداڵێکی ساواوە دەخوێند، کە بە باوەشی دایکیەوە بوو. ژنەکە نیوکیلۆیەک نوقڵی لەکیسەیەک کردبوو، لەبەردەمی داینا تکای لێکرد دوعای بەسەردا بخوێنێت. ئەویش دڵی ژنەکەی نەشکاندو داواکەی جێبەجێکرد. ئێمە داوای پشتگیری و بەدەنگەوە هاتنمان کرد، لەسەر ئەو هێرش و پەلامارەی ڕژێم دژی گەلی کورد دەیکات. ڕووی کردە زاواکە و حسێنی کوڕەزای و گوتی: ((بە سەرۆک وەزیران بڵێن، چاوی بەم شاندە بکەوێت و گوێیان بە باشی بۆ رادێرێت.. تاد)).

ناوی شا و سەدام و بەکری نەهێنا. بەڵێنیشی نەداینێ یارمەتیمان بدات. تۆپەکەی بۆ بەرپێی سەرۆک وەزیران هەڵدا. من لەقسەکانی ئەوەم هەڵکراند، بەناڕاستەوخۆ ویستی پێمان بڵێت: شۆڕش دژی ڕژێمی بەغدا بەڕێوەیە و عیراق و ئێران بە یەکدا دەتەقنەوەو ئامادەبن بۆ ئەو شەڕە.

سەرکردایەتی یەکێتی هەموویان سونی و بەحیساب عەلمانی بوون، زۆر بە زەحمەت لەگوتاری نوێی ئێران تێدەگەیشتن و

چەند سەرکردەیەکیش نێویان ((عومەر))* بوو. ئەمەش دیوەکەی دیوەکەی تری کارەساتەکەبوو!

من تێبینیەکی کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژیم لەلا دروستبوو، کاتێک محەمەد پێشنیازی بۆ کردین، لەبری فارسی، کەسێک بە عەرەبی قسە بکات، ئینجا ئەوان بە باشی دەیخوێننەوە، دیارە ئەوە پەیوەندی بە گرێکوێرەیەکی دەروونییەوە هەیە. دەوڵەتێکی مەزنی وەکو دەوڵەتی ساسانی، بەرگەی پەلاماری ژمارەیەکی کەمی عەرەبی تازە موسڵمان ناگرن و ژیاری و کولتوور و دامەزراوەی هەزار و سەد ساڵەیان، لەماوەی چەند مانگێکدا ژێر و ژوور دەبێت. دەوڵەتی ئێرانی دروستکرایەوە و شەقڵی مەزهەبی لێدراوە، بەڵام ئەو گرێکوێرەیە، کە تەمەنی هەزار و چوار سەد ساڵە چارەسەر نەکراوە! فیردەوسی (شانامە)ی پێش هەزار ساڵ نووسی و رۆحی بە بەر گەلی فارسدا کرد. شا ئیسماعیلی سەفەوی دەوڵەتی ئێرانی لەسەر بنەمای مەزهەبی شیعەگەری دروستکردەوە، بەڵام هێشتا قسەکردن بەعەرەبی کاریگەریی دەروونیی زۆر جیاوازی هەیە.

---

* عومەر دەبابە، عومەر عەبدوڵڵا، عومەر شێخموس،..

دواتریش: عومەری سەید عەلی، حاکم عومەر عەزیز،..

# جێگری سەرۆک وەزیران
# (٦)

لەسەر راسپاردەی ((ئیمام)) پەیوەندیمان بە ((دەفتەر))ی سەرۆک وەزیرانەوە کرد. ئەو ماوەیە سەرۆک وەزیران (مهدی بازرگان) لەتاران نەبوو. د. ئیبراهیم یەزدی (١٩٣١ ـ ٢٠١٧) جێگری سەرۆک وەزیران بوو. پەیامەکەی پێگەیشتبوو، لەنزیکترین کاتدا چاوی پێمان بکەوێت.

د. ئیبراهیم یەزدی* پیاوەی دیاربوو پاژێکی زۆری تەمەنی لە ئەمەریکا بەسەر بردووە. بەڕوویەکی گەشەوە پێشوازی لێکردین. ریشێکی تەنکی ماش و برنج و چاویلکەیەکی پزیشکی و قژێکی پڕ و لەشێکی تۆکمە و دەم و چاوێکی خڕی هەبوو. بە وردی پرسیاری لێدەکردین. نوکتە و قسەیەکی خۆشی دەدۆزیەوە. زۆر گەرم و گوڕ بوو. هەڵس و کەوت و جوڵانەوەی رۆژاوایی بوو. حەزی دەکرد بزانێت وشەی (دەبابە) چییە و لەچییەوە هاتووە؟

رەنگە لەدڵی خۆیدا گوتبێتی پیاوێک ناوی (عومەر) بێت و نازناوەکەی (دەبابە) بێت، خودایە دەبێ ئەم دەبابەیە چی بێت؟

ئەمیش یەکسەر گوتی: (Tank).

د. یەزدی لەناخی دڵەوە لە قاقای پێکەنینی دا Yes, Chieftain Tank! بە (تانک) زۆر پێکەنی. گوتی: ماشەڵلا دەبابەیەکی تەواوی.. !You are a Big Tank. پتر لە

---

* لەسالانی دواتر کێشەی زۆری بۆ دروستبوو. چەند جارێکیش تووشی زیندانیکردن هات.

سەعاتێک پێکەوە دانیشتین. باسی خەباتی (ی. ن. ک)کرا دژی رژێمی عێراق و ئێرانی سەردەمی شا. داوای پشتیوانی و هاریکاریمان کرد. جەختمان لەسەر ئەوە کرد، رژێمی بەغدا، شەقلێکی شۆڤینی و مەزهەبی و فاشی پێوەیە و کورد و شیعە دەچەوسێنێتەوە. رەنگە زۆری پێنەچێت لەگەڵ حکومەتی نوێی ئێران نەچێتە سەنگەرەوە!

ئەو پێیگوتین: رێکخراوی رزگاری فەلەستینی نوسینگەیان لە تاران کردۆتەوە و دەتوانن سەردانی (هانی الحسن) بکەن، کە نوێنەری ئەوانە و لەم نزیکانەدا(یاسر عەرەفات) سەردانی ئێران دەکات و باڵوێزخانەی فەلەستینیش لەتاران دەکرێتەوە. من پێمباشە ئێوەش لێرە نوسینگەتان هەبێت... ئەمە رستەیەکی گرنگ بوو ئەگەر ئێمە لێزان بوینایە.

# نوێنەرایەتی ڕێکخراوی ڕزگاری فەلەستینی (٧)

یاسر عەرەفات هەر زوو پەیوەندی بە خومەینیەوە کرد. ڕەنگە یەکەم فڕۆکەش پاش سەرکەوتنی شۆڕش (هاني الحسن)*ی بۆ تاران هێنابێت. ئەو نوێنەری ڕێکخراوی ڕزگاری فەڵەستینی بوو، لەناو تەلاری ئەنجومەنی وەزیراندا نووسینگەی بۆ کرابووەوە. ئەمە ستراتیژی نوێی ئێران دەردەخات، چۆن هەر لەیەکەم ڕۆژەوە بایەخیان بە کێشەی فەلەستینیەکان داوە! شاهنشای ئێران خۆی بە دۆستی ئیسرائیل دادەنا و پەیوەندیەکی پتەو لەنێوان ئێران و ئیسرائیلدا هەبوو. ئەمان سەفارەتی ئیسرائیلیان داخست و کلیلەکەیان ڕادەستی یاسر عەرەفات کرد.

(هاني الحسن) پیاوێکی کەڵەگەت و زمانپاراو، خاوەن بڕوانامەی دکتۆرا لە ئەندازیاری بوو. یەکێک بوو لە سەرکردەکانی (الفتح) و هاوڕێی یاسر عەرەفات و تەمەنی (٤٠) ساڵ دەبوو. زۆر بە گەرمی پێشوازیی لێکردین و گوتی: ((عەرەفات سێ چوار ڕۆژ لەمەوپێش دەیویست بۆ ئێران بێت. ئیسرائیل پلانی بۆ فڕاندنی دانابوو. ئەو بە پلانەکەی زانیوەو سەفەرەکەی بۆ کاتێکی نادیار دواخستووە..)).

* هاني الحسن (١٩٣٩ ـ ٢٠١٢).

گوێی لێگرتین و هەرچیمان لەسەر رژێمی بەغدا گوت، ئەو نە داکۆکی لە بەغدا کرد و نە پشتیوانیی لە ئێمە کرد. لەبواری دیپلۆماسیدا کەسێکی شارەزابوو. بە ڕستەی جوان و ماریفەت نواندن خۆی لە کەند ولەند نەدەدا و دڵی بەرامبەرەکەی رادەگرت.

# داریوش فروهەر
## (٨)

داریـوش فروهـەر (١٩٢٨ ــ ١٩٩٨) پیـاوێکی کەڵەگـەتی، بـە هەیبەتی، سمێڵ رەشی، قیت و بادراوی جوان. بە سمێڵەکانیەوە دەناسرایەوە و شانازی پێوە دەکرد. ماوەیەک لەبن مەترسیدا بوو، بڕیاری دابوو بۆی دەرچێت. یەکێک پێی گوتبوو: دەرباز بوونت ئاسانە، بە مەرجێ سمێڵت بتاشیت. بەرسیڤی ئەو: لە ملم بدرێت ئاسانترە، تا لە سمێڵم بدرێت! پارسانەکانی کرند و گـۆرانی قـەلازنجیرم بینیـوە مردنیـان لـە سـمێڵ تاشـین پـێ خۆشترە!

سـاڵی ١٩٤١ فروهـەر و موحسـین پزیشـکپوور، بزاڤـی (پـان ئێرانسـت) دروسـت دەکـەن. ئـەم جوولانـەوەیـە بـڕوای بـە یەکگرتنەوەی (گەلانی ئێرانی) و (ئاری نەژاد) هەبوو. فروهـەر لـە ١٩٥١ ماڵئاوایی لە (پان ئێرانست) دەکات و (حزب ملت ایران) دادەمەزرێنێت. لەتەمەنی پانزە ساڵیەوە دکتۆر (محمد مصدق) دەناسێت و لەناو (جبهەء ملی ایران) خۆی دەدۆزێتەوە. تا ساڵی ١٩٧٩ خـۆی و پەروانـە فروهـەری خێزانـی لەسـەرکردەکانی ئۆپۆزسیۆن بوون و چەندین جار تووشـی تـەنگ پێهەڵچنین و زیندان هاتبوون.

سـەردانی فروهـەرمان کرد. مـاڵێکی سـادە؛ نـە پاسـەوان و نـە پرسـگە بـەردەمی گـرتین. زۆر حـەزی لـە ئەتـەکێتی مـۆدێرن و (تعارفات)ی ئێرانی بوو: دەستی راست بە سنگەوە گرتن و خۆ چەماندنەوە بەرامبەر بە میوان، بەو سمێڵە جوانانەوە، کە هـەر لـەخۆی دەهـات.. نیـوەی سـالۆنەکە بـە نـایلۆن و کاغـەز داپۆشـرابوو. وەسـتاو کرێکـار سـەرقاڵی بۆیـاخکردن و

دیکۆربوون. لەسەر رووبەرێکی بچووکی سالۆنەکە، نیو تاقمی شینی ئاسمانی و بێجی دانرابوو. بە ئەوپەڕی گەرمیەوە پێشوازی لێکردین. داوای لێبوردنی کرد بۆ پشێوی ناو ماڵ و تەق و تۆقی کرێکاران. ئێمەش داوای لێبوردنمان کرد و گوتمان دەتوانین لە کاتێکی گونجاودا بگەڕێینەوە. بە تکای لێبوردنەوە دایینیشاندین و گوتی: ئەمە ماڵی خۆتانە.. شاندەکە خۆی ناساند و بەکورتی تیشک خرایە سەر هێرشی رژێم و هەڵمەتی لەناوبردنی گەلی کورد و پێناسەکردنی یەکێتی. من دەستخۆشیم لێکرد؛ بە بۆنەی گوتارێک، کە لەرۆژنامەی (اطلاعات) لەسەر کێشەی کورد لەروانگەی پان ئێرانستەوە نوسیبووی. بزەیەک هاتە سەر لێوانی و رووی گەشتر بوو، کاتێک زانی ئێمە لەو دوورەوە، ئاگاداری نووسین و بیروڕای ئەوین.

گوتی: (( من وەکو کوردێک* بڕوام بە رزگاری کوردستان هەیە، لەناو پڕۆژەی رزگاری و یەکگرتنەوەی گەلانی ئێراندا..))!

فروهەر بەدرێژایی ئەوکاتەی پۆستی وەزیری کاری وەرگرتبوو، دەرگای بۆ یەکێتی لەسەر پشت بوو. بە نامەیەکی مام جەلال لەتارانەوە دەگەیشتە سەردەشت. ئامادەبوو لەگەڵ نوێنەری هێزە کوردستانییە چەکدارو سیاسییەکاندا بۆ گفتوگۆ دابنیشێت. ئەنجامی گفتوگۆ ((بێ بەرهەم)) بووە، یان نەبووە، ئەوە پێویستی بە هەڵسەنگاندنی بابەتی هەیە. من بڕواناکەم، لەناو سیستێمی دەسەڵاتی (نوێ)دا! تاوانی شکستی گفتوگۆکان دەستۆی نیازپاکی فروهەر دابنرێت!

---

* داریوش و پەروانە فروهەر بەدەست بەسراوی، لەلایەن کەسانی نەناسراوەوە بە چەقۆ لەماڵەکەی خۆیاندا ونجڕ ونجڕ کران.

- فروهەر، لە ئەسفەهان لەدایکبووە و باوکی ژەنەڕاڵێکی گەورە بووە و ساڵی ١٩٤١ کوژراوە. من ئەوکاتە پێم جوان نەبوو بپرسم کوردی کوێیت!!

# ئایەتوڵڵا طالقانی

## (٩)

ئایەتوڵڵا مەحموود طالقانی (١٩١١ ـ ١٩٧٩) هەشت مانگ دوای سەرکەوتنی شۆڕش لەتەمەنی (٦٨) ساڵیدا کۆچی دوایی کرد. یەکێک لە نەیارە سەرسەختەکانی ڕژێمی شا و لایەنگری (محمد مصدق) بوو. ئەندامی سەرکردایەتی (حزب نهضت ازادی ایران)بوو. ماوەی (١٥) ساڵ بە پچڕپچڕی لەناو زیندانە تاریکەکانی شادا ژیانی بەسەر برد. سێ چوار مانگ پێش سەرکەوتنی شۆڕش ئازاد کرا. طالقانی و خومەینی هەردوکیان بەگەورەترین سەرکردەی دینی دژ بە شا دادەنران و دەورێکی گرنگیان لە ئاراستەکردن و هاندانی خۆپیشاندەران هەبوو. پاش تیرۆرکردنی مطهری ئەم بووە سەرۆکی (شورای انقلاب اسلامی) ١٩٧٩/٩/٦ خومەینی بە ئیمام جومعەی تاران داینا و سێ ڕۆژ پاشتر ١٩٧٩/٩/٩ کۆچی دوایی کرد.

طالقانی بەتوندی دژی ویلایەتی فەقیهە و سەپاندنی حیجاب و باڵاپۆشی ژنان بوو. جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە، کە نابێ ژنان بە ناچاری سەرپۆش بەکاربهێنن و دەبێ ئازاد بن. سەپاندنی حیجاب پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامە.

ئێوارەیەکی سەرەتای ئازار سەردانمان کرد. ماڵەکەی هەر زۆر سادە بوو. ژووری میوان بە کتێبی ئەستوور ئەستوور داپۆشرابوو. سێ کەس بە چاکەت و پانتۆڵەوە لەم لاو ئەولای دانیشتبوون. سەرەتا خۆمان ناساند. گوتی: ((لای من ئاساییە بە عەرەبی قسە بکەن و من بەفارسی وەڵامتان دەدەمەوە!)).

زانایەکی ئاینیی کراوە و لیبرال بوو. گفتوگۆی ئەم زۆر دۆستانە و خۆمانە بوو. هەستت دەکرد: دەمێکە دەیناسیت و لەزمانی یەکتر تێدەگەین.

ئەو پاژێک لە کوردە زیندانییەکانی ئەو سەردەمەی ئەودیوی بە باشی دەناسی. گوتی: ماوەیەکی کورتە ئێمە پێکەوە دانیشتوین. لەقسە و گفتوگۆی ئێوە دەردەکەوێت، لەرووی سیاسی و فەرهەنگییەوە ئێوە لەچاو کوردی ئەم دیو، زۆر روناکبیر و پێشکەوتووترن. من ماوەیەکی زۆر لەزیندان لەناو کوردەکاندا بووم، بەداخەوە هیچیان تیا بەستە نییە.ئێمە پشتیوانی ئێوەین بۆ رزگاربوونی کوردستان لەدەست رژێمی بەغدا. بڕوامان بەوە هەیە، گەلان ئازادبن و سنوور نەمێنێت. ئێمە هەموو موسڵمانین. (واعتصموا بحبل الله جميعا ولا تفرقوا).

## خۆپیشاندانی ژنان

## (١٠)

یەک دوو هەفتەیەک بەسەر نەمانی شادا تێنەپەڕیبوو، خومەینی فەتوای حیجاب و لەچکی دەرکرد. ئێمە بەڕێکەوت ئەو پێشنیوەڕۆیە پیاسەمان دەکرد، ڕێپێوانێکی مەزنی ژنانمان بینی، کە دژی ئەو فەتوایە هەستابوون. ڕۆژنامەی کەیهان ژمارەی خۆپیشاندەرانی مێینەی بە (٢٠٠.٠٠٠) ژن مەزندە کردبوو. ژنان و کەسایەتیە ڕۆشنبیری و سیاسیە لیبرال و دیموکراتەکان ئەمەیان بە یەکەم ئاماژە و زەنگی مەترسیدار بۆ سەر ئازادی دانا.

هەستێکی سەیرم لا دروست بوو: ئەوە ژنان تا دوێنێ سینگیان بە فیشەکی سەربازەکانەوە دەنا. ئەوە ئەوان بوون، بەرامبەر تانک و زرێپۆش و جەلادەکان دەیانچریکاند، ئەمڕۆ! ئەو دەسەڵاتەی ئەوان پشکی شێریان لەدامەزراندنی هەبوو، لەبری فراوانترکردنی ئازادی و دیموکراسی و پاداشتکردنیان، بڕیار دەدات دەست بخاتە بینی ئازادی..

## سازمانی ئینقلابی

## (١١)

تارانی دوای شۆڕش، نە لەتارانی ئەمڕۆ و نە لەتارانی پێش شۆڕش دەچوو! هەر کۆلانێک بارەگای چەند حیزب و ڕێکخراوێکی لەخۆ دەگرت. تاران شارەزەدەواڵەی ڕێکخراوی

سیاسـی بـوو. هەریەکـە خـۆی بـەخاوەن شـۆڕش دادەنـا و پێیوابوو: مەلاکان بۆ ناو مزگەوتەکانیان دەگەڕێنەوە* و سـەریان لەکاری سیاسی دەرناچێت. ئەمڕۆ یان سبەی جڵەوی دەسـەڵات رادەسـتی ئـەوان دەکرێـت: ئـاش لەخـەیاڵێک و ئاشـەوان لەخەیاڵێک...

هەڤاڵانی (سـازمانی انقلابی)مـان دۆزییـەوە (د. حسـین، ئیرەج کەشکولی...). ئای خودایە چەند دڵیان بەهاتنەکەمان خۆش بوو هەریەکەیان ناوی راستەقینەی خۆی بۆ دەدرکاندین. بەسەرهاتی خۆی دەگێڕایەوە. زۆر دڵیان خۆش بوو، کە لـەداهاتووی نزیکدا دەورێکی گرنگ لەئێران دەگێڕن.

سـەرکردەکانی سـازمانی ئینقلابی پـێش ۱۹۷۰ لـە بـەکرەجۆ بوون و ئەوان بیروبـاوەڕی (مـاوزەتۆن) یـان بـۆ نـاو کوردسـتان هێنـا. کملـک لـەبن کاریگـەری ئەمانـدا بـەلای ئەندێشـەی ماوتسـی تۆنگدا دایشـکاند. مـام جـەلال و پاژێـک لەسـەرکردەکانی کۆمەڵـە خۆیـان بـە دەروێشـی سـازمانی ئینقلابـی دادەنـا. سـەیر ئەوەیـە زۆربەی سەرکردەکانی سـازمانی ئینقلابیش خۆیـان بەدەروێشـی مام جەلال دەزانی.

سەرکردەکانی سازمانی ئینقلابی زۆربەیان (سەرۆک ماو)یان بینیبوو، سەردانی بەیژینیان کردبوو. لەچین و مـاچین و ئەلبانیا و کوبا مەشق و راهێنانیان کردبوو. ئاستی رۆشـنبیرییان بەرز بوو، لەگەڵ سەرکردەکانی کملک بەراورد نەدەکرا.

---

* ئایەتوڵڵا خومـەینی لـەپاریس ئامـاژەی بـۆ ئـەوە دەکـرد، خـۆی تێکـەلاوی کاری سیاسی و دەوڵەتداری ناکات!

# ڕاپەڕینی شاری یان خەباتی چەکداری شاخ؟
# (١٢)

ئەو ماوەیەی لە ئێران بووم، فارسییەکەم دەمەزەرد کردەوە. کتێبخانەی فارسی زۆر دەوڵەمەندە. من بە ڕۆژنامە و ڕادیۆ تۆزێک فارسی فێرببووم. جاران وامدەزانی فارسییەکی زۆرباش دەزانم و لەگەڵ هاوڕێ فارسەکانمدا، بە فارسی قسەم دەکرد. ئێستا دەزانم فارسیزانی تەنیا خوێندنەوەی ڕۆژنامە، گوێگرتن لە ڕادیۆو قسەکردن نییە، دەبێ لە نیزامی، حافز، سەعدی، ئەنوەری و شاملوو بە باشی تێبگەیت.

لەتاران گوتارێکم لەسەر گۆڕانکاری سیاسی لە ئێران نووسی. بەخەباتی چەکداری شاخ (قیام جنگل، قیام سیاەکل،..)یان خەباتی چەکداری ناو شار یا ڕاپەڕینی شاری گۆڕانکاری بنەڕەتی ڕوویداوە(قیام مشروطە، شۆڕشی ٧٩). لەو نووسینەدا گەیشتمە بڕوایەک خەباتی چەکدار هەموو جارێک تووشی شکست هاتووە، بە پێچەوانەوە ڕاپەڕینی شاری (خۆپیشاندان، مانگرتن و ڕێپێوان) شێوەی حکومەت و دەوڵەتی گۆڕیوەو سیستێمی نوێی هێناوەتە کایەوە.

لەو ڕۆژەوە، بەچاوی نائومێدییەوە دەمڕوانیە، دەستدانە چەکی کۆمەڵە و دیموکرات و چریکهای فدائی خلق ایران و... تاد. پێشەکی دەمزانی ئەنجامی (خەباتی چەکدار)ی ئەوان هیچ دوارۆژێکی گەش و ڕوون و ئومێدبەخشی نییە! قسەکردن و نووسین لەم ولاتەی ئێمەدا سوودیان چییە؟

## گەڕانەوە

## (١٣)

گەشتە سیاسیەکەی مانگیەکەمان پێش نەورۆز کۆتایی پێهات.

من دەبوایە زۆرتر لەسەر ڕووداوەکان قسە بکەم و هەموو بابەتەکان وەکو خۆی بنووسم، لەترسی قسەی ساردوسڕی ئەم و ئەو، بۆ قوڵایی گۆمەکان شۆڕنەبوومەوە. جگە لەوەی نووسیومە زۆر چاوپێکەوتن و گفتوگۆ لە لێواری ئەشکەوتەکانی ڕابوردوو دا، بەجێمهێشتوون و بڕوا ناکەم تەمەن ڕێگەم بدات، بەسەریان کەمەوە.

چەندین کەسایەتی و سەرکردەو بەرپرس و حزب و ڕێکخراومان بینی. دیارە لەناو گەرمەی جەنجاڵی دەسەڵاتگۆڕکێ: لەناوچوونی دەسەڵاتێکی شاهنشایی ڕەها، بەدەسەڵاتێکی ئاینی تیۆکراتی ـ مەزهەبی ڕەها، بواری ئەوە نەهاتە پێشەوە، هەر یەکسەر نووسینگە و نوێنەرایەتی لەتاران بکرێتەوە. ئێمە بۆ پیرۆزبایی و خۆناساندن و تێگەیشتنی (دراوسێ)ی دێرین هاتبووین. حکومەت بەناو هەبوو: نە کەس لەجێگەی خۆی مابووەوە، نە کەسیش چڕنووکی بەتەواوی لەگەردنی دەسەڵات گیرکردبوو.

مام جەلال زۆر دڵی بەسەردانەکە خۆش بوو، زۆر بەرزیش پەیوەندی و ڕایەڵەکانی نرخاند. زۆربەی سەرکردایەتیش سەردانەکەیان بەسەرکەوتوو دانا. تەنیا یەک کەس قسەیەکی

کرد، کە هەق نییە پیاوی سیاسی بەو شێوەیە بیروڕای خۆی دەربڕێت:

((توانیتان پارەیەکی زۆر لەگەڵ خۆتانا بهێننەوە؟))!

دەڵێن: (کابرایەکی ریش درێژ، ریشی سووتاوە، کەسێکیش لەولاوە هاتووە و گوتویەتی: دەتوانم جگەرەکەم دابگیرسێنم؟)!

بیرم نەبوو ئەوە بنووسم، پێش ئەوەی بگەینەوە نێوزەنگ، دوو شەو لەسابلاخ لەماڵی خزمێکی سەلاحی موهتەدیماینەوە. سێ قۆڵی سەردانی شێخ عیزەدینی حوسێنیمان کرد. ئێمە تەوقەمان لەگەڵدا کردو ئەم لاو ئەولایمان راموسی. عومەر دەبابە سێجار دەستی شێخ عیزەدینی ماچ کرد.

ئێمە باسی سەفەرەکەی تارانمان بۆ کرد. بیروڕای خۆمان لەسەر داهاتووی دەوڵەتی ئێران بە وردی گێڕایەوە. گوتمان: پێویستە سەردانی خومەینی و تاڵەقانی و حکومەت بکەیت. با هەر لە ئێستاوە گومان و دڕدۆنگی سەرهەڵنەدات. ئەو گوتی: من جارێ چاوەڕێی بارودۆخەکە دەکەم. جەختی لەسەر ئەوە کردەوە: کورد هەر لە لوڕستانەوە تا ماکۆ یەکڕیزە و هەموو داوای ((خودموختاری)) دەکەن. ئەوان ئامادە نەبن هیچ بدەن، ئێمە بۆ سەری خۆمان بێشێنین؟

من گوتم: ((مامۆستا پاژێک لە لوڕەکان بەناوی لوڕەوە روونکردنەوەیەکیان لەرۆژنامەی (اطلاعات)بڵاوکردۆتەوەو دەڵێن: ئێمە کورد نین! خەڵکێک خۆی بەکورد نەزانێت، ناتوانین بە تۆپزی بیانکەینە کورد!))

شێخ عزەدین گوتی: ((ئەوانەی هەفتەی پێشوو روونکردنەوەیان بڵاوکردۆتەوە و ئیمزایان کردووە، چەند کەس بوون؟)).

من گوتم: ((هەشت کەس!)).

ئەو گوتی: ((پێرێ چوارسەد کوردی لوڕ میوانی من بوون. هەموو دەیانگوت: ئێمە کوردین و لەخۆتان جیامان مەکەنەوە. ئەو حەوت هەشت کەسە بەنوێنەری راستەقینەی لوڕ دانانرێن و ئێمە هەڵبژاردەی هەموو لوڕین..))!

ماڵئاواییمان لە شێخ کرد. لەبەرچاوی د. فوئاد، بەعومەر دەبابەم گوت: ((کاک عومەر هەق نەبوو دەستی شێخ عزەدین ماچ بکەیت؟)).

ئەو گوتی: ((سەرکردەیەکی گەورەیە و خۆشم دەوێ و چ قەیدییە؟)).

گوتم: ((تۆ پیاوێکی گەورەو ناسراویت و ئەندامی (م.س)ی یەکێتیت، نابێ ئەم پیاوەشمان لێبکرێتە کەسێک پاش ماوەیەکی تر نەتوانین قسەی لەگەڵدا بکەین..))

ئەو گوتی: ((زۆر ئاساییە و من هەروا دەکەم!)).

گوتم: ((تۆ نزیکەی سی ساڵ لەمن گەورەتری و ردێنت سپی کردووەو من نامەوێ لەسەر قسەی خۆم برۆم..)).

عومەر دەبابە لەئێمە گەورەتربوو. ئێمە رێزی زۆرمان لێ دەگرت. زۆر سوعبەتی ناقۆڵاشمان لەگەڵیدا دەکرد عاجز نەدەبوو! ئەویش پیاوێکی خاوەن ئەزموون بوو، لەقسەی ئێمە دەرنەدەچوو. نوکتە و قسەی خۆشی زۆر بوون. من یەکێکیان هەر بۆ شەوچەرە و دیوەخان و یادگاری دەنووسم:

(ساڵی ١٩٦٩ خۆی و عەلی عەسکەری هەردووکیان ئەندامی (م.س) ی باڵی مەکتەبی سیاسی بوون. دوو قۆڵی دەیانەوێت سەردانی سەعدوون غیدان* بکەن. عومەر دەبابە بەعەلی عەسکەری دەڵێت: تۆ لێرە دانیشە من بەتەنیا دەچمە ژوورەوە. ئەویش دەڵێت: ئەمن بۆ نەیەمە ژوورەوە. ئەو دەڵێت: کارێکی نهێنی و پێویست هەیە دەبێ بەتەنیا بڕۆم! نابێ تۆ لەگەڵم بێیتە ژوورەوە! عەلی عەسکەری دەڵێت: ((کاک عومەر بۆ تۆ کێریت من گونم؟ تۆ بچیتە ژوورەوە و من بەتەنیا لەدەرەوەبم..))! عەلی عەسکەری پێشدەکەوێت و نوکتەکە بۆ سەعدوون غیدان دەگێڕێتەوە. سەعدون غیدان زۆر پێکەنیوە و گوتویەتی: ((دڵنیابن ئەم نوکتەیەی کاک عەلی نەبوایە کارەکەم بۆ نەدەکردی کاک عومەر!))

* سعدون غیدان الکروی(١٩٣٠ ـ ١٩٨٥) یەکێک بوو لەو سێ کەسەی بوونە هۆی سەرکەوتنی کودەتای ١٧ تموزی ١٩٦٨. سەعدوون غەیدان لای زۆر کەس گوتویەتی من کوردم. کروی (کەرۆیی)یە و کەرۆییەکان کوردن و دانیشتووی کەلارن! ئەمانە دەڵێن: کرویەکان ئامۆزاو کەس وکاری ئێمەن و خۆیان کردۆتە عەرەب. (الونداوي، صالحي،...) بەشێکیان کوردن و بەشێکیان عەرەب. سەیر ئەوەیە (کروي)یەکان دوژمنی سەرسەختی کوردن.

# جیابوونەوە و لێکترازان

## (١)

ئێوارەی نەورۆزی ١٩٧٩ گەیشتینە خڕێ نێوزەنگ. بۆنی تۆران و دڵشکان و بۆنکرووزی نائومێدی لێ هەڵدەستا. ئاگر لەسەر شاخ و بەرزاییەکان هەڵکرابوو. دەم و چاوە توورەکان خۆڵی مردوویان بەسەردا بێژرابوو. دووکەڵ، لەسەر باسک و لووتکە بەرزەکان، لەمبەرو ئەوبەری سنووری بەرامبەر یەکتر، سەمایان دەکرد. سیمفۆنیای ماڵئاوایی و دەست لێکبەردان، دۆڵ بەدۆڵ دەڕۆیشت. فرمسێک لەچاوان قەتیس مابوو. (پەڕوەشێن) لەرۆندکبارانی (کانی کەنێر) سەری سوورمابوو. شەڕ کۆتایی پێهاتووە: شەڕێکی بێ تەق و تۆق و قوربانی. ناوچەکە لەپاشماوەی شەڕگەیەکی تینووی تۆڵە و یەکتر پلیشاندنەوە دەچوو. ئاڵای سوورو سپی سەرکەوتن و ژێرکەوتن لەسەر بەردە خوێناوییەکانی بەرە قێزەونەکانی شەڕە ناڕەواکان بەرزنەکراوەتەوە.

بزوتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان (بسک)، ئەو رۆژە بارگەی بۆ هەواری جیابوونەوە و دووبەرەکی و براکوژی تێکنا، ئەستووندەکی تاوڵی یەکڕیزیی ناو یەکێتی وردوخاش کرا. ئەوان بەسەر پردی ئاشتی پشکاوێدا پەڕینەوە و لە (گۆڕەشێر) لەشکربەزیان* کرد. نۆ مانگ پاش گیرانی عەلی عەسکەری، زۆرایەتی سەرکردایەتی (بسک) لەڕووی ئایدیۆلۆژی و

---

* لەشکربەز: چەمکێکی سەربازی کۆنە: لەشکر لە جێگەیەکی نوێ جێگیر دەکرێت.

سیاسییەو سەنگەرەکانیان پتەوتر دەکرد. بەشێک لەسەرانی یەکێتی تۆپبارانی سەرانی نوێی بزووتنەوەیان دەکرد. زمانی دیالۆگ و گفتوگۆ مووی لێ هات. قۆناخی مۆرە کردن و خۆگێفکردنەوەو چەق بەردۆکێی بێ ئەنجام، بەسەر لۆجیک و ئاوزەدا زاڵبوو. هەریەکە لەبنەوە پاشقوڵی لەوەکەی تر دەگرت.

ئەو تراژیدیا پێکەنیناوییە چاوەڕوانکراوە، کە لەمێژووی ئێمەدا بە بەردەوامی خۆی دووبارە دەکاتەوە، هاتەدی. ژمارەیەک لەئەندامانی (م.س) و سەرکردایەتی یەکیان گرتەوە(ڕەسوڵ مامەند، دکتۆر مەحمود عوسمان، حاجی حاجی ئیبراهیم، عەدنان موفتی، عادل موراد فەیلی، قادر جەباری، عەزیز، مەلا ناسیح، شێروان شێروەندی،..). لەسەرکردە سەربازیە دیارەکانیش ئەمانە بوون: (تایەری عەلی والی بەگ، سەید کاکە، سەید سەلیم، عەبدوڵلا سوور، شێرکۆی شێخ عەلی، مولازم ئەنوەری مەجید سوڵتان، مولازم فوئاد چەلەبی، ئەحمەدی فەقێ ڕەش، عوسمانی قالە منەوەر..).

بەم جیابوونەوەو دوو کەرتبوونە ئاسۆیی و ستوونییە، تەرازووی هێزی یەکێتی لەنگی تێکەوت. یەکێتی پێگە و خاڵی بەهێزو تۆکمەی جارانی لەدەست دا. دابەشبوونی سەربازی بەشێوەیەکی ئەوتۆ نەبوو، لایەک بەرۆژی نیوەڕۆ بچێتە سەر ئەوی تر.. دواتر هەردوو مەکینەی پڕۆپاگەندە و ناوونـاتۆرە لەیەک نانیان خستەگەڕ. سیاسەتزانان، تفەنگ بەدەستەکانیان لەیەکتر تیژکرد. کاسەی ڕق و تۆڵە و یەکتر دزێوکردن لێوانلێوبوو. لەسەرانسەری کوردستان ڕاوەدوونان و یەکتر چەککردن و پەلامارو خوێن ڕشتن دەستی پێکرد.

ڕۆژێکیان لەکۆبوونەوەیەکدا مام جەلال پرسیارێکی لێکردم:

((دەبێ ئەم تاقمە بنبڕ بکرێن تۆ چی دەڵێیت؟))!

من گوتم: ((بزووتنەوە کێشەیەکی سیاسیە و دەبێ بەرێگەی سیاسی کێشەکەیان چارەسەر بکرێت!)).

نەوشیروان قسە مەشهوورەکەی کردو گوتی: ((بزووتنەوە زێرابی بزووتنەوەی رزگاری گەلی کوردە. هەرچی گواوی بزاڤی کورد هەیە لەناو ئەم زێرابەدا کۆبۆتەوە. ئەمە هیچ پەیوەندییەکی بەسیاسەتەوە نییە و بەمە ناگوترێت کێشەی سیاسی!)).

بێگومان تا ئەو رۆژەی عەلی عەسکەری لەژیاندا بوو، هەر خۆی برا گەورەو دەمڕاست و باڵاترین کەسی بڕیاردەری ناو بزووتنەوە بوو. ئەو درەختێکی ئەوەندە گەورە بوو، لەبن سێبەری ئەو دارەدا، سەرکردەو کەسایەتیەکانی تر بە ئاسانی دەرنەدەکەوتن و کەسیش نەیدەتوانی قسە لەقسەی ئەودا بکات. لەکاروباری پێشمەرگایەتیشدا، ئەو فەرماندەی گشتی هێزی پێشمەرگەی کوردستان بوو.

تەنیا نۆ مانگ پاش تێکشکانی حەملەی هەکاری و بڵاوبوونەوەی هەواڵی شەهیدبوونی (عەلی عەسکەری و خالید سەعید و شێخ حسێنی بابا شێخ) رێگای کاروچالاکی رەسوڵ مامەند ئاراستەیەکی تری وەرگرت و لەمپەر لەبەردەم ئەودا نەما وەکو کەسی یەکەم خۆی پێناسە بکات. رەسوڵ مامەند و حاجی حاجی برایم، قادر عەزیز، مەلا ناسیح بڕیاریان دا لە دووربینەکەی مام جەلالەوە سەیری ژیان و دەوروبەر نەکەن. پێشتر دڵی دەیان کەسی وەکو عەبدوڵڵا سوور و سەید سەلیم شکێنرا. رەسوڵ مامەند لەئامێزی گرتن. بەرە بەرە ئاڵای ئۆپۆزسیۆن دژی ئۆپۆزسیۆن لە (گۆڕەشێر) بەرزکرایەوە!

مام جەلال ئەو راستیەی دەزانی، عەلی هەژار* لەهەموویان بەرچاو روونتر و رەسوڵ مامەند ئامۆژگاری لەو وەردەگرێت. ئەو پێش کەوتنە رێی حەملەی هەکاری ١٩٧٨/٤/١٥ بە بەردەوامی داوای ئەوە دەکات، بزووتنەوە خۆی لە ی. ن. ک دابڕێت و جیابێتەوە. رۆژی ١٩٧٨/٣/١٩ نامەیەک بۆ یەکێک لە سەرکردەکانی (بسک)** دەنووسێت. من نازانم نامەکە لە کوێیە و چی لێ بەسەرهاتووە. دیارە کەوتۆتە دەست کەسێک، کە دواتر سەروتاری بۆ گۆڤاری (بزووتنەوە) ئۆرگانی بزوتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان نووسیوەو لەکانوونی دووەمی ساڵی ١٩٨٠ بڵاوکراوەتەوە. ئێمە دەقەکەی بەبێ هیچ دەستکارییەک دادەبەزێنین.

(ئەوەبوو زۆری نەخایاند هەر دوای ونبوونی کاکە عەلی و کاک خالید، تاقمەکەی کاک رەسوڵ مامەند ئەو نەخشەیان هێنایەدی کە عەلی هەژار لەنامەی ١٩٧٨/٣/١٩ دا بۆی کێشابوون و تێیدا گوتبوی کە:

((بەرەئی ئێمە بگەڕێنەوە سەر رەئی سەرەتای شۆڕش بەرپابوون، لەرووی عەسکەری هاوبەشی هەموو شتێ دەکەین

---

* عەلی هەژار ١٩٧٠ ـ ١٩٧٥ ئەندامی سەرکردایەتی پارتی بوو. عەلی هەژار و کاردۆ گەلالی رۆژی ١٩٧٩/٤/٩ لەلایەن رژێمی بەغداوە گیران و بێ سەرو شوێن کران. کەس نەیتوانیوە بە بەڵگە ئەوە پشتراست بکاتەوە چارەنووسیان چییە؟

** من پێم وایە عەلی هەژار نامەکەی رەوانەی عەلی عەسکەری کردووەو ئەویش رادەستی سەرکردەیەکی تری کردووە! ئەگەری گەورەش ئەوەیە هەموو نامەکانی عەلی هەژار رەوانەی رەسوڵ مامەند کراین و ئەویش نامەکەی رادەستی عەلی عەسکەری کردبێت و ئەویش لەدڵپاکی خۆی لای کەسێکی هەڤاڵی خۆی دانابێت..

لەگەڵیان بەمەرجێک بە پێی حجم مەسؤلیات دیاری بکرێ و هەر لایەنە ریکخستنی حیزبی خۆی ببێت بە سەربەخۆیی... بەڵام لەڕووی سیاسییەوە دەبێ ئاشکرا بکرێت کە ئێمە مستقلین و لە (ضمنی ی. ن. ک) نین و تەنها دۆستیانین.

بۆ ئەمەش پێشنیار دەکەین کە بەیانێکی تەوضیحی بەناوی بزوتنەوە بەکوردی و عەرەبی دەربکەن پاشان نیشانی بدەن کە لەئەنجامی لەیەک دووربونمان لەگەڵ هەندێ برادەری دەرەوەی وڵاتەوەمان و دووری سەرکردایەتی (ی. ن. ک) لەووڵات هەندی التباس رووی دا لەتعبیرکردن و چۆنیەتی هاوبەشیمان لە ی. ن. ک و ئێمەش بۆ بەرژەوەندی گشتی چاومان لە هەندی مسائل پۆشی بەو ئومێدەی بە لقاءات و گفتوگۆ بتوانین (ی. ن. ک) بگۆڕین بۆ بەرەیەکی نیشتمانی کوردستانی، بەڵام لەئەنجامی ممارسە و کوششمان لەم ماوەیەدا لەو بارەیەوە نەگەیشتینە ئەنجام و لەبەر ئەوە (ی. ن. ک) زۆر شعارات و بیروراکانی اساسی جیاوازی لە گەڵ ئێمە هەیە کەلە ئەنجاما دەوری بزوتنەوە و اتجاهاتی تر بزر دەکات.

بۆیە بە پێوستمان زانی ئاشکرای بکەین کە ئێمە ئەندام نین لە (ی. ن. ک) وە هەموو شعارات و نوسینەکانیان تایبەتیە بە بیرورای خۆیان و تعبیر لەرەئی ئێمە ناکات و ئێمەش بەرپرسیار نین لەئەنجامی).

لەشوێنێکی تری نامەیەکی تریش دا عەلی هەژار داوا لە کاک رەسول دەکات کە ((هاوکاری کردن لەگەل برادەرانی لیژنەی ئامادەکردن زۆر ضروریە بۆ هەموو شتێک و لەئەنجاما دەبێتە بەردی بناغەی یەکێتی راستەقینەی هێزە پێشکەوتنخوازەکانی کوردستان).

# مەکتەبی سیاسی
# (٢)

بە پێویستی دەزانم چەند دێڕێک لەسەر پێکهاتە و بەرنامە و ڕێکاری ئەم دامەزراوەیە بنووسم و هەندێ زانیاری گشتی بخەمەڕوو: ئێمە ئەگەر لەسترکتور و سروشتی ئەم دامەزراوەیە تێنەگەین، ناتوانین لەسیاسەت و مێژووی ئەم حزبە بەجوانی تێبگەین.

مام جەلال هەمیشە دەیگوت: یەکێتی مەلێکە سێ باڵی هەیە: کۆمەڵە و بزووتنەوە و هێڵی پان. پێشمەرگەیەکی، ڕاوچی، قسەخۆش بەمام جەلالی گوتبوو: ((مام جەلال! من هیچ مەلێکم نەبینیوە سێ باڵی هەبێ! ئیدی ئەویش لەو ڕۆژەوە قسەکەی خۆی گۆڕی. دوو باڵ و لەشە، مەلەکە: کۆمەڵە و بزووتنەوە دوو باڵەکەن. هێڵی پانیش لەشی مەلەکەیە!

مام جەلال کات و شوێنی کۆبوونەوەکانی دیاری دەکرد. ئەجیندای کۆبوونەوە: هەر ئەندامێک پێشنیازی بابەتێکی دەکرد و ئەو خۆی ئیدارەی دانیشتنەکانی دەکرد. زۆرجار پێکەوەش نانمان دەخوارد، یان بۆ پشووی نانخواردن، بەسەر بارەگا نزیکەکاندا دابەش دەبووین!

لەماوەی نێوان ١٩٧٨/١١/١ تا ڕۆژی دوو لەتبوون، نەورۆزی ٧٩ مام جەلال پەلپ و بیانووی زەردو سووری بەدەستەوەبوو، خۆی لەکۆبوونەوەو سازانی نێوان باڵە ناکۆک و نەگلۆک و دژەکانی ی. ن. ک ببوێرێت. کێشەکە ئەوەبوو: دوای لەدەستدانی عەلی عەسکەری، مام جەلال نەیدەتوانی کۆنترۆڵی ڕەسوڵ

مامەند و سەرانی بسک بکات! نەشدەویست ببێتە بەشێک لەچارەسەر. لەسەر هەموو بەرەکانی شەڕی ئایدیۆلۆژی، سیاسی و سەربازی، خۆی کردبووە کەوا سووری بەر لەشکر. بریا ئەو بیتوانیبا لەناو هەموو کێشە و ململانێ و دەستشکانەوە و شەڕی راگەیاندا، برا گەورو و ڕەشماڵی بەرژەوەندی گشتی با!

من بە پێچەوانەی وێنای هەڵەی ناو یەکێتی دەربارەی رەسوڵ مامەند، راستیەکان وەکو خۆی دەنووسم. پاش راپەڕین ئەو هاتەوە ناو ی. ن. ک و نەیتوانی درێژە بە (رێگەی سێیەم) بدات. ئەو کەسێکی سادە و بێئەزموون نەبوو. پێش دووبەرەکی ١٩٦٤ ئەندام ناوچەی قەڵادزە بوو. مام جەلال بڕیاری دەستگیرکردنی بۆ دەردەکات. ئەو بۆ لای بارزانی دەچێت. شەڕ بە کۆنەقین دەکرێت. هەردووکیان یەکتریان باش دەناسی. بە ئاسانی بەشداری کۆبونەوەی نەدەکرد. لەبری خۆی حاجی حاجی برایم و قادر عەزیز و مەلا ناسیح و سەید کاکەی دەنارد. ناچار بوایە خۆی بێت: دەستەیەکی لەخزمانی بەردەشانی و شیلانەیی، ئەمبەرو ئەوبەری شوێنی کۆبوونەوەکەیان دەتەنییەوە.

مام جەلال لەحەوت ئاوی دابوو. بەرامبەر جموجۆڵ و زەمینەسازی و ئامادەکاری وەکو (ناوەندی هێز)، لەناو یەکێتی و بەدووری چەند شەقاوێک، مەنجەڵی حەوتجۆشی زنجیر لەملی دوو لەتبوون لەسەر ئاگربێت، نە چاوی نوقابوو، نە خەوی لێکەوتبوو. چاوەڕوانی هەل و مەرجی لەبارو گونجاو بوو. دەست بوەشێنێت و بیکاتە پۆڕی خوراو. حەملەی پرۆپاگەندەی یەکێتی ئەو سەردەمە، ئەوانی وەکو تاقمێکی بچووکی

سەرلێشێواو وێنا دەکرد. ڕاستیەکەی ئەوەبوو: لەڕووی ژمارە و هێزی پ. م ئەگەر شانیان لەشانی یەکێتی نەدابێ، کەمتر نەبوون*. یەکێتی هیچ هێزێکیشی نەبوویێت، ڕاگەیاندنێکی بەهێزی هەبوو: کێچی دەکردە گا، گایشی دەکردە کێچ! دەیتوانی وێنایەکی جیاواز بەخوێنەر و بیسەری خۆی ببەخشێت.

کەو ئەو کەوەیە بەرامبەر کەو بخوێنێت!

دروشمی سەرەکی مام جەلال لەم قۆناغەدا، بەرامبەر بسک ئەم دوو دروشمە بوو: کە دوو پەندی پێشینانی وڵاتی کۆیەن:

- بۆز بە لەڕێ!
- مست لەدرێشە دەگەڕێتەوە.

هەردوو دروشمەکە بە زەق و زۆپی بۆنی زەبروزەنگی لێوە دەهات. ڕووداوەکانی نەورۆزی ٧٩ ، دەریانخست، پاشماوەی سەرکردایەتی ی. ن. ک داهێنەر نەبوون و لەئاست ڕووداوەکاندا کورتیان هێنا.

ڕەسوڵ مامەند لەناو هێزی پێشمەرگەی خۆیان خۆشەویست و بەڕێز بوو. پیاوێکی سەرڕاست و بێ فرت و فێڵ و ڕاستگۆ بوو. بەدرێژایی چیرۆکی ململانێ و ئاڵەنگاری و بەرەنگاری، نە ترس و خۆڕاگر بوو.. ئەوەی لەلایەن ئەم و ئەوەوە دڵی دەشکێنرا و هەستی بریندار دەکرا، ئامێزی ڕەسوڵ مامەند بۆ پێشوازی و دڵنەوایی کراوەبوو.

هەر هێندەی (بسک) لەپردی ئاشی پشکاوێ ئاودیو بوون. نێوزەنگ بووە شامی شەریف! کۆبوونەوەی (م.س) وەکو ئاشی

---

* زۆربەی هەرێم و کەرتەکانی هێزی پ. م لەپارێزگای سلێمانی یەکێتی بوون. زۆربەی هەرێم و کەرتەکانی هێزی پ. م لەپارێزگای هەولێر بەدەست (بسک)ەوە بوون.

ئـاگری لێهـات. زوو زوو کۆبوونـەوە دەکـراو بڕیـار بـەدوای بڕیاردا دەردەچوو. پێکهاتنی (م. س) و دابەشبوونی پلەو پۆست لەنێوان باڵەکان بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

١. مام جەلال: سکرتێری گشتی ی. ن. ک.

٢. نەوشیروان مستەفا: بە پلە: ئەندامی سەرکردایەتی و ئەندامی ناوەندی کۆمەڵەبوو. بەکردەیی، ئامادەی کۆبوونەوەکانی (م. س) دەبوو. خۆی و مام جەلال بەهاوئاهەنگی کاریان دەکرد و پێش کۆبوونەوە مەنجەڵی دوو قوڵی هەردوولا لەسەر ئاگربوو.

٣. سالار عەزیز: نوێنەری کۆمەڵە لە م. س و ئەندامی ناوەندی کۆمەڵە بوو.

٤. مامۆستا جەعفەر: نوێنەری کۆمەڵە لە م. س و ئەندامی ناوەندی کۆمەڵە.

٥. د. کەمال خۆشناو: نوێنەری هێڵی پان.

٦. د. فوئاد مەعسووم: نوێنەری هێڵی پان.

٧. عومەر عەبدوڵڵا: ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵە و یەکێتی و لێپرسراوی مەکتەبی عەسکەری(لەهەموو کۆبوونەوەکانی م. س ئامادە دەبوو).

دوو ئەندامی (م.س) جێگەکەیان هێشتا بەتاڵ بوو (عەلی عەسکەری و رەسوڵ مامەند). عومەر دەبابە ماڵی لە لەندەن بوو. تاقە ئەندامی سەرکردایەتی بزووتنەوە بوو، کە لەگەڵ رەسوڵ مامەند نەڕۆیشتبوو. ئەو بە تەمەنترین سەرکردەی یەکێتی بوو (٥٥ ساڵ)، بە ڕوواڵەت زۆر گەورەتر خۆی دەنواند. دەیگوت: دڵم تەواو نییە. ئەو ناوناوە دەگەڕایەوە و ئامادەی

کۆبوونەوەکان دەبوو. مام جەلال زوو زوو کارێکی لە شام و لەندەن و بەرلین بۆ دەدۆزیەوە و رەوانەی ئەوێندەرێی دەکردەوە. عومەر شێخ موس و ئەگنێتا خانی خێزانی بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لەخڕی نێوەزەنگ و تووژەڵە دەمانەوە. عومەر شێخ موس لەهەموو سەرکردەکانی یەکێتی خوێندەوارترو روونـاکبیرتر بوو. شێوەی بیرکردنەوەیشی راتسیۆنال(عەقلانی) بوو. دەوری هێورکەرەوەی لەگرژەییەکاندا دەبینی. سالی ١٩٨٠ ـ ١٩٨١ بۆ ماوەی ساڵێک و سێ مانگ مام جەلال لەدەرەوە بوو. عومەر شێخموس لەکۆبوونەوەکاندا دەوری سکرێتری دەبینی و زۆر بەجوانی ئیدارەی گرژی و ناکۆکیەکانی دەدا.

ئەگنێتا، کە تۆزێک لەمەوپێش هەواڵی کۆچی دوایی ئەوم بیست (٢٠١٩/١١/٢٠) ژنێکی زۆر سەلارو هێمن و ئازابوو. رۆژێکیان فڕۆکەیەکی جەنگی ئەو ناوەی دەکێلا، خەڵک لەپەنا بەرد و کونە تەیارە خۆیان دەپاراست. ئەو چووبووە سەر بەرزاییەک. عومەر شێخموس بانگی کردبوو، دابەزێتە خوارەوە. ئەو بەقسەی نەکردبوو. لەسەر دابەزە و دانابەزم خەریک بوو قڕە قڕ دروست بێت. زۆرجار سەردانی دەکردین و من لەمەوە فێری ژینگەپارێزی بووم. خاکەنازێکی بەدەستەوە دەگرت و چاڵێکی هەڵدەکەند و هەرچی قووتووی بەرچاو بکەوتایە دەیخستە چاڵێکەوەو دایدەپۆشت دەیگووت: ئەم هەموو قوتووە دیمەنی ئەم وڵاتەمان ناشیرن دەکەن!

مام جەلال هەستی دەکرد: کۆمەڵە بەهێزەو هێڵی پان بە تەنیا پارسەنگ دروست ناکات، بزووتنەوەش لەوبەر چەمە. خۆی کۆمەڵەی دروستکردبوو، کەچی کۆمەڵەی بەهی خۆی نەدەزانی،

به بەردەوامی هەوڵی لەقاڵبدان و بچووککردنەوەی دەدا و چاوی لەسەر هەڵەی سەرکردەکانی بوو. چاوی لێبز دەکردنەوە، وەکو گیسکەکەی هەیاسی خاسی لێکردبوون. پێگە و ژمارە و هێزی هێڵی پانیش ئەوە نەبوو! جەمال ئاغا هاتە دەرەوە. لە زرگوێزەوە پلەی ئەندامی (م. س) پێشکەشکرا. مام جەلال پێیگوتم: ((جەمال ئاغا پیاوێکە وەزعەکە دەگۆڕێت. کۆمەڵە ڕێکخراوێکە ژمارەیەکی زۆر کەم لە مارکسی و ڕووناکبیرە چەپەکانی لەخۆی کۆکردۆتەوە. جەمال ئاغا نوێنەری جەماوەری فراوانی زەحمەتکێش و خەباتگێڕی کوردستانە و دەتوانێت هەزاران هەزار کەس لەخۆی کۆبکاتەوە)).

منیش گوتم: ((ئەگەر ئاغایەک بتوانێت هەموو جەماوەری زەحمەتکێش بەم شێوەیە کۆبکاتەوە. ئەی من و تۆ کارمان لێرە چییە؟ هەقە جێگەیەک بۆ خۆمان بدۆزینەوە بۆ ئەوێ بڕۆین!))).

مام جەلال لەقاقای پێکەنینی دا. ئەو خۆیشی دەیزانی جەمال ئاغا پیاوێکی نوکتەبازەو دەتوانێت سەربردەی کۆمەڵایەتی بگێڕێتەوە. هەڵسانەوەی جەماوەر بۆ حزبە سیاسییەکان ئاسان نەبوو، چجای تاکە کەسێک، کە دەوری بەرچاوی لە ڕووداوە سیاسییە چارەنووسسازەکاندا نەبووبێت.

١٩٧٩/٣/٢٢ کۆبوونەوەیەکی فراوان کراو بڕیاردرا: چەند مەکتەبێک دروست بکرێت و لێپرسراویشیان بۆ دانرا:

١. سالار عەزیز ← مەکتەبی ڕێکخستن.
٢. مامۆستا جەعفەر ← مەکتەبی ڕاگەیاندن.
٣. د. کەمال خۆشناو ← مەکتەبی دارایی و ئیدارە.
٤. عومەر عەبدوڵڵا ← مەکتەبی عەسکەری.
٥. د. فوئاد مەعسوم ← پەیوەندییەکانی ئێران.

راستە ئەم مەکتەبانە وەکو مەکتەبەکانی ئەمڕۆ نەبوون، بەڵام هیچیان نێویان (دەزگا) نەبوو. یەکێک بە ئارەزووی خۆی پاژێکی بە مەکتەب داناوە (مەکتەبی عەسکەری، مەکتەبی ڕێکخستن) بەڵام ڕاگەیاندنی بە دەزگا داناوە. گوتم: کاکە بۆ نووسیوتە (دەزگای ڕاگەیاندن) گوتی: چونکە ئەوکاتە دەزگا بوو پاشتر ١٩٨٤ ناوەکەیان بە (مەکتەبی ڕاگەیاندن) گۆڕی. گوتم: ئەو ڕستەیە بگۆڕیت ڕاستترە، چونکە ئەوکاتەش هەر نێوەکەی مەکتەبی ڕاگەیاندن بووە. گوتم: لەگرتەیەکی ڤیدیۆیی کەناڵێکی تەلەفزیۆنی فەرەنسیدا ١٩٨٠/٧/٧ من دەڵێم: (من ناوم.. لێپرسراوی مەکتەبی ڕاگەیاندنی ی. ن. ک)، گوتی: ڕاستە، بەڵام مەکتەبێکی زۆر بچووک بوو!

ئەوە ڕاستە سەرەتا مەکتەبی ڕاگەیاندن لەناو چادرێکی بچووکدا جێگەی دەبووە، بە مەنجەڵێک یاپراخ تێریان دەخوارد و نیوەیش دەمایەوە. مەکتەبی عەسکەریش لەبن دار گوێزێک دا بوو. بەڵام ناو پەیوەندی بە گەورەیی و بچووکییەوە نییە. ئەوەی ڕاستی بێت، من ئەو کەسە بەهاوڕێیەکی بەڕێز دادەنێم و جەختکردنەوە لەسەر وردەکاری، ڕاستگۆیی ئەو لای من بەدەم زریان و ڕەشەباوە نادات، بەڵام من پێمباشە بەگوێرەی توانا هەوڵبدەین بابەتی بین، نەک جڵەوی سۆزو ئایدیۆلۆژیا لەسەر حیسابی کاڵکردنەوەی ڕاستیەکان شل بکەینەوە.

# دامەزراندنی ئێزگە

## (٣)

ڕۆژی ١٩٧٩/٣/١٩ ئێزگـە دامـەزرێنرا و بـۆ مـاوەی (١١) ڕۆژ پەخشکردن بۆ تاقیکردنەوەو کاری هونەری و تەکنیکی بوو.

لـەنێوان ١٩٧٩/٣/١٩ تـا ١٩٧٩/٤/١ ئێزگەکـە نـاوی (دەنگـی یـەکێتیی نیشـتمانیی کوردسـتان)بوو. ئێزگەکـە لـە بەرزاییـەکانی نۆکـان دانرابـوو. سـروودەکانی کۆمەڵـە و سـروودی نیشـتمانیی بڵاوکردەوە.

ڕۆژی ١٩٧٩/٤/١ بڕیـاردرا نـاوی ئێزگەکـە بگۆڕدرێـت بـۆ (دەنگی شۆڕشـی عێراق). هەردووجارەکە بـەدەنگی پشـکۆ ناکام ناوەکە خوێنرایەوە: (ئێرە دەنگی شۆڕشی عێراقە). بۆ کردنـەوەی فـەرمی ئێزگەکـە مـام جـەلال پـەیامێکی بـەدەنگی خـۆی تۆمـار کردبـوو، کـە ماوەکـەی (١٨) دەقیقەیـە، پەخشـکرا. زۆرجـار نووسینی خۆی بۆ ناردووین. بەڵام یەکەمین جار بەدەنگی خۆی پەیامەکـە تۆمـارکرابوو. نـاوگۆڕکێ پەیوەنـدی بـەداوای (التجمع الوطني العراقي)وە بوو. یەکێتی ئەندامی (تجمع) بوو، نەیدەتوانی لـەوێ ئەنـدام بێـت و نـاوی ئێزگەکـە نـەگۆڕێت و دروشـمی ڕووخانـدنی ڕژێـم بـەرز نەکاتـەوە. پەیامەکـە ئـەوەبوو، کـە شۆڕشـەکە لەکوردسـتان هەڵگیرسـاوەو بـەرەو خـوارووی عیراق تەشەنە دەسێنێت. ئەندازیار(تەلعەت گلی) ئێزگەکەی خستەگەڕ و (ئەبو شەهاب) ئەرکی کاری تەکنیکی لەئەستۆ گرت. تەڵعەت گلی ئەنـدازیارێکی کـەرکوکیی نیشـتمانپەروەرە. ئەوکاتـە لـەکوەیت

کـــاری دەکـــرد. قوربانیـــەکی زۆری دا و خـــۆی تووشـــی سەرئیشەیەکی گەورە کرد و ناچاربوو جارێکی دی بۆ کوەیت نەگەڕێتەوە.

دەستەی بەڕێوەبەریتی زۆر سادە بوو:

١. مامۆستا جەعفەر ⟵ نووسەری سەروتار و لێپرسراوی ئێزگە.

٢. پشکۆی سەعید ناکام ⟵ بێـــژەری ســـەرەکی، نووسـەری بەرنامـەی کـالا بـە قـەد بـالا، داڕێژەری دەنگوبـاس و چالاکیی هێزی پێشمەرگە.

٣. فەرید ئەسەسەرد ⟵ نووسەر بەکوردی و عەرەبی.

٤. م. موحسین عەلی ئەکبەر ⟵ لێپرسـراوی کاروبـاری ئیداری و گوتاری بۆ ئێزگە دەنووسی

٥. دڵگیر جەمال رفعەت ⟵ بێژەر.

ماوەی بەرنامەکە تەنیا یەک سەعات بوو ٦ـ ٧ پاش نیوەڕۆ.

# چادرێکی بچووک و
# دەنگدانەوەیەکی گەورە
# (٤)

چادرێکی بچووکمان هەبوو، لەسەر چۆمی نۆکان هەڵماندا. تەسجیلێکمان لە ئەحمەد ساروخ کڕی. بەیانی پێش نیوەڕۆ من سەروتارم رادەستی پشکۆ دەکرد. ڕۆژی وا هەبوو ناچاربووم، سێ گوتار بنووسم. هاوڕێ کاوە یار ئەحمەد پێیگوتم: ((تۆ ئەوەندە دەنووسیت دەترسم ڕۆژێک هیچت پێ نەمێنێت. کانیش ئەوەندە ئاوی لێهەڵگۆزیت وشک دەکات!)) ماوەی یەک دوو سەعات ئەو دەینەڕاند و ئێمەیش قڕوقپ دادەنیشتین. تا تۆمارکردن تەواو دەبوو. ئیتر ئەو خۆی مۆسیقاو سروودی هەڵدەبژارد:

١. ئێرە دەنگی شۆڕشی عیراقە
٢. چەند ئایەتێکی قورئان
٣. سەروتار
٤. دەنگ وباس و چالاکی پ. م.
٥. کاڵا بە قەد باڵا.

ڕۆژێکیان لە ریکۆردێکی ترەوە پشکۆ سورەتێکی قورئانی خستبووە سەرو دەیویست پاش سێ دەقیقە مەلا بڵێت (صدق الله العظیم) سێ دەقیقە بووە چوار و مەلا ئایەتی تری دەخوێند. پەنجەم بە ریکۆردەکەدا ناو گوتم: (صدق الله العظیم) هەموو کەس هەستی پێکردبوو، دەنگی یەکەم مەلایەک بوو، دووەم، کە (صدق الله العظیم)ی خوێندەوە کەسێکی تر بوو!

مانگی ئازار لەو کوێستانە ساردە. ئێمە زۆپایەکمان هەبوو. چا لێنان و هێلکەو ڕۆن وتەماتە سوورکردنەوە لەسەر زۆپاکەبوو. قاپێکی فافۆنی رەش و قۆریەک و پێنج کوپی چینکۆی سەوز و سێ چوار کەوچک و چەقۆمان هەبوو.

بەیانیان قۆریمان دەخستە سەر زۆپاو چامان لێدەنا و نانیشمان لەسەر زۆپا شکاوەکە گەرم دەکردەوە و خۆمان بە پاشا دەزانی. نیوەڕوان هێلکە و رۆن، خورما و رۆن، گۆشتی قوتومان گەرم دەکردەوە.کاتی چێشت لێنان و سفرە رازاندنەوەمان نەبوو. رۆژانە نزیکەی (١٥) سەعات کارمان دەکرد. دەبوایە بە بەردەوامی گوێ لەزۆربەی رادیۆ جیهانییە گرنگەکان بگرین:

١. مۆنتیکارلۆ
٢. BBC
٣. تاران
٤. بەغدا
٥. قاهیرە
٦.

دەبوایە خۆمان نامەی فەرماندەی هەرێم و فەرماندەی کەرت و پێشمەرگەکان بخوێنینەوە. هەواڵەکان هەڵبژێرین و مشت وماڵیان بکەین. دەبوایە بە شێوەیەک بێت، پێشمەرگەکان هەست بە شانازی بکەن و ورەی جەماوەر بەرز بێتەوەو خۆیان بە قوڕگی شێردا بکەن!

رۆژێکیان رەعەد بەشیر ئەسکەندەر بەعەرەبی پرسیاری لێکردم

(( أستاذ جعفر خاطر الله متكلى ال (پياو خراپ) شلون أترجمهه؟

أذا جاش ←—— أكتب = مرتزق.

أذا بەكرێگیراو ←—— أكتب= عميل أو جاسوس.

بس اذا (پياو خراپ)= رجل غير جيد ←—— رجل مو زين ←—— رجل غير صالح

منيش گوتم: ((ال (پياو خراپ) عادة عملاء، جواسيس، خونة..)).

ئەو گوتی: ((خلى يكتبون (بەكرێگیراو) أو (جاش) أو (عضو في الاستخبارات)...)). دەستى كردە پێكەنین((والله مكتوب پياو خراپێكمان گرت و بەسزای گەلمان گەیاند.. هذا معناه/ تم القاء القبض على شخص غير جيد وتم إعدامه.. تعال فهم حجى أحمد أغا!).

# غاندی پەیكەری بۆ ناتاشرێت

## (٥)

چیرۆكی (غاندی پەیكەری بۆناتاشرێت)، پاش بیست ساڵ لە شەهیدكردنی كاكم(مەجید كەریم ئەحمەد) نووسراوە. ماوەی بیست ساڵ زمانی قەڵەم لەئاست یادەوەریەكانی ئەودا لاڵ بوو. ئەو شەهیدانەی لەنزیكەوە ناسیومن، لەكاتی نان خواردن و پیاسەی رۆخی دەریا و كاركردنیشدا هەر لەبیرمن. ئەی شەهیدان من لەسەر ئەم زەمینەش نەبم، ئێوەم هەر لەبیرە. لەیادی چل ساڵەی شەهیدبوونی غاندی، هەست دەكەم خۆشم لەدوا رۆژەكانی ژیان نزیك دەكەومەوە! بڕیارم دا ئەم پاژەش لەبیرەوەریەكان بنووسم، هیچ نەبێت بۆ تێگەیشتنی چیرۆكی (غاندی پەیكەری بۆ ناتاشرێت)، چونكە دڵنیام نە ئەم نەوەیە و نە نەوەی داهاتووش، لەناو جەنجاڵی مەكینەی پرۆپاگەندە و چەواشەكاریدا، زەحمەتە بە ئاسانی رەش و سپیان بۆ لەیەك جیابكرێتەوە!

لە ئێران هاتمەوە، پتر لەدوو مانگ دابڕابووم و ئاگام لە دەنگوباسی كەس و كار نەمابوو. مامۆستا موحسین پێش هاتنەوەم گەیشتبوو. بە فەرمانی دەستگیركردنی خۆی زانیبوو. باڵی لەخۆی رووانبوو، دابوویە شەقەی باڵ. چەند هەفتەیەك ماڵی كاكم(محەمەد)* دەرگای ماڵەكەیان بۆ دەخەنە سەرپشت.

---

* محەمەد كەریم ئەحمەدی جەباری: (١٩٤٢ــ ٢٠١١)كوردیزان و عەرەبیزان و ئینگلیزیەكەیشی زۆر باش بوو. چەند كتێبێكی لەسەر

هـەواڵی غانـدیم لـێ پرسـی. ئـەم هـەواڵی گرتنـی ئـەوی دامـێ. خورپەیـەکی ئـەتۆمی بەدڵمـدا هـات. یەکسـەر زانیم جارێکی تـر یـەکتر نابینینـەوە. ئـەو مامۆسـتا و بـرای گـەورەو بەرویێنـە و کۆڵەکەی خێزانەکەمان بوو. پێنج ساڵ لە محەمەد منداڵتر و پێنج ساڵ لەمن گەورەتر بوو. ئەو لەڕووی بیروهۆش و زیرەکییەوە پێش سـەردەمەکەی خـۆی کـەوتبوو. ئـەو بـە پێچەوانـەی مـن، قسەزان، زمانپاراو، قسە سوار، ڕەوانبێژو گوێگرێکی باش بوو. لەنووسـین و ئاخاوتنـدا بەرامبەرەکـەی تووشـی فروسـمان و سەرسوورمان دەکرد

رژێمی بەعس دەیزانی چۆن قوربانیەکانی گوڵبژێر دەکات!

ئەوە چینی سیاسی چاوکونەشوژنی، چەواشـەکراوی کوردە، کـە گیـانی بەرپرسـیاریەتی بـە کـەلاوەبوویان، بایـەقوش تێیـدا دەخوێنێت. بە بێژنگێکی شەق و شڕەوە، گەنم و سـەرکۆزەرەیان پێ لەیەک جیا ناکرێتەوە!

ئەو لەتەمـەنی (٣١) سـاڵیدا ماڵئاوایی لـەژیان کرد و لـەبیابانی نـەزۆکی سیاسـەتی هـەلکڕووزاوی پـڕ لـە چەقـەڵ و دەڵـەک و مارمێلکە و قەلەڕەش جێیهێشتین.

پاش هەڵگیرسـانی ئاگری شـەڕی براکوژی (١٩٦٤) ئـەمیش وەکـو سـەدان پ. م و کـادری سیاسـی و سـەربازی دوای گـەردەلوولی(حزب) کـەوت و ملـی کـوێرە ڕێگـای پـڕ نـەهاتی هەمـەدانی گـرت. سـەرکردەکانی ئـەو بزاڤـە، هەڵـەیان بەهەڵـەی

---

کوردستان بۆ عەرەبی و کوردی وەرگێڕاوەو بڵاوی نەکردونەتـەوە. باوکی عومەر ود. عەلی جەباری و د. دیار جەباری و دکتۆر نازو مامۆستا سۆز جەباری.

گەورەتر چارەسەر کرد. ئەم لام تات، ئەولام تات! دووبەرداش کەللەسەری دەیان کەسی بێتاوانی هاڕی. ڕووداوەکان هەر چۆنێک بووبن ئاستی سیاسی و فیکریی سەرکردەکان، بەزەقی دەردەخەن. مرۆڤی سیاسی نابێ لەپێناوی بەرژەوەندی و دەسەڵاتی خۆی ملی هەزاران خەڵک بەشکاندن بدات.

من وێرای خزمان سنوورم بەزاند و چاوم بە غاندی کەوتەوە. بێزاربوو لە سیاسەتی: سووتاندنی ئەقڵ و لۆژیک: پێشمەرگە سەنگەر لە پێشمەرگە بگرێت: ((دوێنێ براو هاوسەنگەر بووین، ئەمڕۆ قەراوڵمان لەیەکتر گرتووە. تەپڵی سەری براکەت کرۆدتە نیشانە. هیوای گەورەمان سەرکەوتنی ئەم شۆڕشە بوو، قوربانی زۆرمان بۆدا، ئەمیش بووە پارووی ڕەشەبای نەزانی و دەسەڵاتخوازی. ئێمە گەلێکین مەترسی لەناچوون هەڕەشە لەئێستا و داهاتوومان دەکات. هەمووشمان پێکەوە بین، ڕەنگە نەتوانین، بەئاسانی تارمایی تواندنەوەو داگیرکاری لەخۆمان دوور بخەینەوە. سەرکەوتن خەونی هەموو کوردێکی دڵسۆزە، بەیەکیشەوە بەدیهێنانی خەونەکانمان زەحمەتە، چجای بە پەرتەوازەیی و پەڕاگەندەیی و لەت و پەتی بەرامبەر بە ڕژێم بچینە شەڕگەوە.

سێ ساڵ گاڵەمان بە ڕژێم کرد. قۆناخێکی تر بەردەوام بوینایە، ڕژێممان ناچاری پاشەکشە و ملکەچکردن دەکرد. لەمەودوا گونەر گونەری براکوژی و خۆکوژی و وێرانکردنیماڵی خۆمانە. لوولەی تفەنگی براکان ئاراستەی نەوچاوانی یەکتر کراوە.

رژێم لەدوورەوە، بەدووربین سەیرمان دەکات و پێمان پێدەکەنێت و لەئێستاوە پێکی شەرابی سەرکەوتن هەڵدەدات.

دەنگی دەهۆڵ لەدوورەوە خۆشە. ناوی گەورەو دێی وێران.

سەرکردە ئەو کەسەیە، سەرکەوتوو بوو، تاجی سەرکەوتن رادەستی یادی شەهیدەکان بکات. سەرکەوتوو نەبوو، لەگۆشەیەکی پڕ سەرەوەری و سەربەرزی دابنیشێت و دەست بەکڵاوەکەی خۆیەوە بگرێت. ئەمانە سواری کەرێک بوون، تا نەیتۆپێنن دانابەزن...))!

لە وارمیوان نامەیەکی غاندیم پێگەیشت. رەخنەی توندی لەناوەڕۆکی هەواڵنامەی ژمارە (١) گرتبوو. ئەو ماران گەستە بوو. لەبری پەتی رەش و سپی، ماری کولەوەیبایی بینیبوو. پێشەکیی هەواڵنامەی ژمارە (١)ی بە لێدانی دەهۆڵی شەڕی بێ کۆتایی دانابوو. رستەیەک سەرنجی راکێشام:

(دەزانیت بۆ مام جەلال نەوشیروانی هێناوەتەوە؟ دەیەوێت بەسەر کۆمەڵەدا بیسەپێنێت و کۆمەڵەی پێ دەستەمۆ بکات..).

لەکۆتاییدا ئەوەی نوسیبوو: (بەم زووانە دەگەمە لاتان!).

من بڕیارەکەم بەدڵ نەبوو. لەکۆتایی نامەکەمدا ئەم رستەیەم بۆ نووسیبوو: (ئەگەر دەزانیت مەترسی گرتن و راوەدوونانت لەسەر نییە، لەهاتنە دەرەوە پەلە مەکە). لەپڕ تێبینییەک سەرنجی بۆ لای خۆی راکێشام: ئەوکاتە بەراوردی نووسینی نامەکە و خەتی سەرنامەکەم کرد. دوو نووسینی جیاوازبوون: کەسی سێیەم نامەکەی پچڕاندووەو نامەکەی خوێندۆتەوە. گومانێکم لا دروست بوو. دەبێ کێ ئەم کارەی کردبێت؟ دەی هیچ نییە! لەمەشیاندا هەر بێدەنگیم هەڵبژارد!

غانـدی هـاوینی ۱۹۷۸ بـۆ مـاوەی یـەک مانـگ لـە ڤیننـا دەمێنێتەوە. میوانی مولازم سەردار حەسەن وەیسی بەگی دەلۆ دەبێت، کە هاوڕێی دێرینی یەکتری بوون.

سەردار ئامۆزایەکی هەبوو، کە مێردی گێلاس خانی خوشکی بـوو، نـاوی (یوسـف مەجیـد دەلـۆ) بـوو. کـادری پێشـکەوتووی پارتی کۆمۆنیست* و ماوەیەک بەڕێوەبـەری ناحیـەی کۆکز بـوو. رژێم فەرمانی گرتنی لەسەر گزی و دەستکاری دارایی دەوڵـەت بـۆ دەرکردبـوو. سـاڵی ۱۹۷٦ بـۆ ڤییەنـا هـەڵاتبوو. لەوانەشـە موخابەرات ئەوی کردبێتـە دەستکەلاو ئەم شانۆگەریەی نمایش کردبێت بۆ خۆڵکردنە چاوی خەڵک.

هەڤاڵانی یەکێتی لە ڤییەنا گومان لە (یوسف مەجید) دەکەن و هەسـتیان بـەوە کـردووە، ئـەم کابرایـە بەدزیـەوە هـاتوچۆی باڵوێزخانەی عێراق دەکات و لەئەپارتمانەکەی سـەرداردا دەژێت. فـارس بـاوە، ئەوکاتـە بـە بـەردەوامی هـاتوچۆی باڵوێزخانـەی عیراقی کردووە لە ڤیننا، بە بەردەوامی چاوی بـە یوسـف مەجید کەوتووە، هـەرچی زانیـاری دەسـتدەکەوێت لەرێگەی تەلـەفۆن و

---

* سـاڵی ۱۹۸۰ مـەحموود سـەنگاوی و دەسـتەکەی لەسـەر رێگـەی کـەلار ـ دەربەنـدیخان بۆسـەیەک دەنێنـەوە، یوسـف مەجیـد تێدەکـەوێت. سـەنگاوی دەبینێ کابرا وەکو بێ ناو ئاو دەلەرزێت. بۆ گوندێک دەیبات. هێزێکی پارتی کۆمۆنیست، نزیکەی (٤٠) پ. م جەخت لەسـەر ئـەوە دەکەنـەوە، ئەم کابرایە ئەندامی پارتی کۆمۆنیستە. ئەوان دەبنە کەفیلی و دەربازی دەکەن. محەمـەد یاوەر و مەلا برایم پاش نیو سـەعات دەگەنـە لای سـەنگاوی و زۆر خەفـەت بۆ دەرچـوونی یوسـف دەخۆن و بەهـەر چوارلادا دوای دەکـەون دەسـتیان ناکەوێت.

تەلەفۆنکاری سەردارەوە، بۆ رۆژی دواتر زانیاریەکان دەدرێتە باڵویزخانەی عیراق لە ڤیننا. سەردار سادەترین پارێزگاری لە نهێنی و پەیوەندیەکانی خۆی نەکردووە. یوسفیش ئەو خیانەتکارە ریسوایە بووە، کە خیانەتی لە ئامۆزا و خێزان و کەس و کاری خۆی کردووە... چەند جارێک ئاگادری سەردار دەکەنەوە، کە ئەم یوسفە، کە لەسەر (قومار، خواردنەوە، قەحپەبازی)* مودمن بوو، لەگەڵ باڵویزخانەی عێراقدا دەستی تێکەڵاو کردووە! سەردار سەرەتا زۆر داکۆکی لێدەکات. دەڵێت: یوسف ئامۆزامە و زاوامە و خیانەت لەکورد ناکات، چونکە دەزانێت ئەگەر پێی خوار دابنێت، بەدەستی خۆم دەیکوژم..

سەردار شوباتی ١٩٨٢ سەرجەمی بەسەرهاتەکەی لەگۆشەنیگای خۆیەوە بۆ گێرامەوە: ((لەگەڵ یوسف تووشی قرەقرِ هاتم، خراپ لێمدا. ئەمە پاش گەڕانەوەی غاندی بۆ سلێمانی بوو. ئەو یەکسەر خۆی رادەستی باڵوێزخانە دەکات. وەکو خیانەتکارێک دەچێتە بەردەستیان و هەرچی زانیوە بۆی هەڵڕشتوون..)).

من قسەی هەڤاڵانی ئەوسای یەکێتی لە ڤیەنا بەهەند وەردەگرم. نەدەبوو غاندی سەردانی ڤیەنا بکات. کردی، لەوێ داوای پەنابەریتی بکردایە و مانەوەی هەڵبژاردایە. دیارە شەپۆلی

---

* دەوروبەری ساڵی ١٩٧٥ یەکێک لە خزمە هەرە نزیکەکانی سەردار بۆی گێرامەوە: گێلاس خان، کە ژنێکی سەربەرزو بەڕێز بوو، تێبینی ئەوە دەکات مێردەکەی، باوکی منالەکانی سەرخۆشە و بەگیرفانی بەتاڵ بۆ ماڵەوە دەگەڕێتەوە. ئەویش بەرامبەری دەوەستێت و لە ماڵەکە دەری دەکات و دەگەنە رۆخی جیابوونەوە..

سۆز، بەسەر عەقڵ و شیکردنەوەی لۆژیکییدا زاڵبووە. بەرپرسیارێتی سەرداریش* کەم نییەو هەڵەی قورسی کردووە.

یوسف مەجید دەڵێ بە باڵوێزخانەی عێراقی گووتوە: ((لێبووردنم بۆ دەربکەن، من ئامادەم تۆڕێکی رێکخستنی یەکێتیتان بۆ ئاشکرا بکەم. ئەمانە لەرێگەی سەردارەوە پەیوەندیان بە شۆڕشەوە هەیە)).

غاندی ئەوکاتە مامۆستای زمانی ئینگلیزی لە ئامادەیی کاژاو ـ سلێمانی بوو. یوسف مەجید بۆ بەغدا دەگەڕێتەوە، بەگوێرەی پلان و رێنمایی و ئاراستەکردنی (الامن العامة)** کاردەکات. یوسف*** پەیوەندی پێوە دەکات و دەڵێت: دەمەوێت بتبینم.

---

* سەردار، لەسوپای عیراق ئەفسەر بوو. ساڵی ١٩٧٤ جێگری فەرماندەی بەتالیۆن و پاشان فەرماندەی بەتالیۆن لە (هێزی رزگاری) بوو بە برینداری رەوانەی ڤییەنا دەکرێت. ساڵی ١٩٧٥ پەیوەندی بە (ی. ن. ک)ەوە کردووە. لێپرسراوی عەسکەری دەستەیەک پ. م دەبێت لەگەڵ نەوشیروان مستەفا ئەمین و پێکەوە بۆ بادینان دەگەڕێنەوە. ناتوانن زۆر بمێننەوەو بە سەرنەکەوتوویی دەگەڕێنەوە.

** رژێمی بەعس وەکو هەر رژێمێکی فاشی دەیان دەزگای هەواڵگری جیاجیای هەبوو. من نەمتوانیوە زانیاری پێویست لەسەر رووداوەکە، بەڵگەی رەسمی ئەوسا وەدەست بهێنم. ناشزانم کام دەزگا سەرپەرشتی گرتن و لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کردووە.

*** رۆژێکیان ساڵی ١٩٧٣ سەردار، غاندی، محەمەد یاوەر، من پێکەوە لە چایخانەی حەسەن شەل ـ خانەقی ـ دانیشتبووین. یوسف مەجید پەیدابوو. خۆی وا پیشاندا، کە لەگەڵ د. موکەرەم تاڵەبانی و عامر عەبدوڵلا، ئەویش پاڵێوراوە بۆ پۆستی وەزیری. ئەم کەسە دواتر بە بەرێوەبەری ناحیەی کۆکز قایل کرا. ئیدی ئەوە نازانم نوێنەری موخابەرات یان پارتی کۆمۆنیست بوو؟

راستیەکی تاڵ هەیە ناچارم بینووسم. لەکاتی زیندانی و ئازار و ئەشکەنجەدا، سەری بەتوندی بەردەکەوێت. ئەوانەی بینیویانە شایەتی ئەوە دەدەن، غاندی پێش و پاش زیندان دوو کەسایەتی زۆر جیاواز بووە. نە توانای قسەکردنی ماوە و نە توانای بیرکردنەوەی ماوە و ئاگای لەخۆی نەبووە... تاد. ئیدی بەزمانی ئەوەوە چی نووسراوە و چی نەنووسراوە، ئەوە جەلادەکانی ئەو سەردەمە هەزاران کاری ساختەیان دارشتووە. من خۆم هیچ مەلەفێکم نەبینیوە و دوای وەدەستهێنانی زانیارییەکان نەکەوتووم.

# درامای گرتن

## (٦)

لە ئەنجامی خیانەت و خۆفرۆشی و کەسایەتی لەرزۆک و ناجێگیرو سووک و بەتاڵی یوسف مەجید دەلۆ لەلایەک، کەمتەرخەمی و گوێنەگرتنی سەردار لەدۆست و کەسانی دڵسۆز لەلایەکی ترەوە، کە چەندین کەس تکایان لێکردووە، ئەم گومانلێکراوە لەماڵەکەی دەربکات، ئەو گوێی لە کەس نەگرتووە. هەرچی نامە و کاغەزو شتی نهێنی خۆی هەیە، لەسەر مێزەکەی بووە. یوسف حسێن (ئاری) کە یەکێک بووە لە کادرە پێشکەووتوەکانی کۆمەڵە، لە زیندان بۆ ئەسەد حسێنی برای گێڕاوەتەوە: ((سەردار داوای لەسیروانی برای کردووە، بڕوانامەیەکی بۆ وەربگرێت و رەوانەی ڤییەنای بکات. یونس عەلی حسێن فەیلی، کە دەرچووی ئادابی بەغدا، بەشی ئینگلیزی بووە، بڕوانامەکەی وەرگێڕاوە. یوسف مەجید دەلۆ، نامەکەی سیروان و بڕونامەکە بۆ باڵوێزخانەی عێراق دەبات..)).

سیروانی برای سەردار یەکەمین کەس بووە، کە لە ڕۆژی ١٩٧٩/١/٢٠ گیراوە. دوای ئەو یونس فەیلی گیراوە. سێیەم کەس غاندی گیراوە. چوارەم کەس یوسف حسێن لەڕۆژی ١٩٧٩/١/٢٣ گیراوە. هەموویان لەماوەی ٤ ـ ٥ ڕۆژدا گیراون. ڕۆژی ١٩٧٩/٧/٤ هەر چواریان پێکەوە ئیعدام کران:

١. مەجید کەریم ئەحمەد ـ خانەقی ـ ١٩٤٧.
٢. یوسف حسێن ـ خانەقی ـ ١٩٥٣.
٣. سیروان حەسەن ـ کفری ـ ١٩٥٣.

٤. یونس عەلی حسێن فەیلی*:

سیروان ئەوەی بۆ دایک و خوشکەکانی گێڕاوتەوە: چەند ئازار دراوە یەک وشەی نەدرکاندووە. یوسف مەجیدیان بەرامبەری داناوە. پرسیاری لێکردووە: تۆ بڵاوکراوەت پیشانم نەداوە؟ نامەت بۆ نەناردووم؟ تلیفۆنت بۆ من و سەردار لەڤییەنا نەکردو دەنگوباسی شۆڕشت پێ ڕانەگەیاندین؟

ئای خودایە! چەندە ناخۆشە تۆ کۆستت بکەوێت، یان ماڵت بسووتێت و هاوڕێ و کەسە نزیکەکانت قسەی بێتام، ساردوسڕ، بێسەروبەر و بەرزونزم بکەن. تۆ، کە ناتوانیت برینەکانم سارێژ بکەیت، ناتوانیت ئاگری ماڵەکەم بکوژێنیتەوە، بۆ برینەکانم دەهێنیتە سوێ؟ ئەمە بەڵگەی ریسوایی، بێ حورمەتی و نارەسەنایەتی ئەو کەسانەیە، لەبری ئەوەی میز بە رابووردووی پڕ شەرمەزاری خۆیاندا بکەن، هەوڵدەدەن سووکایەتی بە یادو شکۆی شەهیدەکانەوە بکەن. ناو زڕاندنی شەهیدەکان، تاوانێکی مەزنە و بەر لێبوردن ناکەوێت!

کەسێک لەرووی سیاسی و ئەخلاقییەوە خۆی نەدۆڕاندبێت، ریسوای زەمانە نەبێت، دەست بۆ پیرۆزی خەڵک نابات. کەسانی بوودەڵە و سووک و چرووک هەن، لاپەڕە رەشەکانی ژیان و بەسەرهاتیان، لێوانلێوە، لە هەڵوێستی ناجوامێری و قێزەونی و شەرمەزاری. پێیانوایە: ئەگەر سووکایەتیان بە یادی شەهیدەکانەوە کرد، ئیدی بەرز دەبنەوە، نێویان وەکو ((پاڵەوانی گەل)) و ((ئەفسانەی نەتەوەیی)) لەدەروازە فراوانەکانی مێژوودا تۆمار دەکرێت.

---

* یونس عەلی حسێن فەیلی: لە قونسوڵیەی نەمسا لە بەغدا کارمەند بووە.

# گومان و تارمایی

## (٧)

یەکەم هێدمە تۆزێک بەریدام، کەوتمە گەڕان بەدوای سەرەداوێکدا، بمگەیێنێتە بەر دەرگای ڕاستییەکی دڵنیاکەر. من و مامۆستا موحسین لەبن چادرێکی بچووکدا بووین. بە بەردەوامی پرسیاربارانم دەکردو دەمەویست بە (پووزەڵ)ی بچووک بچووک وێنەیەک پێکەوە بنێم!

مامۆستا موحسین گوتی: ((مامۆستا غاندی دەیزانی بەچڕی چاودێری دەکرێت، ڕۆژی گرتنی نزیک بۆتەوە. من بەهاوڕێیانی ڕێکخستنی سلێمانیم گوت: مامۆستا غاندی نووسەرێکی ناسراوە، تێکۆشەرێکی دێرینە، برای مامۆستا جەعفەرە، هاوڕێی زۆربەی سەرکردەو کادرەکانی کۆمەڵە و یەکێتییە و مەترسی گرتنی لەسەرە!

ناوەڕاستی مانگی نۆڤەمبەر کاتێکیان بۆ دیاری کردبوو، لەبەردەم مزگەوتی دوو دەرگا چاوەڕوان بێت. جل وبەرگی کوردی و عەلاگەیەکی سوور بەدەستەوە بگرێت. کەچی تەتەرەکە لەبەردەم مزگەوتی دوو دەرگا چاوەڕوانی کردبوو، بەویشیان گوتبوو لەبەردەم مزگەوتی گەورە چاوەڕوان بە..

ماوەی یەک مانگی ڕەبەق، هەر ئەمڕۆ و سبەینێیان پێ کردبوو. پاساوی بێتام و منداڵانەیان بۆ هێناوەتەوە: ڕۆژێک گوتویانە: نووسراوی ڕێکخستنمان پێ نەگەیشتووە. ڕۆژێکی تر گوتویانە: ئاگاداری سەرەوەمان کردووەو چاوەڕوانی وەڵامین. غاندی خاوەن کەسایەتییەکی بەهێزو و زۆر ڕێزی لەخۆی و

خەڵک دەگرت: دەزانێت کاسەکە بێ ژێر کاسە نییە و ماستەکە بێ موو نییە، بێ هیوا دەبێت. بەیانیانێک بۆ ئامادەیی کاژاو دەچێت. لەوێ ئەمنەکان گەمارۆی قوتابخانەکە دەدەن و بەدەستبەسراوی دەیبەن.

بە مامۆستا موحسینم گوت: ڕۆژانە هەر لەڕێگەی ڕێکخستنەوە چەندین تاوانبار و گومانلێکراو دێنە دەرەوە و دەستی خۆیان دەوشێنن و دەگەڕێنەوە. باشە حەزیان نەکردووە کاکم بێتە دەرەوە، هەر لەسەرەتاوە پێیان گوتبا، ئێمە ئامادە نین تۆ ڕەوانەی دەرەوە بکەین!

بیرم کەوتەوە! مانگی ئەیلوول نامەیەکم بۆ غاندی ڕەوانە کرد:

((مانگی ئەیلوول نامەیەکم بۆ ناردی پێتگەیشت؟)) من ئەم پرسیارەم لەمامۆستا موحسین کرد!

ئەو گوتی: ((بەڵێ پێم گەیشت!))

من گوتم: ((یەک نامە بوو، یان دوو ؟)).

ئەو گوتی: ((تەنیا یەک نامەم پێگەیشت!))

من گوتم: ((من دوو نامەم بۆ ناردی یەکێکیان بۆ تۆ و ئەوەیکەیان بۆ غاندی بوو!)).

ئەو گوتی: ((من تەنیا یەک نامەی ئاساییم پێگەیشت..)). من بەلامەوە سەیر بوو: بۆ لەدوونامە، کە هەردووکیان بە تیپ پێکەوە پێچرابوونەوە، یەکێکیان بە سەلامەتی بگات و دووەمیان نەگات!

نامەیەکم ئاراستەی ناوەندی کۆمەڵە کرد. سەردانێکی سالار عزیزو مەلا بەختیار و نەوشیروانم کرد. پێم گوتن ئەم ئاگرە بێ دووکەڵ نییە. چۆن نامەم بۆ دێ دەکرێتەوەو نامە بۆ برایەکم

دەنێرم رەوانە ناکرێت، یان یەکێکیان رادەست دەکرێت و دووەمیان کەس نازانێت چی لێ بەسەر هاتووە؟ من داوای لێکۆڵینەوەم کرد. مەلا بەختیار گوتی: ((پێم باش نییە هاوڕێیانی سەرکردایەتی ناوخۆ لەخۆت عاجز بکەیت و با کێشە دروست نەبێت..)).

سەرجەم رووداوەکە زۆر کاری تێکردم. لەوە دەچێت بەتوندی قسەم لەگەڵ نەوشیرواندا کردبێت. ئەو بە نامەیەک وەڵامی دامەوە، کە بێ دەستکاری دایدەگرم بۆ ئەوەی خوێنەری ئازیز لەکاردانەوەی تێ بگات:

**هاوڕێ ی بەڕێزم ماموستا جەعفەر**

سڵاویکی گەرمی برایانە. هیوام خوشی و بەختیاریتە

نامەکەت گەیشت هەواڵەی برادەرانی ناوەندی کۆمەڵەم کرد، وە هەر ئەوان خوشیان وەڵامی نامەکەت ئەدەنەوە، چونکە خوت نامەکەت بەرەسمی داناوە بۆ ئەوان، بەڵام من خۆیشم بە پێویستم زانی لەم چەند نقطەیە ئاگادارت بکەم:

١. من بەرەسمی ئاگاداری برادەرانی ناوەندی کملک م کردوە کە من تێیدا بەشدار نابم وە بە کردەوەش نزیکەی مانگێک ئەبێت بەشداریم نەکردووە، تەنانەت نە هیچ نامەیەکم خویندوتەوە کە بو ناوەند هاتبی وە نە هیچ نامەیەکیشم وەڵام داوەتەوە، بەڵکو بەرەو روی برادەران خویانم کردوەتەوە. لەبەرئەوە منیش وەکو تۆ وام و ئەوان خویان لەو موضوعەدا

تحقيق بكەن و نامەکەم دانی و من خۆم هیچ سفەتیکی رەسمیم نیە و لەبەر زروفی ئیستا و ئەو ئالوزی و پشێویەی هەیە و بۆ ئەوەی خەلک پێمان نەزانی دەنگم دەرنەچوە و قسەم نەکردووەو بلاوم نەکردوتەوە.

٢. دەربـارەی ئەو کـارەی لـەبارەی نامـە شەخسیەکانەوە کراوە بەهەق تەبیعی خۆتی! ئەزانم کە داوای تحقیق و لیکولینەوە بکەیت، وە ئەگەر شکت لەمنیش هەیە، با ئەو لیژنەیەی دائەنری لیرەوە دەست پێ بکا بە تحقیق لەگەڵ من و وابزانم من بەش بەحالی خۆم هەرگیز لەو مستەوایەدا نەبوم اسلوبی پاراستن بەکاربهێنم.

٣. ئیسـتا شۆرشـەکە و یـەکیتی و کۆمەڵـە* بەگشتی گیروگرفتیکی هەیە کە بەراست پیویستی بە علاج کردن هەیە بەروحی الشعور بالمسؤلیە کە ئەویش پێی ئەوتریت (ازمە القیادة)، هیوادارم زەبتی اعصابی خۆت بکەیت ئەگەر انهیاری عصبیش بکەیت جاری هەر تحمل بکەیت چونکە منیش بەراستی انهیارم کردوە بەلام هیشتا نەمویراوە اعلانی بکەم ئەگەر لازمیشتە هەندێ دەرمانت بۆ ئەنیرم هەر جارەی دانەیەکی بخۆ کە من بوم بە مدمن پێوەی رەنگە توزیک تخفیفی تورەبونەکەت بکات. من ئەمە ئیستا تەنیا (سلوا)مە. ئەگەر بە زەحمەتی نازانی و قبولی ئەکەیت یاخود وەرە

---

* ئەم نامەیە کەسێک ساڵی ١٩٨٣ لەئێرانەوە بۆی رەوانە کردم. لەترسی گرتن و پێوەبوون هەرچی وشەی (کۆمەڵە) و (یەکێتی) هەیە خەتی بەسەریاندا هێناوە. بە زەرەبین سەیر بکرێتەوە وشە ئەسڵیەکە بەروونی دەردەکەوێت..

به میوانی بۆ لامان یاخود ئەگەر جێگەی واتان هەیە ئاگادارم بکە من چەند ڕۆژێک دێم بۆ لاتان.

هەر بژیت و بەخۆشی

**نەوشیروان**
**١٩٧٩/٤/١٢**



# دوا دیداری سیروان و حەسەن خاوێی
## (٨)

مانگێک دەبوو چادرەکەمان لەسەر چۆمی نۆکان هەڵدابوو، سیروان تاڵەبانی و حەسەن خاوێی دەرکەوتن. سیروان گوتی: (( مام جەلال، سالار، مولازم عومەر..))، هەموویان حەزیان دەکرد لایان میوان بین و دەمانزانی جێگە و ڕێگەی ئەوان باشترە و ئێوە هەر ئەم چادرە چکۆلەیەتان هەیە، پێمگوتن تا مامۆستا جەعفەر لێرە بێت من ناتوانم بۆ هیچ شوێنێکی تر بڕۆم..)).

ئەو ئێوارەیە سیروان و حەسەن خاوێی تا درەنگانێ چیرۆکی گەرمیان و قەرەداغ و یەک بەیەکی لاپەڕەی ڕۆژانی پێشمەرگایەتی خۆیان دەگێڕایەوە. هەگبەی هەردووکیان تژی نوکتە و قسەی خۆش و بەسەرهات بوو. سیروان گوتی: (( ئەوەندە چەکمان پەیدا کردووە، دڵنیابە ناهێڵین لەمەودوا سوپای ڕژێم خەو بچێتە چاویەوە...)).

سیروان ئەوکاتە تاقەکەسی ناو شۆڕش بوو، کە بەخزمایەتی بە مام جەلال بگات. مام جەلال زۆر ستایشی سیروانی کردبوو، داوایشی لێکردبوو، لەسەرکردایەتی بمێنێتەوەو هاریکاری ئەوبێت، هەر پلەو پۆستێکی بوێت دەیداتێ! وەلامی سیروان یەک ڕستە بووە: ((من کۆمەڵەم و بڕوام بە عەشیرەتگەری و تایفەگەری نییە..)))!

مام جەلال زۆرجار دەیگێڕایەوە، لەچەمی ڕێزان خزمێکی دەبێتە پێشمەرگە و ئەمیش دەڵێت: ((ئەم پێشمەرگەیە ئامۆزامە.

چەند کوێخایەک لەوێ دەبن و دەڵێن: ئێمە وامانزانیوە ئەم مام جەلالە وەکو گیسکی ئاوەکی وایە، هیچ خزمێکی نییە!)).

ڕێگاکان بۆ قەرەداخ پڕ لەمەترسی و بۆسە بوون. ئەمان بڕیاریان دابوو یەکێک لەڕێگاکانی شارەزوور هەڵبژێرن. هەرچەند پێیان گوتبوون: جاشەکان بۆسە دەنێننەوە. شوێنی پەڕینەوەکان پڕ مەترسین. ئەمان بە مەکینە و عەرەبانە چەک و تەقەمەنییەکانیان گواستبووەوە. لای زێڕینجۆ شەوی ٢٩ــ ١٩٧٩/٤/٣٠ جاشەکان بۆسەیەکی تۆکمەیان بۆ نابوونەوە: (سیروان، حەسەن خاوێی، عەلی چەلەبی، حاجی چاوشین و نەجات ڕەحیم کەریم) شەهیدبوون. ئەم کارەساتە تا ئەمڕۆش شوێنەوارەکانی هەستی پێدەکرێت. لەکەرکوک و گەرمیان کەسایەتیەک دروست نەبووە، یەک لەسەدی سیروان تاڵەبانی کەسایەتییەکی بەهێزی هەبێت و بتوانێت، بە ئاسانی ببێتە جێگەی بڕوای کۆمەلانی خەڵک.

# لە (کملک)ەوە بۆ کۆڕەك
## (٩)

نـاوی کۆمەڵـە لـە (١٩٧٠/٦/١٠)ەوە تـا ١٩٧٩/٥/١ کۆمەڵـەی مارکسی ـ لینینی کوردستان ـ کملک بوو. لەم رۆژەوە ئیدی ناوەکـەی بـۆ کۆمەڵـەی رەنجـدەرانی کوردسـتان گـۆڕدرا. کۆبوونەوەکە پاش نیوەڕۆ بوو، لەسـەربانی بارەگاکەی سالار عەزیز، بە بۆنەی ناو گۆڕینەوە بانگ بەگوێی کۆمەڵە دا درا.

نزیکـەی چل کـادر لـەوێ ئامـادەبوون، جگـە لـەمام جـەلال. ئـەوەی راسـتی بێت، دەمێک بـوو نـاو گۆڕینەکـە قسـەی لەسـەر دەکرا. زۆربـەی ئەنـدامان لایـەنگری ئـەوەبوون، نـاوی کۆمەڵـە گۆڕانی بەسـەردا بێت، چونکە ناوەکـەی زۆر زەقـە، ئەمـە دەبێتـە هۆی وروژاندنی کەسانی ئەنتی کۆمۆنیستی، کە تەنیا ناوەکە بۆ بیانووی دژایەتی کۆمەڵە و شۆڕش بـەکاربهێنن. زۆربـەی کادرو پێشمەرگەکان لەناو جووتیاراندا کێشەی قورسیان هـەبوو. چۆن مارکسی ـ لینینی بۆ خەڵک شی بکەنەوەو تێیان بگەیێنن؟

مـام جـەلال، لـەرووی سیاسییەوە، شـیکاریەکی بـارودۆخی ناوچەکـەی کـرد، پـاش سـەرکەوتنی شۆڕشـی ئیسـلامی: رووخاندنی رژێمی شا، قوناخێکی زۆر جیاواز دەست پێدەکات. هێزێکی ئاینی لەم وڵاتە پان و بەرینەدا حوکمی گرتۆتـە دەسـت. ئەمانە بڕوایـان بە دیموکراسی نییە: بڕوایان بە هـەناردەکردنی شۆڕشـی ئیسـلامی بـۆ وڵاتـانی دراوسـێ هەیـە. شـەپۆلێکی جوڵانـەوەی کۆنەپەرسـت و راسـتڕەو سـەرهەڵدەدات. رەنگـە

لێدانی کۆمەڵە بەم ناوە زەقەیەوە بکرێتە ئامانجی ئەوان. هەر ناوەکە خۆی سەرنجیان رادەکێشێت.

یەکێتی دەتوانێت هێزی نیشتمانی و پێشکەوتنخواز لەخۆی کۆبکاتەوەو کۆمەڵە ببێتە کاکڵەی ئەم هێزە. ئەگەر لە دیوی دەرەوەوە، گورزێک ئاراستەی کۆمەڵە کرا، ئەوە یەکێتی خۆی دەداتە بەر ئەو گورزە و کۆمەڵە کەمترین زیانی بەردەکەوێت.

سالار عەزیز و مەلا بەختیار دوو قۆلی بەیانەکەیان نووسی"*

---

*دەقی بەیانەکە لە بیرەوەرییەکانی شاخەوان عەباس بڵاوکراوەتەوە. شاخەوان عەباس: سەفەری کوردایەتی (١٩٧٤-١٩٨٠) چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠١٢، ل ٢٤٢

# داوداوێ

# (١٠)

دەنگۆی نیازی رژێم بۆردومانکردنی ناوچەی رزگارکراو بکات، بە خەستی بڵاوکرایەوە هەڤاڵانی مەکتەبی عەسکەری پێیانوابوو: ئێزگەکە مەترسی زۆرتری لەسەرەو پێویستە ئێمە بارەگا بۆ داوداوێ بگوێزینەوە. گوندی (داوداوێ) بەر کوردستانی رۆژهەڵات دەکەوێت. ئێزگەکە بچووک بوو. تۆزێک لە (هارد)ی کۆمپیوتەر گەورەتر بوو. رۆژی ١٩٧٩/٦/٤ بە شان گواستمانەوە. نەمانهێشت یەک رۆژیش ئێزگەکە لە کار بکەوێت. گەنجێکی زۆر روویان کردە شاخ. کانیاوێکمان دۆزیەوە و ساباتمان دروستکرا. دوو کەس بوونە تایپیست (سوورکێو)* و (بهائەدین). مامۆستا شێرکۆ کەریم شەریف، مامۆستا سەردار و مامۆستا جەمال عەزیز پێنجوێنی** فەرید ئەسەسەرد، کاوە یارئەحمەد، مامۆستا موحسین، سۆران (فەیسەڵ سیامەنسووری). ستافی نووسین بوون.

ئێمە دەرگای نووسین و دەنگوباس بڵاوکردنەوەمان بۆ هەموولایەک، بەتایبەتی بۆ کادرو ئەندامانی پارتی کۆمۆنیست،

---

* سوورکێو: یاسین ئەحمەد عەلی: کادرێکی دڵسۆزو پاک و سەربەرز، هەمیشە دەم بەپێکەنین و قسە خۆش. قەت لەکارکردن بێزار نەدەبوو. لەسەر تەنیا یەک(وشە) کۆتایی بە ژیانی خۆی هێنا. کەسانێک دەناسم رۆژانە هەزاران قسەیان پێ دەگووترێت و هەزاران شتیان لەسەر بڵاو دەکرێتەوە، هەر تەریش نابن.

** مامۆستا سەردار و مامۆستا جەمال عەزیز پێنجوێنی ساڵی ١٩٨١ لە گوندی گەردێی شارباژێر لەلایەن مەفرەزەیەکی پاسۆکەوە شەهید کران.

خستە سەر پشت. هەر لەیەکەم دانیشتندا پێمان گوتن: ئێوە ئازادن، چی دەنووسن و چەند دەنووسن، سانسۆر ناخرێتە سەر قسەی کەس. جەلال دەباغ، رەفیق سابیر.. رۆژانە سەریان دەدایین و بەرهەمی خۆیان پێشکەش دەکرد.

ساڵی ٢٠٠٦ جەلال دەباغ بەسەردان بۆ لامان هات و گوتی: ((ئێستا قەڵەمی سوور بەکار دەهێنیت؟)).

یەکسەر گوتم: ((دژی سانسۆرم، بە مەرجێ پرنسیپە دیموکراسییەکان پێشێل نەکرێت)).

جەلال دەباغ گوتی: ((یەکەمین جار یەکترمان بینی گوتت: بڕوام بە قەڵەمی سوور و سانسۆر نییە. لەبن ئەم کەپرەی ئێمەدا قەڵەمی شین و رەش دەست دەکەوێت. قەڵەمی سووری لێ نییە!)).

مولازم عومەر ئامێرێکی (هۆکی تۆکی) داینێ و دەمانتوانی سەری سەعات قسەی پێبکەین. پەیامی زارەکی زۆر کورت بە یەکتر بگەێنین. مەودای گەیاندنی ئەوسای ئێمە زۆر بەسوود بوو. سەعات بە سەعات نوێترین نووچەی مەملەکەتی (خڕی نێرزەنگێ)مان ئەم دەست و ئەو دەستی پێدەکرا.

# د. فوئاد و عەلی حەویز

## (١١)*

---

* نەوشیروان مستەفا ئەو بە ستایلی خۆی ڕووداوەکەی نووسیوە. کەسێک باککراوندو پێشینەکەی نەزانێت، ڕەنگە پێیوابێت، ئێمە لەدژی عەلی حەویز نارەزایمان دەربڕیبێت! من بەبێ دەستکاری، ئەم برگەیە دەخەمە بەرچاوی خوێنەرانی ئازیز، بۆ ئەوەی خۆیان بەراورد لەنێوان هەردوو گێڕانەوەکەدا بکەن و سەرپشک بن: من و هاوڕێیانی تریش لەوە دڵنیاین نەوشیروان لە کۆبوونەوەکەدا بوو. نازانم بۆ بیری چۆتەوە، کە لەو دانیشتنەدا بەشداری نەکردووە؟ ((گەڕامەوە بۆ بارەگاکانی سەرکردایەتی لەتوژەڵە، هاوڕێکانی خۆم و مامجەلال و سەرانی بزووتنەوە ـ ئەوانەی لەگەڵ یەکێتی مابوون ـ بینی. کێشەکە لەسەر جۆری دروستکردنەوەی مەکتەبی سیاسی بو. ئەوانەی پێشنیار کرابون بۆ ئەندامەتی م. س لە کۆمەڵە: سالار و فاضل، لەهێلی گشتی: د. فوئاد مەعصوم و د. کمال خۆشناو، لە بزووتنەوەش: جەمال ئاغا و عەلی حەویز. نوێنەرەکانی کۆمەڵە وت بویان: ((ئێمە عەلی حەویز ناناسین. تازە هاتۆتە دەرەوە. لەبەرئەوە قوبول ناکەین دابنری بە ئەندامی م. س)) مام جەلالیش بۆی باس کردبون کە ئەوە تێکۆشەرێکی دێرینە و لێپرسراوی ڕێکخراوەکانی بزووتنەوە بوە لەکۆیەو ـ هەولیکی زۆری دابوو بۆ ئەوەی بەخۆشی قانعیان بکا کە عەلی قوبول بکەن. نوێنەرەکانی کۆمەڵە سوربون لەسەر هەلویستی خۆیان. کۆتاییەکەی بەوە هات بو کۆبوونەوەکە تێکچوو بو. مام جەلال سویندی خوارد بو کە ئەگەر عەلی نەکرێ بە ئەندامی م. س، ئەو لەناو یەکێتی دا نامینی و، کوردستان بەجی دەهێلی و، بەیانێکیان لەسەر دەرئەکا. کۆبونەوەکە تێک ئەچی و بلاوەی لی ئەکەن. مامجەلال بەهەمان ناوەرۆک و، بەتوڕەبونەوە، نامەیەکی بو سەرکردایەتی کۆمەڵە نوسی بو.
هەولیکی زۆرم دا گرژیەکە خاو بکەمەوە. لەگەڵ سەرکردایەتی کۆمەڵە کۆبومەوە. لەسەر کێشەکە زۆر دواین. هەولمان دا چارەیەکی ناوەنجی بدۆزینەوە. مامجەلال بەهیچ جۆری ئامادە نەبو لەبریارەکەی خوی بکشیتەوە. لەئەنجام دا کەوتینە هەلسەنگاندنی ئەوەی مامجەلال بۆ یەکیتی

کۆتـایی ئـەیاری ۱۹۷۹ مـام جـەلال بەنامەیـەکی کـورت پێیڕاگەیاندین بۆ نانی نیوەڕۆ لای مەلا بەختیار دەبین و لـەوێش کۆبوونەوەی (م. س) دەکرێت. بە ڕێکەوت لـەنیوەی ڕێگا چاوم بە مەلا بەختیار کەوت. ئەو پرسیاری لێکردم:

((مام جەلالت بینیوە؟)).

گوتم: ((نەخێر!)).

ئەو گوتی: ((نازانیت کۆبونەوەی ئەمڕۆ لەسەر چییە؟)).

گوتم: ((هـیچم نەبیسـتووە و بەتـەمابووم بۆ لای مـام جـەلال بڕۆم و لەخۆی بپرسم!)).

ئـەو پێشـنیازی کـرد: بـا پێکـەوە بـڕۆین و بـزانین لـەبن چادرەکەی مام جەلال چباسە!)).

چادرەکـەی مـام جـەلال لـەبن دارگـوێزێکی گـەورەی سەروچاوەی تووژەڵەدا بوو. ویستمان بچینە ژوورەوە، د. فوئاد مەعسوم ئێمەی بەدیکردو گورج بۆ لامان هات: ((لای مام جەلال

---

پیوستە و مەرجە نارەواکەی لەپیناوی پاراستنی ریزەکانی یەکیتی دا قوبول بکەین، یـان مەرجەکـەی قوبـول نەکـەین و پەیوەنـدی خۆمـانی لەگـەڵ تـک بدەین! مامجەلال گرەوەکەی بردەوە: مەرجەکەی قوبول کرا.)).

بڕوانـە: نەوشـیروان مسـتەفا: پەنجـەکان یـەکتر ئەشـکێن: دیـوی نـاوەوەی ڕووداوەکانی کوردستانی عیراق. ۱۹۷۹ ـ ۱۹۸۳ لاپەڕە ۱۱۹.

زانیاریـەکان زۆربـەی بەهەڵـە نووسـراون: پـێش ئـەم کۆبوونەوەیـە(م. س) پێکهێنرابوو. بسک یەک نوێنـەریان هـەبوو، دەیانویست بیکەنـە دوو. جـەمال حەکم ئاغا سـەرەتای ۱۹۸۰ هاتـە دەرەوە. لەکاتی ئەم کۆبوونەوەیـەدا ئـەو هێشـتا لەشـاربوو.. ئـەو لەنووسـینەوەی ڕووداوەکانـدا ئـارەزووی کردۆتـە تـەرازوو.. کەسـێک شـێکاری مـەنتیقی بـەکاربهێنێت، یەکسـەر بـۆی دەردەکـەوێت، لە گێڕانـەوەی ڕووداوەکـە میتـۆدی ئاوەژووکردنـەوە بەکارهاتووە..

زۆر قەڵەباڵغە و جێگەی دانیشتن نییە. هەرچی کوێخای مەنگوڕ و بڵباس هەیە لەژوورەوەن!)). دکتۆر فوئاد بەم رستەیە پەشیمانی کردینەوە.

مەلا بەختیار گوتی: ((نازانی کۆبوونەوەکەی ئەمڕۆ لەسەر چییە؟)).

د. فوئاد راست و رەوان لەبنی هەمانەکەیدا و گوتی: ((بەخودای مام جەلال بە تەمایە عەلی حەوێز بکاتە ئەندامی مەکتەبی سیاسی..)).

ئێمە هەردووکمان نەماندەزانی عەلی حەوێز کێییە و رابووردووی چییە؟

ئایا جێگەی عەلی عەسکەری بە عەلی حەوێز پڕ دەکرێتەوە؟

مەلا بەختیار گوتی: ((عەلی حەوێز کێیە؟)).

من گوتم: ((تۆ دەیناسیت؟ پیاوێکی چۆنە؟)).

د. فوئاد گوتی: ((عەلی حەوێز کۆیییە و مامۆستای سەرەتایی و کۆنە جەلالییە. لای چنارۆک بە پێشمەرگەکانی گوتووە: ((حەزدەکەم لە ئێزگەکە کاربکەم و دەنگم بۆ بێژەری چاکە! مام جەلال چۆتە بنکڵێشەیەوە و بەڵێنی داوەتێ بیکاتە ئەندامی مەکتەبی سیاسی..)) *.

ئێمە گوتمان: ((ئێمە نایناسین و ناشزانین بۆ مام جەلال دەیەوێت ئەم کەسە بسەپێنێت؟)).

د. فوئاد بەئەوپەڕی حەماسەوە دژی دانانی عەلی حەوێز بوو: ((هەر کەسێک یەک زەڕە ئەخلاق و شەرەف و کەرامەتی

---

* من دەقی قسەکانی د. فوئادم لەبیرە. کەسایەتی خۆم رێگەم نادات دەقی قسەکانی ئەو بنووسمەوە. ناشمەوێ قسەکانی مام جەلال بەرامبەر د. فوئاد بنووسمەوە. هەر هەمووی با بۆ بن گڵ بێت..

هـەبێت، نابێـت ئـەوە قبـوول بكـات عـەلی حـەوێز لـە مەكتـەبی سیاسی دابنرێت!)).

مەلا گوتی: ((تۆ هەڵوێستت چی دەبێت ئەگەر مام جەلال، یان د. كەمال خۆشناو پێشنیازەكەیان كرد؟)).

د. فوئاد: ((من دژم.. من ئەوپەڕی دژ دەبم..)).

ئەم گفتوگۆیە سەعات دەورووبەری دوانزەی نیوەڕۆ بوو.

ئێمە دڵنیابووین ئەگەر ئەم پێشنیازە بخرێتە دەنگەوە: ئەوە لەلایەن ئێمەوە: (سالار، مەلا بەختیار، عومەر عەبدوڵلا، بەندە) دەنگی پێنادرێت، ئەوە د. فوئادیش بەڵێنی خۆی داوە. مام جەلال، نەوشیروان و د. كەمال خۆشناو دەمێننەوە. پێشنیازەكە دەنگ ناهێنێت.

كۆبوونەوە پاش نان و چا خواردنەوە لەناو چادرەكەی مەلا بەختیار لەتووژەڵە دەستی پێكرد.

مام جەلال دەفتەرەكەی كردەوە و داوای كرد: ئەجێندای كۆبوونەوەكە دیاری بكرێت:

١. مولازم عومەر: دەنگوباس هەیە ئێران سوپای بەرەو كوردستانی رۆژهەلات جوڵاندبێت.

٢. د. كەمال: رێكخستنی ناوچەی چۆمان.

٣. د. فوئاد: من دەمەوێ دەربارەی بزووتنەوە هەندێ قسە بكەم

من لەدڵی خۆمدا گوتم: ئەمجارەیان د. فوئاد لەگەڵ مام جەلال دەیتەقێنێتەوە یان دەیكەێنێتە مریشكە رەشە!.

پاش تێپەڕاندنی خاڵی یەكەم و دووەم. مام جەلال داوای لە د. فوئاد مەعسووم كرد، دەربارەی بزووتنەوە بیرۆكەكەی خۆی پێشكەش بكات.

د. فوئاد گوتی: ((مام جەلال، بزووتنەوە بە قۆناخێکی زۆر سەختدا تێدەپەڕێت. عەلی عەسکەری و دکتۆر خالید شەهیدبوون. ڕەسوڵ مامەند لەگەڵ ژمارەیەک کادری سیاسی و عەسکەری جیابوونەوە. کاک عومەر دەبابە خۆی بەتەنیایە و پێویستە ئێمە بەهێزی بکەین. بۆیە من پێشنیاز دەکەم عەلی حەوێز بکرێتە ئەندامی مەکتەبی سیاسی ی. ن. ک... تاد)).

من خراپ تووڕەبووم و گوتم: ((هەر کەسێک ئەم پێشنیازەی بکردایە لای من زۆر ئاسایی بوو. دکتۆر فوئاد ئەم پێشنیازە بکات، ئەمە سەیرو سەمەرەیە، ئەم دکتۆر فوئادەتان بینیوە یەک سەعات لەمەوپێش گوتی: هەر کەسێک یەک زەڕە ئەخلاق و شەرەف و کەرامەتی هەبێت، نابێت ئەوە قبوول بکات عەلی حەوێز بکرێتە ئەندامی مەکتەبی سیاسی. ئێستا نازانم چی ڕوویداوە و چی گۆڕاوە؟ ئەم پیاوە خۆی هاتووە پێشنیازێک دەکات پێشتر بەتوندی دژی بووە..))!

مەلا بەختیار، تاقمەکەی کردبووەوە، کلاشینکۆفەکەی بە قەراخ چادرەکەوە بوو. ئەویش گوتی: ((ئێمە نە عەلی حەوێزمان دیوەو نە دەیناسین. تۆ سەعاتێک لەمەوپێش جوێنی دونیات بەم کابرایەدا و خۆت وا پیشاندا، کە دژی دانانی عەلی حەوێزی، کەچی خۆت هاتووی پێشنیازی ئەو بۆ ئەندامێتی مەکتەبی سیاسی دەکەیت؟ زۆرم پێ عەیبە لە شوێنێک دابنیشم تۆ لەوێ بیت. تاقمەکەی بەست و کلاشینکۆفەکەی گرتە دەستەوە. هەردووکمان دوو قۆڵی دەرچووین و مولازم عومەریش کۆبوونەوەکەی جێهێشت.

سالار عەزیز و نەوشیروان کۆبوونەوەیان جێنەهێشت! نەوشیروان بەدرێژایی ئەو هەموو دەنگە دەنگ و هەڵچوون و

داچوونـه، یـەک وشـە لـەدەمی دەرنـەچوو. ئـەو بـەدرێژایی ئـەو رۆژگـارە زۆر دڵسـۆزانە لەسـەر رێبازو ئامۆژگـاری مـام جـەلال دەجووڵایەوە و هەرچی بڕیارێک دەربکرایە پیشەکی رەزامەندیی وەرگیرابوو.

ئیدی کۆبوونەوەکە تێکچوو. د. فوئاد بۆ لامان هات و داوای لێبـوردنی کـرد. ئێمـە تێگەیشـتین، پیشـەکی ناچـار کرابـوو، بـەو شـێوەیە پێشـنیازەکەی خـۆی دابڕێژێت.. بەداخـەوە نەوشـیروان لـەبری ئـەوەی بـۆ بڕیـاری هەڵـە پشـت و پشـتیوان نـەبێت و چارەسـەر بدۆزێتـەوە، هێـرش کـردن بـۆ سـەر کەسـانی (بـێ شەهادە) گوایە: نابێ لەناو (م. س) و سەرکردایەتی کەسانی (بێ شەهادە) جێگەیان بکرێتەوە.

# هاوینی ١٩٧٩
# (١٢)

هاوینی ١٩٧٩ تووژەڵە جموجۆڵێکی فراوانی بەخۆیەوە بینی. هەر بن دارگوێزێک بارەگای حزبێک بوو. حزبە عەرەبەکان ناویان نابوو(وادی الاحزاب). ڕێکخراوە سیاسی و چەکدارەکانی ئێرانیش شەپۆل شەپۆل ڕوویان دەکردە تووژەڵە. ڕۆژێک سەلاحی موهتەدی، مەلا عومەری عەسری، مولازم عومەر، سالار عزیز، بەندە لەبن دارگوێزێک دانیشتبووین. پێشمەرگەیەک چەند ژمارەیەک کۆمەڵەی هێنا، کە لە (A4) ەوە بۆ چارەک (A4) بچووککرابووەوە. بە ئاسانی نەدەخوێنرایەوە.
مەلا عومەر فەرمووی: ((ئەمە بۆ ئەوەندە بچووککراوەتەوە؟ ئەگەر هەموو بڵاوکراوەو نووسراوەکان وا بچووکبکرێنەوە، تا کوردستان رزگار دەبێت، هەموومان کوێر دەبین. کە هەمووشمان کوێر بووین، با کوردستان هەر رزگار نەبێت!)).

****

پێشمەرگەیەکی (حدکا) نامەیەکی مام غەنی بلوریانی هێنابوو، رادەستی مولازم عومەری کرد. نامەکە یەک لاپەڕەی خورشیدی، تاقە یەک دێڕی تیا نووسرابوو.. سەرەتا مولازم عومەر وایزانی جفرەیە: بە شێوەیەک نووسرابوو، بە ئاسانی جفرەکە نەدەخوێنرایەوە. مەلا عومەر لەدەستی وەرگرت: نووسرابوو(دەمانەوێت ئیستیفادە لە تجریباتی ئێوە وەربگرین لە مقەر دانان..) مەلا عومەر گوتی: ((ئەمە هەمووی بن دارگوێزو کانیاوە، وەرە لەبن دارگوێزێک دابنیشە، ئەوە بارەگاو مەقەر، ئیتر کۆبوونەوەو ئیستیفادە لەتجریبیاتی یەکێتیی بۆ چییە؟)).

چل پەنجا کوێخایەک لەنێوان (بەنو خەڵەف) و (کانی زەرد) لەبن کەپرێکدا چاوەڕوانیان دەکرد، (مام جەلال، مولازم عومەر، بەندە) پێکەوە بۆ لایان چووین. ئەوان خۆیان هێدمە گرتبوونی و پەنایان بۆ مام جەلال و سەرکردایەتی یەکێتی هێنابوو، بە ئومێدی ئەوەی ئاوێک بە ئاگرەکەدا بکرێت.

مام جەلال یەک سەعات قسەی بۆ کردن. ئەوان دەیانگوت: دەوڵەتی ئێران بڕیاری داوە کورد لەناو بەرێت. مام جەلال گوتی: ((کورد بە کەس لەناو ناچێت. هەر دەوڵەتێک بیەوێت گەلێک لەناو بەرێت، ئەو گەلە کاردانەوەی دەبێت. دەستەی بچووک بچووکی شەڕی پارتیزانی دروست دەبێت! کوێخا خدری بەنو خەڵەف تەپەی گوێی دەهات و مێشکی ئەم قسانەی وەرنەدەگرت، گوتی: ((مـن کاردانەوەو کارنەدانەوەو شەڕی پارتیزانی نازانم! چۆنت لێ تێکداین دەبێ ئاواش بۆمان چاک بکەیتەوە..))!

حکومەتی ئێران زۆر لەسیاسەتی یەکێتی پەست و نیگەران بوو. پەیامێکیان بۆ مام جەلال نارد: ((بۆ، هەموو ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی لەبن باڵی ئێوەدا کۆبوونەتەوە؟ ئایا ئێوە دوژمنی دەوڵەتی ئێرانن؟)).

مام جەلال ئەم نامە نەنووسراوەی بە نوێنەرێکی خۆی ڕەوانەیان کرد: ((ئێمە لەسەر سنوورین. ئەوان لای ئێمە میوانن. میوان دەرناکرێت. لێرشەوە تەقە لەدەوڵەتی ئێران ناکرێت. ئێمە هەوڵدەدەین پێکەوە دابنشین و کێشەکان چارەسەر بکرێن. ئێمە نامانەوێت کێشەکان بەشەڕو بە چەک چارەسەر بکرێن. ئێمە نەیانگرینە خۆمان، لەسنوور ئاودیو دەبن. سەدام چەک و پارەی زۆریان دەداتێ و بەتوندی شەڕتان دەکەن..)).

ئێرانییەکان سیاسەتی یەکێتییان پەسەند کرد.

## پڕۆژەی ڕاگەیەنراو
## (١٣)

سەرکردە مێژووییە مەزنەکان، تا دوا ڕۆژی ژیانیان پەیڕەوی یەک ڕێبازو یەک بیروباوەڕیان کردووە: مهاتما غاندی بڕوای بە پەیڕەویکردنی ڕێبازی (نازەبروزەنگ) هەبوو. نێلسۆن مەندێلا، ماوەی (٢٧) ساڵ زیندانی کێشا، لە سۆنگەی دژایەتی سیستێمی جیاوازیی ڕەگەزی(ئاپارتاید)و بەموو لەڕێبازی خۆی لاینەدا.

مام جەلال پاش ساڵی(١٩٧٥) یەک پڕۆژەی ڕاگەیەنراوی بڵاوکردەوە، چەندین پڕۆژەی ڕانەگەیەنراوی لە مێشکی خۆیدا گەڵاڵە کردبوو، نەیدەویست بە ئاسانی بیاندرکێنێت. پاژی ڕاگەیەنراوو ڕانەگەیەنراوی پڕۆژەکان تا ڕادەیەک لەناو دەروونی ی. ن. ک پشێوی نایەوە. ئەم پشێوییە تا ڕۆژی ئەمڕۆش هەر بەردەوامە.

ئەو خۆی کۆمەڵەی دروست کردبوو، کەچی هەموو کۆمەڵەیەک لای ئەو کۆمەڵەی ڕەسەن (ئێ دەخۆن) نەبوو! تۆ پێتوابوو: مام جەلالی ساڵی (١٩٧٠)و مام جەلالی پاش (١٩٧٥) هەر یەکێکن: بە زمانی (ماوزەتۆن) لەگەڵی دەکەوتیتە گفتوگۆوە، کەچی ئەو لە دڵەوە بڕوای بە تێزە کۆنەکانی (ماو) و (چی گوارە) نەمابوو. سەرانی بزووتنەوەش پێیانوابوو: مام جەلال

لەسەرەوە یەکێتییە و لەبنەوە کۆمەڵەیە! واتە: رابوردووی سکرتێری گشتی، بۆ هەردوو باڵەکە، ئاسان نەبوو.

من رۆژێکیان پرسیارێکم لە مام جەلال کرد:

((تۆ کاتی خۆی دینەمۆی دامەزراندنی کۆمەڵە بوویت. ئێستا بە کردەیی سکرتێری یەکێتیت، تۆ سەرکردەیەکی مارکسیی گەورەیت و دڵیشت هەر بۆ کۆمەڵە لێدەدات! ئەی بۆ وەکو سکرتێری کۆمەڵە رابەرایەتی کۆمەڵە لە ئەستۆ ناگریت؟)).

ئەو گوتی: ((قسەکەی تۆ راستە! ئەگەر بە خۆم بێت، لەناو کۆمەڵەدا کاردەکەم. بەلام من بە سەرکردەیەکی نیشتمانی ناسراوم و هەڵەی مێژوویی زۆر قورسیشم کردووە و ئەمە رێگەم نادات سەرۆکایەتی رێکخراوێکی مارکسی و چەپ لە ئەستۆ بگرم)).

ئەو لەمەبەستی من تێگەیشت، کە بەناراستەوخۆ دەمەوێت پێی بڵێم: دوو کاڵەک بە دەستێک هەڵناگیرێت. لە دڵەوە بڕوای بە تیۆریی (کوڕی سێو لەبەر باخەڵ) هەبوو ئەو پێیوابوو نەک دوو کاڵەک، حەوت کاڵەکیش بە دەستێک هەڵدەگیرێت!

بریا مام جەلال لە یەکەم رۆژی دامەزراندنی یەکێتییەوە، راست و رەوان بینوسیبایە: (یەکێتی نیشتمانی حزبە، خەبات بۆ ئەوە دەکات بەرەیەکی نیشتمانی کوردستانی پێکبێت..) لە کوردەواریدا بۆ هەنگاوی یەکەمی هەر کارێک دەگوترێت (شەڕ لە شێفی، ئاشتی لە خەرمان)، (یا شەڕ لە شۆ، نەک لە تۆو)* ئەم

---

* شێف: یەکەم هێلی جووت

ناڕوونییە لە بیرۆکەی دامەزراندنی یەکێتی دواتر کێشەو سەرئێشەی نایەوە.

هەر کەسێکیش نامیلکەی (یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانیی بۆچی؟) بخوێنێتەوە، بیری بۆ لای ئەوە دەچێت: (یەکێتی لە قۆناخی دروستبووندایە و پاش ماوەیەکی تر بەرەو بەرە گەشە دەکات!).

دوای گەڕانەوەی مام جەلال (١٩٧٧/٧/٢٠) ئەو بیرۆکەی (بەرە)ی لە بیری خۆی بردەوە وقۆڵی بۆ دامەزراندنی (حزب) هەڵکرد.

عەلی هەژارو کاردۆ گەلاڵی و ڕەسول مامەند و حاجی حاجی برایم.. تاد. لەناو (بسک)دا فراکسیۆنێکی بەهێزبوون، بە بەردەوامی پێداگرییان لەسەر ئەوە دەکرد، کە دەبێ یەکێتی (بەرە)بێت، نەک لە نیمچە بەرەوە بۆ حزب بگۆڕدرێت. ئەم چوار داماوە، لە ئەدەبیاتی یەکێتیدا بە مایەی گێرەشێوێنی و گومان لێکراوی وێنا دەکران. عەلی عەسکەری خۆی ئەوەندە بە بەهێز دادەنا، پێوابوو: بسک پارێزراوەو هێزی پێشمەرگەش بە ئاماژەیەکی ئەو دەجوولێتەوە.

شاسوار جەلال(ئارام) بە هەمان شێوە تا دوا ڕۆژەکانی ژیانی لایەنگری ئەوە بوو: (یەکێتی نیمچە بەرەیە، نابێ بکرێتە حزب، بە پێچەوانەوە، دەبێ ئەم دامەزراوەیە بۆ بەرەیەکی نیشتمانی گەشەی پێبدرێت...)).

جارێکیان پێش ١٩٧٩/٣/٢١ سەرکردایەتی بسک: (ڕەسول مامەند، حاجی حاجی ئیبراهیم. قادر عەزیز ....) لەگەڵ ناوەندی کۆمەڵەدا: (نەوشیروان، مەلا بەختیار، سالار عەزیز ....)

دانیشـــتبوون. داوایـــانکردبوو هەڵوێســـتی هاوبەشـــیان هەبێـت: یەکێتـی بکـرێتە بەرەو هەردوولا سـەربەخۆیی خۆیـان بپـارێزن! نەوشیروان بە توندی دژی پێشنیازەکەیان بوو.

جارێکیان، لەگەڵ مـام جـەلال دوو قۆڵی دانیشـتبووین، باسـی پەیوەنـدی نێـوان کۆمەڵـە و یـەکێتیمان دەکـرد، پێیگـوتم: (کـاک سـالار زۆربـاش لـە یـەکێتی تێدەگات و ئـەو راسـتییە دەزانێـت: بەهێزبوونی یەکێتی بەهێزبوونی کۆمەڵەیە! بەڵام شەهید ئارام تـا ئـەو رۆژەی شـەهیدبوو، نەیدەویسـت لـە یـەکێتی تێبگـات و ئـەو تەنیا کۆمەڵەی بە پێویست دادەناو دانی بە یەکێتیدا نـەدەناو مـن سـێ نامـەی ئـەوم لایـە و هـەڵمگرتوون. بـە تونـدی داکـۆکی لـە کۆمەڵە دەکات و یەکێتی لای ئەو هیچ نییە!).

من پێمگوت: ((کاک ئارام لە نووسینەکانیدا هـەر زۆر داکۆکی لـە یـەکێتی کـردووە. بـەڵام جـەختی لەسـەر سـەربەخۆیی کۆمەڵـە کـردووەو پێیوابـوو: یـەکێتی نیمچـە بەرەیـە و دەبـێ ببێتـە بـەرەو نابێ ببێتە حزب..))!

مام جەلال گوتی: ((تێکشکانی حەملـەی هـەکاری کارەکـەی لـێ تێکداین. ئێمـە بـە تـەمابووین بـۆ (دۆڵـە کۆسـتە) بچـین و لـەوێ سەرکردە مارکسییە باشەکان یەکبگرین و هەر هـەموو دەبووینـە یەک حزب...)).

مـن دەمـەوێ قسـەی هاوڕێیـەکی ئەوسـای کۆمەڵـە (ئـازاد خۆشناو) بە نمونە بهێنمەوەو تیشک بخەمە سەر تێگەیشتنی مام جەلال بۆ باڵەکانی ناو یەکێتی لە ماوەی پێش و پاش راگەیاندنی ی. ن. ک لـە ١٩٧٥/٦/١دا ئـەم، ئەنـدامی دەسـتەی دامەزرێنـەر

بووە، لە سۆنگەی بۆچوونی بۆ بنەمای دەستەی دامەزرێنەر دوورخراوەتەوە:

(من وەکو نوێنەری کۆمەڵە. لەزۆربەی کۆبوونەوەکاندا بەشداربووم، پەیوەندییەکانی مام جەلال لە ماوەی نێوان ١٩٧٥/٣/٦ ـ ١٩٧٥/٦/١ لەگەڵ سەرکردایەتی کۆمەڵە، بەشێک لە ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەر لە ڕێگەی منەوە بوو. د. کەمال فوئادو نەوشیروان مستەفا ئامادە نەبوون، پەیوەندییان لەگەڵ یەکێتیدا هەبێت!

من بۆ بەرلین و ڤیەننا چووم و قەناعەتم بە هەردووکیان کرد. ڕۆژی ١٩٧٥/١٢/١٦ دوو قۆلی لەگەڵ نەوشیروان گەیشتینە شام. من بە بەردەوامی لە کۆبوونەوەکانی دەستەی دامەزرێنەری (ی. ن. ک)دا بەشدار دەبووم. لەناو یەکێک لە کۆبوونەوەکاندا، مام جەلال گوتی: ئێمە هەموومان نوێنەری یەکێتین و بۆ یەکێتی کار دەکەین! منیش گوتم: مام جەلال هیچ وانییە، من ئەندامی کۆمەڵەم، وەکو نوێنەری کۆمەڵە ئامادەی کۆبوونەوەکان دەبم. فەرموو: ئەوە لەناملیکەی (یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بۆچی؟) نووسیوتە: یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان قەوارەیەکە: ڕێکخراوو تەیاراتی جیاجیا خەباتی تێدا دەکەن. ئێمەی لێرە پێکەوە دانیشتوین، نوێنەری ڕێکخراوو و تەیارەکانین و کەسمان نوێنەری خۆمان نین... من نوێنەری کۆمەڵەم! ئیدی لەو ڕۆژەوە لووتی لێم خوارکرد، ناوی منیان لەدەستەی دامەزرێنەر سڕییەوە!)).

ئەم نمونەیە ئەو راستیەمان بۆ دەسەلمێنێت، کە پڕۆژەی راگەیێنراوی یەکێتی شتێک بووە، پڕۆژەی رانەگەیێنراویش شتێکی تر. مام جەلال لە روانگەی پڕۆژەی رانەگەیێنراوی خۆیەوە، سەیری هەڵس و کەوت و چالاکی سەرکردە و هێزو گروپە سیاسییەکانی کردووە. پڕۆژە راگەیێنراوەکانیش لەسەر رەفە کۆنەکان تۆزیان لێنیشتووە!

## ناوەندو نەوشیروان
## (١٤)

مام جەلال (تێز)یەکی لەسەر زمان و بنزمان بوو(بەهێزبوونی یەکێتی، بەهێزکردنی باڵەکانیەتی. بەهێزبوونی باڵەکان، بەهێزبوونی یەکێتییە!). بەکردەیی حەزی لەچڕوچاوی هیچ باڵ و ماڵێک نەبوو. ئەو هەمیشە بیری لای شوێنکەوتوانی سەردەمی بەکرەجۆ بوو. کۆمەڵە، هێزێکی هاروهاج و دەستوەشێن و سەربزێو بوو. لەو هەرێمانەی کۆمەڵە بەناوچەی خۆی دەزانی، کادرو پێشمەرگەی بسک و هێڵی پان رێگە نەدەدران رووبکەنە ئەو هەرێمانە. ئەو دەیویست: یەکێتی یەک رەنگ و یەک دەست بێت. دوای عەلی عەسکەری مام جەلال دوو پۆستی هەبوو: سکرتێری گشتی و فەرماندەی گشتی هێزی پێشمەرگەی کوردستان (ف. گ. ە. پ. م. ک). پێشمەرگەکانی کۆمەڵە (ناوەندی کۆمەڵە)یان بە (مرجع)ی خۆیان دادەنا و گوێیان لەکەس نەدەگرت.

نەوشیروان لەبیرەوەریەکانیدا جەختی لەسەر ئەو خاڵە کردووە، کە بڕوای بە (کۆمۆنیزم) نییە. بڕوات بە (کۆمۆنیوم)نییە، ئەی بڕوات بە چی یە؟. کارەکەی ئەویش ئاسان نەبوو: تۆزێک لەکارەکانی (یونس بحری)دەچێت: بە شەو قەشەی گاوران و بەڕۆژ ئیمامی مزگەوتی موسڵمانان. چاوت بنووقێنیت و بەناو کێلگەی میندا پیاسە بکەیت. دوو کاراکتەرایەتی کارێکی قورسە و مرۆڤی خاوەن بیروباوەڕ و هەڵوێست رێگە بەخۆی نادات دوو کەسایەتی، دوو رۆڵی دژ بە یەکتر بگێڕێت.

ئەمیش(تێز)ەکانی مام جەلالی دووبارە دەکردەوە. راوێژکاری باوەڕپێکراوی بوو بۆ کاروباری هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە.

ئـەم هـەموو دەورە نـاکۆک و ئـاڵۆزەی ئـەو، تووشـی بـەر یەککەوتن و بەگژاچوونی سەرکردەو کادرەکانی لێدەکەوێتەوە. ئەوسا ئەو سەرکردە و کادرانە، گیانیان لەناو لەپیان دانابوو، بە کەس دەستەمۆ نەدەکران.

زۆرجـار دەیبینـی: (سـالار عـەزیز، مـەلا بـەختیار، ئـازاد هـەورامی، مـولازم عومـەر، بەندە) هەڵوێستمان لەسەر بابەتێک یـەک هەڵوێست بـوو، خیشی دەکرد، دوو سێ مانگ لـەزینۆی سـوور نەدەهاتـە خـوارەوە. جـاری وا هـەبوو بـە سـەعات کۆبوونـەوە دەکرا، بیروڕایـەک گەلاڵـە دەکرا. داوا دەکرا ئـەویش ئیمزا خـۆی بکات. کـەچی دەیگوت: مـام جـەلال هـەر بڕیارێک بـدات، ئـەوە بیروبۆچـوونی منـە. ئێمـە بـۆ ئـەوەی تووشـی بەریەککـەوتن نەبینـەوە، پێشـەکی بـن زمـانی مـام جـەلالمان تاقیدەکردەوە، ئینجا نەوشیروان بۆ کۆبوونەوە بانگ دەکرا.

# کولتووری گەرەکچێتی

## (١٥)

بارەگاکانی خڕی نێوزەنگ، تووژەڵە، زەڵێ و شێنێ مەکۆی قسەو باس و حیکایەت و چالاکی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری بوون. هەرێمەکان برینداری خۆیان بۆ ئێرە دەگواستەوە. بارمتەشیان بگرتایە، رادەستی سەرکردایەتی دەکران. گۆڤارو کتێب و بڵاوکراوەش لێرەوە رەوانە دەکرا.

زۆرجار، بەهاران، ئەگەر بەڕۆژ خۆش بوایە، پێشمەرگە و کادرەکان لەسەربان، یان بانێژەی سەرکردەیەک لەسەرکردەکان کۆدەبوونەوە! نوکتە و گاڵتە و گەپ دەورووژێنرا. نەوشیروان زۆر حەزی لە سوعبەت و قسەی خۆش بوو. بەشێک لە پێشمەرگە و کادرە دێرینەکان بەشی خۆیان دەردەسەرییان بینیبوو. بڕوایان بە تێزەکانی (ماوزەتۆن) دەربارەی (شەڕی درێژخایەن) نەمابوو. بە رێککەوتنێکی (شەڕەفمەندانە)) کرەیان دەکرد. ئەمانە لەسەرەتادا بە بەڵێنی دوو سێ مانگێک دەستبەرداری شار ببوون!

نەوشیروان رووی لە یەکێک لەدانیشتوان دەکرد: (( ئەرێ هاوڕێ (ج) ئەوە هەمزەئاغا بەڕێوەیە. ئەمجارەش لەسەر کەرکوک و خانەقین و شەنگال تێکی بدەین، یان رژێم هەرچی دا قایل بین: پارێزگای سلێمانیشیان داینێ وەریبگرین؟)).

هاوڕێ (ج): ((کاکە نەوشیروان! لەدەربەند بازیانەوە بۆ دەربەندیخان. سلێمانییە حەیاتەکە: لەدەربەند بازیانەوە بۆ دەربەندیخان: ئەوەش تەنیا بۆ ماستەکەیە!)) نەوشیروان بەم

قسه خۆشانه خەنی دەبوو. پێشمەرگەیەکی تر دەیگووت: ((کاکه نەوە! ئێمە هەقمان بەسەر کەرکوک و هەولێر و خانەقین و شەنگالەوە چییە؟ با ئەوانیش بڕۆن ناوچەکانی خۆیان رزگار بکەن!)).

سەرکردەی ناسیۆنالیست نابێ بەزەقی شارچێتی بکات. ئەو سەر زمان و بنی زمانی گەڕەکی بەرخانەقا بوو. باسی مەلکەندی، چوارباخ، دەرگەزین، عەقاری نەیدەرووژاند، بەڵام کەسێکی بەرخانەقایی بەهەموو ئەمریکا نەدەگۆڕیەوە. زۆر پێشمەرگە لەلایەن لایەنەکانی ترەوە چەک کراون. هەر کەسێک داماڵەخاس بکرایە لای ئەو جێگای سەرسوورمان نەبوو. هەولێرییەکی داماو، لە دەستەکەی شاخەوان عەباس چەک بکرایە، ئەوە دنیای ژێروو ژوور دەکرد.

ئەو بەقسە و نووسین خۆی بەکوردستانی دادەنا. کوردستانیبونەکەی هەر قسە بوو. لای من ((کوردستانیبوون)) ئەوەیە: تۆ گیان و کولتووری نەتەوەیی بەهێز بکەیت. هێزە کوردستانییەکان بۆ سەر یەک(سفرەو خوان) رابکێشیت. ((کوردستانیبوون)) ئەوەیە وەکو بسمارک یان گاریباڵدی، نیشتمانی پارچە پارچە کراو بەیەکەوە بنووسێنی.

ئەو کۆمەڵەی دوولەتکرد. لەداخی ئەو، سێ باڵەکەی یەکێتی، لەناو یەکێتی توانەوە. بەڕووکەش یەک و لەدڵەوە یەکنەبوون. لەدوا کاری سیاسییدا، یەکێتی دابەشی دووکرد و پرۆسەی سیاسیی لەگرێژەنە دەرکرد.

# میکیاڤیلی

## (١٦)

مام جەلال پێویستی بە هەموو کەسێک هەبوو، پێویستی بە کەسیش نەبوو. فووی بەهەندێ خەڵکدا دەکرد، کابرا پێیوابوو، زەوی لەسەر نووکی پەنجەی ئەودا دەسووڕێتەوە. دوای چەند هەفتەیەک دەرزییەکی پێدا دەکرد. ڕێزلێگرتن و ڕێزلێنەگرتن، پەیوەندی بە تەمەن و خەباتی و دڵسۆزی و بڕوانامەو برایەتییەوە نەبوو. چەند جارێک، بە بەرچاوی ئێمەوە، سووکایەتی بە ئەندامێکی سەرکردایەتی دەکردو پێیگووت: "هیچ و پووچ و بێکەڵک"...تاد. من و مولازم عومەر، شکاندن و بریندارکردنی ئەو ئەندامەی سەرکردایەتیەمان بە ئاماژەیەکی خراپ دانا. دوو قۆڵی لەگەڵ مام جەلال دانیشتین و بە ڕاشکاوانە، پەژارەو نیگەرانیی خۆمان دەربڕی:

ئێمە گوتمان: "هەق نەبوو بە بەرچاوی ئەو خەڵکەوە سووکایەتی بە هەڤاڵ (....) بکەیت: تەمەنی لە تۆ زۆرترەو سەری سپی کردووەو هاوڕێی دێرینی خۆتە. ئەمە بۆ خۆشت باش نییە"..

مام جەلال گوتی: "ئێوە تەمەنتان زۆر لەو کەمترە، بەڵام قەت ڕێگا بەخۆم نادەم ئەم جۆرە سوعبەتە لەگەڵ ئێوەدا بکەم. ئەزانم ئێوە چەند ڕێز لە خۆتان دەگرن، بەڵام ئەو نزیکەی سی ساڵە هاوڕێمە. ئەو خۆی حەزدەکات قسەی سووکی پێبڵێم. ئەو خۆی بۆ ئەم قسانە دەیخورێت... قسەی پێ نەڵێم ئیسراحەت ناکات"..

نمونەی پێچەوانەمان لەناو سەرکردایەتیدا ئازاد هەورامی بوو، مرۆڤێکی ڕاستگۆ، خاوەن هەڵوێست، نەیدەزانی ترس و دڵ

لەدڵدان چییە؟ ئەو سێ چوار مانگ بوو گەڕابووەوە. مام جەلال داوای کۆبوونەوەی لەگەڵ ئەندامانی ناوەندی کۆمەڵەدا کرد: بەردەوام گلەیی هەڵدەڕشت و بۆڵە بۆڵی بەسەرماندا دەکرد، بە عەرەبی دەیگوت: (قابل اني ناطور خضرة.) مەبەستی ئەوە بوو: ئەو دەسەڵاتی رەهای هەبێت و نایەوێت (داوڵ)ی بێستان بێت و ئەرکی تاراندنی چۆلەکە بێت و هیچ وەزیفەیەکی تری نەبێت.. ئەو دەیویست بە ناڕاستەوخۆ پێمان بڵێت: دەبێ ئاوی من سەر و ژوور بڕوات.. ناوەندی کۆمەڵە نابێ لەمەودوای سەرچاوەی ئاستەنگ و گرێ کوێرەو هەڵبەزو دابەز بێت. دەیویست بڵێت: چرۆچاوی کۆمەڵەم بەدڵ نییەو چالاکیەکانتان لەمەودوا هەڵپەسێرن!

کۆبوونەوەکە لەناو چادرەکەی (م.س) لەتووژەڵەدا بوو. هەر لەسەرەتاوە، هەوری گرژی بەری ئاسمانی گرتبوو: هاوار هاوار، نەڕە نەڕ، پەنجە راوەشاندن و گوتی: ئێوە زۆر بیر تەسکن، بەرچاوتان گیراوە، عصبەوین: واتە: ئێوە تەنیا دەتانەوێ کۆمەڵەچیتی بکەن و بڕواتان بە یەکێتی و کاری بەرەیی و جەماوەری نییە. ئێوە ناڕازییەکان دەهێننە بنباڵی خۆتانەوەو ئەوەی نەیەتە بنباڵی ئێوەوە دەیبوغزێنن و دژایەتی دەکەن. سەیر بکەن! ئێوە کێ لە خۆتان کۆدەکەنەوە؟ دەیان کەسی خواروگێڕ، راووڕووتکەر، گومانلێکراو، پۆخڵەوات و گەندەڵکار لە ئێوە کۆبونەوەتەوە...

ئێمە هەموو بەقسەکان پەست بووین. ئازاد گڕی گرت، وەکو بورکان تەقییەوە: شەڕە کەڵەشێر چۆنە، ئاوا دوو کەڵەشێر دەنووکیان لەیەکتری گیرکردو، پەڕی ملیان گف گف کردەوەو بەڕووی یەکتریدا هەڵدەبەزین و دەنووکیان دەوەشاند.. ئازاد

چوارمشقی دانیشتبوو. بەبێ ئەوەی مەبەستی بێت: هاتە سەرچۆک و بەرامبەر مام جەلال برگە برگە، وەڵامی هێرشەکەی مام جەلالی دایەوە: "ئێمە خەڵکی خواروگێڕ، راووڕوتکەر، گومانلێکراو، پۆخڵەوات و گەندەڵکار کۆدەکەینەوە یان تۆ؟" ئازاد ناوی یەک بەیەکی راووڕووتکەرو دزو داوێنپیسەکانی هێنا، کە کۆمەڵە دەری کردبوون و خەتی پان جێگای کردبوونەوەو پلەی سەربازی و عەسکەریی پێبەخشیبوون!

ئازاد زۆر بە گەرمی و زبری و توندی دەدوا، سوور هەڵگڕابوو، پەنجەی ڕادەوشاند، بەڵام سنووری ڕێزلێگرتن و داب و دەستووری گەورەو بچووکی نەترازاند. دەمە داسی ژەنگاویی رق و برینداركردن بەرگوێمان نەکەوت. هەوری رەشی گرژی و مۆنی، دڵۆپە دڵۆپە ساردی و سڕی بەسەرماندا دانەکرد. بەدرێژایی ئەو ماوەیە، ئازاد زووخاوی هەڵدەڕشت، برگە برگە، پەڵپ و بیانووەکانی لە بنچینەوە هەڵدەتەکاند. مام جەلال سەری بەسەر کاغەزە پەمەییە تەنکەکانی سەر جانتا دەستییە رەشەکەی داخستبوو. بەقەڵەمەکەی دەستی دەینووسی و هێڵی بەبن دێڕەکاندا دەهێنا. لە دڵی نەهات وەڵامی ئازاد بداتەوە. بانگی کرد، چا، ئاوی ساردی کانییەکە بهێنن. گرژییەکەی ڕەواندەوە!

قسە زبرو رەقەکانی ئازادم پێباشنەبوو. دەیتوانی بە بێ ئاڵەنگاری و هەستانەوەو پەنجە راوەشاندن. بەهێوری هێرشەکەی ئەو بوەستێنێت. من رەخنەی خۆمم لێگرت. ئەو هەر خۆی بەڕاست دەزانی .

ئازاد گوتی: "مام جەلال پێشمەرگەیەکی ئاسایی نییە، هەڵەیەکی نەخوازراوی سادەو بچووک و دیاریکراوی هەبێت.

ئەو سکرتێری گشتی یەکێتیە و مـن پێمباش نییە، ئەم جۆرە هەڵەیە بکات."!

من گوتم: "ئێمە با هەوڵبدەین هەڵەو کەموکورتی روونەدات."!

ئازاد گـوتی: "مـام جەلال ژمـارەیەک خەڵکـی بێکەڵـک و بـوودەڵەی لە خـۆی کـۆکردۆتەوە. ئەوانە کـاریگەری خراپیـان لەسەری هەیە."!

مـن گـوتم: "ئـێمە دوور دەگـرین و سـەرقاڵی کاروبـاری کۆمەڵەین. ئەویش حەز دەکات دەوروپشتی خۆی قایم بکات."!

ئـازاد گـوتی: مـام جەلال حەزدەکـات خەڵکـی لاواز لە دەورووبەری بێت"..

من بەسـەر سوڕمانەوە گوتم: "مام جەلال حەزی لە خەڵکی لاواز و دەستەمۆیە؟".

ئـازاد گـوتی: "تـۆ پێتـوایە مـام جەلال کتێبەکەی میکیـاڤیلی خوێندۆتەوەو زۆر باش لێی تێگەیشتووە؟"

مـن گـوتم: "وەکـو زۆربەی سیاسـییەکان دەبـێ (میـر)ی خوێندبێتەوە."..

ئـازاد گـوتی: "ئەو خـۆی بـۆی گێـڕاومەتەوە، زۆر بەوردی (میر)ی خوێندۆتەوە، لەکاری رۆژانەدا هەنگاو بە هەنگاو، بەمـوو لە ئامۆژگارییەکانی میکیاڤیلی لانـادات.. میکیاڤیلی دەڵێت: میـری بەهێز، سـەرکردەو کەسانی بەهێز لە خۆی کۆناکاتەوە، چونکە ئەوانە ئاسـتەنگ و سەرئێشـەی بـۆ دروسـت دەکەن، لە هەمـوو بڕیارێکدا بەقسەی ناکەن.

میـری بەهێـز دەبـێ سـەرکردەو کەسـانی لاوازو بـوودەڵەو دەستەمۆکراو لەخۆی کۆبکاتەوە. کەسانێک بڕیار جێبەجێکەر و قسەنەکەر بن و تەنیا بۆ ئاوخواردنەوە دەستیان بەرز بکەنەوە"..

# مام جەلال شێکاری مەنتیقی پەسەند کرد
## (١٧)

ئـازاری ١٩٨٠ ئێـران و عێـراق دەهـۆڵی شـەڕیان دەکوتـا. ڕاگەیاندنی هـەردوولا نـەوتیان بـە ئـاگردا دەکرد. دیـوی عێراق ئامادەکارییەکی فراوانـی بـۆ شـەڕ هەڵگیرساندن کردبوو. فڕۆکە جەنگییـەکانی عێراق بۆمبـارانی چەنـد خـاڵێکی سـنووریان کـرد. سەرۆک کۆماری ئێران (ئەبولحەسـەنی بـەنی سـەدر) هەڕەشەی توندی لە عێراق کرد و بەدەنگی بەرز گوتاری داو گوتی: (ئەگـەر عێراق بـەم شـێوەیە دەسـتدرێژی بکاتـە سـەر خـاکی ئێران، مـن لەمـە زیـاتر نـاتوانم بەردەم سوپای ئێران بگرم و سوپامان بۆ نـاو خـاکی عێراق لەشکرکێشـی دەکـات.. تـاد). بـۆ ڕۆژی دواتـر (سـەدام حسـێن) جەنـەڕاڵ و ئەفسـەرە گـەورەکانی کـۆکردەوەو قسـەی بـۆ کـردن و بەشـێوەیەکی گاڵتـە ئـامێز گـوتی: (رئـيس جمهورية إيران قال: العراق يعتدي على الاراضـي الايرانيـة. فـأن الجـيش الايرانـي راح يزحـف داخـل الاراضــي العراقيـة. وأنـا لا أستطيع بعد اليوم أن أقف امامهم وامنعهم من تجـاوز الحـدود داخل الاراضـي العراقيـة. أخـاف هسـه احـد مينـام بالبيـت.. الـخ). سەدام لە قاقای پێکەنینی داو ناو هۆڵەکە بووە پێکەنین.

سـەرکردایەتی ی. ن. ک لەسـەر داوای مـام جـەلال ڕۆژی دواتر کۆبوونەوەی کرد. ڕۆژێکی کۆبوونەوەکانی سەرکردایەتی (ی. ن. ک) ٢ ـ١٩٨٠/٣/١٦ی بۆ ئـەم بابەتـە تـەرخان کـرد. بیست و حـەوت ئەنـدامی سـەرکردایەتی و سـکرتێری گشـتی ئامـادەی کۆبوونەوەکە بوون. بە شێوەیەکی نیمچە بازنـەیی دانیشـتبووین. مـام جـەلال پشـتی لـەڕۆژاوابوو، مـن لـەم سـەرەوە بەرامبـەری دانیشتبووم. ئەو کۆمەڵێک زانیاری ناو عێراق و ئێرانی داینێ، کە

لەسەرچاوەی جیاجیاوە پێیگەیشتبوون. گوتی: ((زانیاری زۆرم پێگەیشتووە، کە ئێران و عێراق خۆیان بۆ شەڕ و پێکدادان ئامادە دەکەن. زۆری پێناچێت شەڕێکی قورس لەنێوان ئەم دوو دەوڵەتە بەرپا دەبێت. ئێمە دەبێت هەڵوێستمان چی بێت؟

من پێشنیاز دەکەم:

١. بەیانێک دەربکەین: ئیعلانی شەڕ دژی عێراق رابگەیەنین.

٢. پشتیوانی خۆمان بۆ ئێران رابگەیەنین.

٣. برووسکەیەک بۆ ئیمام خومەینی لێبدەین و داوای لێبکەین هەروەکو ساڵی ١٩٧٤ سنوورمان بۆ بکاتەوە، چەک و پارەی پێویستمان بۆ دابین بکات.

لە قسەکانی خۆی بووەوە. نەوشیروان لەدەستی چەپی دانیشتبوو. رووی کردە نەوشیروان و گوتی: ((کاکە نەوە رای تۆ چییە؟)).

نەوشیروان گوتی: ((مام جەلال من وەکو تۆ بیر دەکەمەوە!)).

د. کەمال خۆشناو گوتی: ((مام جەلال من هەروەکو تۆ بیر دەکەمەوە!)).

جەمال ئاغاش گوتی: ((مام جەلال من وەکو تۆ بیر دەکەمەوە!)).

یەک کەس سەرنج و تێبینی لەسەر ئەم بابەتە چارەنووسازە نەبوو!

ریزەکە گەیشتە لای من. مام جەلال گوتی: ((مامۆستا جەعفەر رای تۆ چییە؟)).

من گوتم: ((ئێستا بیست و حەوت کەس یەک بۆچوون و یەک هەڵوێستان هەیە و بیروڕای من رەنگە هیچ سوودێکی نەبێ، بەڵام لەپەراوێزی دەفتەری (مەحزەر)ی کۆبوونەوەکان بۆ مێژوو بۆم تۆمار بکەن. من پێموایە: ئەگەر بەیان دەربکەین و

ئیعلانی حەرب دژی عێراق بکەین، کۆمەڵێک کێشەو سەرئێشەی بێسوود بۆ خۆمان دروست دەکەین. بۆیە من سێ پێشنیازی پێچەوانەی پێشنیازەکانی ئێوە دەکەم:

١. گریمان ئێمە ئیعلانی حەربمان دژی عیراق راگەیاند، سوودی چییە؟ ئێمە ئێستا ئەوەندە هێزمان هەیە، کە بتوانین دێهاتەکانی خۆمان و گەلی کوردستان بپارێزین؟ بەیان دەرکردن دەبێتە بەڵگەیەکی تر بەدەست رژێمەوە، ئەو شەڕی لەناوبردن و ریشەکێشکردنمان رابگەیێنێت. ئێمە هێزێکی بچوکین و شەڕ رابگەیێنین لەڕووی کردەییەوە هیچ قورساییەکی ئەوتۆی نییە. ئێمە نە دەوڵەتین، نە هیچ دەوڵەتێک پشتوانیمان لێدەکات! بۆ گەلی کورد تووشی کارەساتێکی گەورەتر بکەین؟

٢. بەیانی پشتیوانیمان بۆ ئێران بڵاوکردەوە، سوودی چییە؟ بە بڵاوکردنەوەی بەیانێک ئێران سیاسەتی گشتی خۆی بەرامبەرمان دەگۆڕێت؟ تا ئێستا ئێران سیاسەتی دەستخەڕۆکردنی بەرامبەرمان گرتۆتە بەر. رێگا نادات چەک و تەقەمەنی و یارمەتیمان لەرێگەی تارانەوە پێبگات. ئایا ئێران ئامادەیە سیاسەتی خۆی بگۆڕێت و دەرگاکانی بکاتەوە، ئەگەر دەرگاکانمان لێ نەکاتەوە بەیانەکەمان بارمان سووک ناکاتەوە؟

٣. برووسکەش کاریگەری ئەوتۆی نییە. خومەینی و حکومەت رۆژانە سەدان بروسکەیان بۆ دەچێت، رەنگە ئەوان نەتوانن نیوەشی بخوێننەوە!

من هەرچی نووسین و بەیان و برووسکە هەیە بەراستی نازانم! ئێمە نابێ بۆ (هیچ)، بەڵگەی زۆر ترسناک بەدەستەوە بدەین. با شاندێک رەوانەی تاران بکەین. بەدانوستان و گفتوگۆ پەیامەکەمان رەوانە بکەین و بزانین کاردانەوەی ئەوان چی دەبێت؟

قسەکانم تەواو کرد، مام جەلال زۆر ئازایانە دەستی راستی بەرز کردەوە و گوتی: ((من سەد لەسەد لەگەڵ بیروڕای مامۆستا جەعفەرم! بەڕاستی پێشنیازەکەی باشترەو من وەکو ئەو بیر دەکەمەوە!)).مام جەلال یەکەمین جار رووی کردە نەوشیروان و گوتی: ((کاکە نەوە تۆ چۆن بیردەکەیتەوە؟))

نەوشیروان گوتی: ((مام جەلال من وەکو تۆ بیر دەکەمەوە!)).

رووی کردە دکتۆر کەمال خۆشنام ((دکتۆر تۆ رات چییە؟)).

ئەویش گوتی: ((مام جەلال من وەکو تۆ بیردەکەمەوە!)).

هەر بیست و شەشیان یەک رستەیان دووپاتکردەوە:

((مام جەلال من وەکو تۆ بیردەکەمەوە!)).

شاندێکی دوو کەسی ناونووس کران (عومەر دەبابە و د. فوئاد مەعسوم)،

سەردانی تاران بکەن و پەیامی نەنووسراوی شۆڕش پێشکەشی حکومەتی ئێران بکەن.

سێ رۆژی پێنەچوو(بەنی سەدر) فڕۆکەیەکی هەلیکۆپتەری رەوانەی سەردەشت کرد و مام جەلال بە پێشوازییەکی گەرم بەرەو تاران رەوانە کرا. لەوێ چاوی بە خومەینی و بەنی سەدر و سەرۆک وەزیران و رەفسەنجانی و لێپرسراوە گەورەکانی ئێران کەوت.

لێکۆڵەرێک گفتوگۆکانی مام جەلال لە تاران لەبەرچاو بگرێت، ئاستی بابەخدانی ئێران بە سەردانەکەی بۆ دەردەکەوێت. هێزە کوردستانییەکانی ئەودیو زۆر نیگەران بوون. مام جەلال دەیتوانی خۆی لەگفتوگۆی رۆژنامەوانی بپارێزێت. رۆژگار دەریخست ئێران ئەجێندای خۆی لەناوچەکەدا هەیە و گفتوگۆی رۆژنامەوانی کاریگەری بنەڕەتیی لەسەر بەرنامەو بیرکردنەوەی ئەوان نابێت.

# کۆمەڵە لە ئاوێنەی مێژوودا
## (١)

ئەم نووسینە سادەیە، بیرەوەرییەو نامەی دکتۆرا نییە، سەری هارو مار جێگایان تێدا بکرێتەوە. رووبەری بیرەوەری زۆر جیاوازە لە نامەیەکی زانستی، کە زانستکار، دەبێ وەکو هەڵۆ لەبەرزاییەوە بڕوانێتو خۆی تێکەڵاوی رووداوەکان نەکات. نووسەری بیرەوەری، بەشێکە لە رووداوەکانو ناتوانێت بێلایەن بێت. من بەلای مێرگو کانیاودا وەکو رێبوارێکی ماندوو تێپەڕیوم: پشوویەکی کورتو قومێک ئاوم هەڵگۆزیوە. هونەرمەندێک نەبووم، بە فڵچەو رەنگی زەیتی، دیمەنەکە بۆ سەر تابلۆ بگوازمەوە!

ئەوەی راستی بێت، لەکاتی نووسینی پاژێکی رووداوەکاندا، گابەرد، کەندولەند سەرە رێگایان لێگرتبووم، نەمتوانی بەسەریاندا قەڵەمبازێک بدەم. ناچاربووم لەبن تاوێرو نوادا بوەستم، پێچێکی بۆ بکەمەوە، بۆئەوەی دڕکو داڵی بێسنوور، لەخۆڕا هەڵنەشێلم. بەپێویستم زانیوە، تیشک بخرێتە سەر پاژێک لە کاراکتەرە دیارو ناودارەکان، کە تەلاری کۆمەڵەیان بەرزکردەوە، ناتوانرێت ئێستا ئەوان لەسەر شانۆی رووداوەکاندا ببینرێن. من هەوڵمدا، تارماییەکان بێنەوە زمان، یەکە بەیەکەیان، لەسەر وێستگە جیاجیاکانی گەشەکردنی کۆمەڵە زانیاری پێشکەش بکەن.

مـن ئەو مـافەم بەخـۆم نەداوە خـوێنەری ئـازیز، بەدیـار تەلیسمو داستانو مەتەڵە هەڵنەهێنراوەکانەوە، بەسەرسوڕمانەوە دۆش دابمێنێت: کێشەی تێگەیشتن، ئاستەنگ بۆ پەندوەرگرتن لە ئەزموونەکـــانی رابـــوردوو ســـــەرهەڵبدات. مـــن ئەوانەم بەسـەرکردۆتەوە، کە ماڵئاواییان لە ژیان کردووە، یان ئەوانەی نیو سەدەیەک بێدەنگییان هەڵبژاردووە. بۆچی، من سـەرجەمی کەسایەتیو سەرکردەکانم بەسەرنەکردۆتەوە؟

ئەو سـەرکردانەی تەندروسـتییان باشـە، لەمن باشـتر کوردی دەزانـن. ئـامرازی نووسـینو چـاپو بڵاوکـردنەوە بـۆ ئەوان، رەشـەبای گرە، سـەبوونو قـاتوقڕیی، بەسـەریاندا تێنەپەڕیـوە. گوڵزاری بیرەوەریی ئەوان وەکو گوڵزاری بیرەوەریی من نییە، سیسو ژاکاو بێت. هەر ئەمڕۆ دەتوانن لەپشـت مێز دابنیشـنو بنووسنو شا بە سەپان رانەگرن!

کـۆمەڵە (١٩٧٠/٦/١٠) پـاش پێـنج شـەش مانگێـک ژانگـرتن، دیالۆگ، بیروڕا گۆڕینەوەو یەکتری بینین، لە پایتەخت دامەزرا. هەلومەرجـی ئەوکـاتە وابـوو، بەڵگەنـامەو نووسـین، پـاش خوێندنەوە، دەگەڕێنرایەوە بۆ ئەو کەسەی رێکخەر، یان ئەڵقەی پەیوەندی بوو. ئەفسوس، ئەمڕۆ لە ئەرشیفی (ی.ن.ک) یەک لەتە کاغەزی ئەو سەردەمە لەبەردەستدا نییە!

ئەم رێکخراوە پاش بیست ساڵ، لەناو مەنجەڵی زنجیر لەملی یەکێتیدا خۆی تواندەوە. سـەرکردەکانی کۆمەڵە حەزیان دەکرد، بەزووتـرین کـات کـۆمەڵە هەڵبوەشـێتەوە. گرووپەکـانی تـری نـاو

یەکێتیش وایاندەزانی کوانیان* لێهاتووە، دەبێ ئەو کوانە زوو نەمێنێت.

ئێمە بمانەوێت و نەمانەوێت، ئەمەش پاژێکە لەمێژووی خەباتی سیاسی گەلی کورد. هەندێ جار رووداوی یەک ساڵ، ئەوەندەی مێژووی سەد ساڵ گرنگە. لەم رۆژهەڵاتەدا مێژوو: کتێبێکی ئەفسووناوی بەتاڵو بێسوودە، لاپەڕە زەردهەڵگەڕاوەکانی لەسەر رەفەی تەپوتۆزاویدا رادەستی مشکو مۆرانەو مارمێلکە کراون، ئەوانیش جێگای خۆیانی تێدا بکەنەوە.

مێژوو: نووسینی ئەزموونی گەلانە. ئەم ئەزموونەی ئەمانە هەیانە، لە هیچ کتێبێکدا نییە (نزهە الالباب فیما لا یوجد فی کتاب)**

هەرلایەک دەیەوێت، لاپەڕەکانی مێژووی خۆیو دراوسێو ئاشناو رۆشنا پووش بەسەر بکات. گەلانی پێشکەوتوو، لەسەر شانی مێژووی دوێنێیان هەڵنیشتوون. خاڵ بەخاڵی لایەنی لاوازو بەهێزی مێژووی خۆیان لەبەرچاوە. ئەدی ناسنامە چییە؟ ئەو شانازی بە شکسپیرو دانتیو پووشکین و گوێتەوە دەکات. زانکۆ، دامەزراوە زانستییەکانو راگەیاندن، بە پشتبەستن بە ئەرشیفو کتێبخانە دەوڵەمەندەکانیان، لەسەر دیاردەو قۆناخەکانی ئێستاو رابوردوو کاردەکەنو ناسنامەیان شکۆدارتر دەکەن، ئەزموونە دەوڵەمەندەکانیان دەوڵەمەندتر دەکەن.

---

* کوان: دومەڵ. کوان لێهاتن: دومەڵ لێهاتن.

** نزهە الالباب فیما لا یوجد فی کتاب- تألیف: شهاب الدین أحمد التیفاشی.

# دامەزراندنی کۆمەڵە
# (٢)

پێشەکی دەمەوێ ئەوە بنووسم، بەسەرکردنەوەی ئەم بابەتە بۆ من پاژێکە لەمێژوو، نەک پرۆژەیەک بۆ داهاتوو بێت. هەڵسەنگاندنی ئەزموونێکە، بە لایەنی ئەرێنی و نەرێنییەوە، نامەوێ لایەنگری لەلایەک دژی لاکەیتربم. با خۆشم رۆژێک لەرۆژان پاژێک لەزۆران و ململانێکانی ئەو سەردەمە بووبم و بێ لایەن نەبووبم. ئەمڕۆ بە قەڵەمێکی زانستیانەی بێلایەنەوە، بەسەر لاپەڕە شاراوە پەرش و بڵاوەکانی ئەو مێژووەدا دەچمەوە.

کۆمەڵە ساڵی ١٩٧٠ پێکهات. مام جەلال سەرەتا دینەمۆی بزاڤەکە بوو. دەستەی دامەزرێنەر وەکو لە بەشی یەکەمدا ئاماژەی پێکراوە؛ ئەم شەشە بوون(١ـ مام جەلال ٢ـ شەهابی شێخ نووری ٣ـ فوئاد قەرەداخی ٤ـ فازیلی مەلا مەحموود ٥ـ فەریدوون عەبدولقادر ٦ـ دلێر سدیق کۆیی). رەنگە یەک خاڵ ئەم شەش کەسەی لەناو یەک رێکخراودا کۆکردبێتەوە: پێشینە و باکگراوندی بیری نەتەوەیی، ئەمانەی لەیەکەوە نزیککردبێتەوە. ئەم گروپە گوایە: لەناو بزاڤی نەتەوەییش، باڵی چەپی ئەوانە بوون، نێویان بە باڵی (م. س) رۆیشتبوو. ئەمانە بە قەڵەمبازێک لەبیری نەتەوەییەوە لەسەر زینی ئەسپی ئایدیۆلۆژیای (ماویزم) خۆیان شەتەک دەدا.

مـــام جـــەلال لـــە (جیڤـــاریزم)ەوە بـــۆ (گەشـــەکردنی نـــا سـەرمایەداری)* ڕێبـاز گـۆڕکێ دەکـات. سـاڵی ١٩٦٧ ژمارەیـەک لـەسەرکردەکانی(سـازمان انقلابـی) لـە ئۆروپـاوە بـۆ بـەکرەجۆ دێنەوە. ئەوان پەیوەندییان بە ئیسماعیل شەریفزادە و عەبدوڵڵای موعینی و مەلا ئاوارەوە هەبووە.

گروپـی (سـازمانی انقلابـی) زۆربـەیان یـەک دوو زمـانی ئۆروپیـان دەزانـی و شـارەزایی باشـیان لـە ئـەدەبیاتی مارکسـی هـەبووە. زۆربـەیان سـەردانی بـەیژین و تیرانـا و هاڤانایـان کردبوو. دەروێشی ئەندێشەی (ماوزەتۆن)بوون و نووسینە کۆن و نوێکـانی ماویـان ئەزبـەر بـوو. یـەکێکی وەکـو د. کـورش لاشـائی(د. جـەلال) کـە دکتـۆرێکی دانیشـتوی موینشـنی ئەڵـەمانیا بـوو، فێـری کـوردی بـووەو بـەکوردی گوتـاری نووسـیوە. مـام جەلال تەریقەتی مـاویزمی لەمانـەوە وەرگرتـووە. لایـەنگرانی مـام جـەلالیش دەکەونـە بـن کاریگـەرێتی شـەپۆلی مـاویزم، کـە لـە سـۆنگەی شۆڕشـی خوێندکارانـەوە، سەرانسـەری ئۆروپـای تەنیبووەوە، وەکو ئەفسانە و بەروێنەی لاوان دەردەکەوت.

ئێمە هیچ لێکۆڵینەوەیەکی زانستیمان لەسەر ئەوە نییە بۆ مـام جەلال لەماوەی نێوان ١٩٦٧ ـ ١٩٧٠ بـەو حـەماس و گـەرمییـەوە ڕوودەکاتە ماویزم؟

---

* گەشەکردنی نا سەرمایەداری: التطور اللاراسمالي. ئەمە ڕێبازی مۆسکۆو پارتیە کۆمۆنیستیەکانی ((جیهانی سێیەم) بوو. وڵاتی وەکو میسرو عیراق و... بـە سـەرکردایەتی جـەمال عەبدولناسرو عەبدولسـەلام عـارف دەتـوانن حزبێکی یەکێتی سۆسیالیستی (الاتحاد الاشتراكي) دابمـەزرێنن و دەوڵەتـەکە بکەنـە دەوڵـەتێکی سۆسیالیسـتی، بەبـێ ئـەوەی بـە قۆنـاخی سـەرمایەداریدا تێپەڕن..

- تەنیا کاریگەری(سازمان انقلابی) بووە؟

- ململانێ لەگەڵ پارتی - باڵی بارزانی پێویستی بە چەترێکی ئایدیۆلۆژی رەنگاورەنگ چەپ و مۆدێرن بووە، بۆ ئەوەی بیانوویەک بۆ ململانێی چەکدار بدۆزرێتەوە. گوایە کێشەی نێوان باڵی (م. س) و پارتی بیرو ئایدیۆلۆژیاو چەپ و راستە؟

- باڵی (م. س) لایەنی کەم دوو باڵ بوون. راستە جوڵانەوەکە ناوی لێنرابوو جەلالی، بەڵام باڵی راستڕەو گەمارۆیان خستبووە سەر ئەم و چالاکییەکانی سنووردارکرابوون. ئایا ویستویەتی لەناو باڵی (م. س) هیچ نەبێت بۆ خۆپاراستن فراکسیۆنی خۆی هەبێت؟

سەرکردەکانی کۆمەڵە هەڵگری ئاڵای ئایدیۆلۆژیا بوون. یەکەم گۆڤاریان ناوی (ئاڵای سوور)بوو. لەڕووی تیۆرییەوە، بە شێوەیەکی گشتی، شارەزاییەکی ئەوتۆیان لە جیاوازییەکانی نێوان لینین و پلیخانۆف و رۆزا لۆکسمبورگ و گرامشی نەبوو. لەشیکاری سیاسی و تیۆریی کۆمەڵایەتییەوە دووربوون. دڵنیام کەسیان نەیاندەزانی (تیۆری فاشیزم) چییە؟ (تیۆری دەوڵەت) چییە؟ دەربارەی بیری نەتەوەیی و بزاڤی نەتەوەیی چەند فێرگە هەن؟ لە ئەدەبیاتی (چینی) هەندێ دەستەواژەو تێگەیشتن و چەمک دەکوردێنرا و تۆزێکیش دەکوڵێنرا و پێشکەشی دەرویشانی ئایدیۆلۆژیا دەکرا.

ئەم گروپە بەدرێژایی تەمەنی خۆیان نەیانتوانی لێکۆڵینەوەیەکی ئەکادیمی ـ زانستی ، دەربارەی سروشت و تایبەتمەندی کۆمەڵی کوردستان، گەشەکردنی ئابووری و ململانێی گروپە کۆمەڵایەتیەکان لەسەر بنەمای خەباتی چینایەتی، پێشکەش بکەن، نەیانتوانی دەقێکی خۆماڵیی زانستی

تێــرو تەســەل بەرهــەمبهێنن. ئــەوان دەچــوون دەقــەکانی (ماوزەتۆن)یان وەردەگێڕا. کاڵا بە قەد باڵا نەبوو.

نزمیی ئاستی تیۆریی گشتی، دەرگای گفتوگۆو((مشت و مڕ)) لــەریزەکانی کۆمەڵــەدا جیــاوازی و ناکۆکییــەکانیانی بــەرەو تەقینــەوە بــرد. ســاڵی ١٩٧٢ دووان لــە ئەنــدامانی دەســتەی دامەزرێنــەر: (فــازیلی مــەلا مــەحموود، فوئــاد قــەرەداخی) وێــڕای ژمارەیــەک کــادرو ئەنــدام، یەکــەم دوو لــەتبوونیان لە مێــژووی کۆمەڵەدا راگەیانـد، لەسـەر بنـەمای (یـەک دەوڵـەت: یـەک چینـی کرێکار: یەک حزب) بەرامبەر هێڵی سیاسیی کۆمەڵە پرینگانەوە. لایەنی دووەم: سوور بوو لەسەر (یـەک نەتـەوە: یـەک فەرهـەنگ: نەتـەوەی بندەسـت: نەتـەوەی داگیرکـراو: پێویسـتی بـە حزبێکـی کرێکارییــە: خــەباتی نەتــەوەیی و چینایــەتی پێکــەوە گرێبــدات: خــەباتی نەتــەوەیی پــێش خــەباتی چینایــەتی.. تــاد). پــارتی کۆمۆنیســتی عیـراق، وێـڕای کێشــە نـاوخۆیی و سـتراتیژیەکانی خـۆی، لــەتێڕوانینی بـۆ کێشــەی گــەلی کوردســتان، فەرهــەنگی شـۆڤێنیی گـەلی سەردەسـتەی کـاوێژ دەکـردەوەو نەیـدەتوانی (تێزە)ی شۆڤێنیزمی دەسەلاتی عەرەبی تێپەڕێنێت.

کۆمەڵـە ڕێکخستنێکی پۆلایین نـەبوو. گروپێکی روونـاکبیری رەخنەگری ناسیۆنالیستی تووڕە بوو. ئەندامـەکانی لـەچاو هـەلو مەرجی رۆشنبیری ١٩٧٠ ـ ١٩٧٥ لـە ئاسـتێکی سیاسـی باشتردا بوون، بۆ نمونە: لەچاو ئەندامانی پارتی کۆمۆنیست، کە هـەردوو باڵەکە خۆیان خزاندبووە بنبەستێکەوە، ئەوسەری دیار نەبوو.

سالار عەزیز بۆی گێڕامەوە:

((شەهابی شێخ نووری ڕەخنەیەکی توندی لە شاسوار جەلال (ئارام) گرت: تۆ تائێستا توانیوتە یەک ئەندام بۆ کۆمەڵە پەیدا بکەیت؟

ئارام گوتی: ئەگەر ئەندام پەیداکردن وەکو ئەوانەی تۆ بن، من دەتوانم ڕۆژی پەنجا ئەندام پەیدا بکەم..)).

دیارە ئەم ڕستەیە، من بە باری (پۆلیمیک)* دا شیکاری بۆ ناکەم. دیارە هەردوولا هەر تێڕوانین و تێگەیشتنی خۆی بۆ ڕێکخستن هەبووە. هەردوولا لە شێوەی کار و چالاکیی یەکتر ناڕازیبوون.

---

* پۆلیمیک: polemic : پەلامارێکی بێ بنەما لەکاتی بیروڕای جیاوازو بە مەبەستی بێدەنگ کردنی بەرامبەر.

# دروشم و راستی
## (٣)

هاوڕێیەک (ئازاد خۆشناو) بۆی گێڕامەوە: ڕۆژانی کارەساتی ئازاری ١٩٧٥ (کۆمەڵە بڕیاری چەک دانەنانی دابوو: شۆڕش درێژەی پێ بدرێت. من پەیامی مام جەلالم پێڕاگەیاندن، کە دەبێ بەرەنگاری بکەن. دوای کۆبوونەوەکە یەکێک لەسەرکردەکانی کۆمەڵە بانگی کردمە ئەملاوەو پێیگوتم: تۆ مافی پەنابەریم لەئۆروپا بۆ وەربگرە، ئینجا دەتوانین پتر لەسەر بابەتەکان بدوێین!)).

پاش گەڕانەی سەرکردایەتی کۆمەڵە بۆ ناو شار، بەیانێک بڵاوکرایەوە: گوایە: (ناکۆکی سەرەکی ئێمە لەگەڵ ئیمپریالیزم و زایۆنیزمە. ناکۆکی ئێمە لەگەڵ ڕژێمی بەغدا ناکۆکی لاوەکییە..). ئەم ڕستەیە ڕێ خۆشکردن بوو بۆ ئەوەی لەگەڵ ڕژێمی بەغدا سازش بکرێت و بەشداری لە حکومەت بکرێت. سەرکردایەتی لە سروشتی ڕژێمی پێشوو تێنەگەیشتبوو. ئەوانە نەک هەر لە (تیۆرییەکانی فاشیزم) سوودیان وەرنەگرتبوو، بڕواناکەم کەسیان تاقەتی خوێندنەوەی کتێبەکەی مارکس (١٨ برومیر)ی هەبووبێت، یان چەند سەعاتێکی بۆ خوێندنەوەی کتێبەکانی گرامشی تەرخان کردبێت. بۆیە لایان ئاسایی بوو، ڕژێمی پێشووی عێراق، بە ((ڕژێمێکی نیشتمانی)) دابنرێت، کە گوایە: دژی ئیمپریالیزمی جیهانی چۆتە سەنگەرەوە. کەسانێک بەم پێوەرە نازانستیانە جیهانبینی خۆیان ڕەنگاوڕەنگ بکەن، دەبێ

درەنگ بێت یان زوو باجی تێگەیشتنی میکانیزمەکانی داگیرکاری و هاوکێشەی پاشکۆیەتی فەرهەنگی بدەن.

پاش گرتنی ئەنوەر زۆراب و درامای بۆ ئێران رۆیشتنی سەرکردایەتیی کۆمەڵە. ئینجا قەوارەی راستەقینەی رێکخستنی کۆمەڵە بە ڕوونی دەرکەوت. نە هێڵی دووەمی سەرکردایەتی* ئامادەکرابوو، نە پەناگا بۆ شاردنەوەی ئەوانەی مەترسی گرتنیان لەسەرە، نە تەکنیکی دروستکردنی ناسنامەی ساختە، نە پارە، نە چەک و تەقەمەنی... تاد.

### مانەوەو ناودیوبوون

**هەڵەی یەکەم:** ئەنوەر زۆراب زانیبووی دەگیرێت. یەک مانگ خۆی بزر کردبوو. پاش یەک مانگ بۆ سەرکار گەڕابووەوە. هەر وەکو ئەوەی هیچ روونەدابێت: نەبا هەڵیکردبێت و نە باران باریبێت. هەڵەی کوشندە ئەمەیە پێتوابێت رژێم نووستووە! سەرکردایەتیەک نەتوانێت، ئەندامێک بۆ چەند مانگێک بشارێتەوە، دیارە ئەمانە رژێمیان بە مەترسی دانەناوە و پێیانوابووە، ئەوان لەبەر خاتری ئەو بەیانەی دەریان کردبوو، کەسیان لێناگرێت و ڕژێم هەر کەسێکیشی گرت، لە گوڵێک کاڵتری پێناڵێت!

**هەڵەی دووەمیان:** ئەوە بووە، ئەنوەر زۆراب هەموویانی ناسیووە! ئەویش دەمانچە و لیستی ناوەکانی لابووە، پاش گرتنی بە یەک دوو رۆژ، بەدەستبەسەری و کەلەپچەکراوی

---

* سەرکردایەتی رادەستی ئەبو شەهاب (ئیحسان نەجم) و عومان نانەواو عەبدولڕەزاق کرابوو...تاد

گەڕاوەتەوە بۆ ماڵەوە و هەرچی کاغەزو و نامە و دەمانچەی لابووە، رادەستی کردوون.

**هەڵەی سێیەم:** نەیانتوانیوە دوو هەفتە لە سلێمانی یان هەولێر بمێننەوە. وڵاتێکی پان و بەرین لێیان بۆتە چەرمی چۆلەکە. ئارام، سالار، ئازاد و مەلا بەختیار نێزکی دوو ساڵ، ساڵ و نیوێک لە سلێمانی مانەوەو هیچیش روونەدا. بە مەرجێ ئەمانە زۆر چالاک بوون، پەیوەندییان بە ئەندام و شانە پچڕاوەکانەوە دەکرد. چەک و تەقەمەنی و پارەیان کۆدەکردەوە.. ئەمانەیش دەیانتوانی، تاک تاک لەشارو لادێ خۆیان قایم بکەن، کەچی بە کۆمەڵ بۆ ئێران رۆیشتن، کە ئەویش هەڵەیەکی کوشندە بوو. وڵاتێکی پان و بەرین جێگای خۆ حەشاردانی هەزاران کەسی تێدا دەبێتەوە. ئەگەر بە رێکەوت یەکێکیان بگیرابایە، زیانێکی بچووکتربوو، لەچاو ئەوەی، بەخڕی، بەردەستی رژێمی فاشی بکەون.

شاسوار جەلال(ئارام)و هاوڕێیانی (کۆمیتەی هەرێمەکان) بە ماوەی دووساڵ بوونە ئەفسانەیەک لەناو خەڵک! کەسانی تر لەماوەی نیو سەدەدا نەیانتوانی یەک لەسەدی ناوبانگی ئەوان وەدەستبهێنن. ئارام دەیان لێکۆڵینەوەو گوتاری نووسی. رۆژانە چەندین کەسی دەبینی و کەرستەی شۆڕش هەڵگیرساندنی پێکەوە دەنا. سالاریش وەکو ئارام، دەستەوەستان لەماڵەوە دانەنیشت تا چاوەڕوانی ئەوە بێت ((کەسێک)) لە مەریخەوە دابەزێت شانەکان بە یەکەوە گرێبدات و ئامادەکاری بۆ چەک و تەقەمەنی پەیداکردن و دەستەی چەکدار یەک، لەدوای یەک رەوانەی شاخ بکات. مەلا بەختیار: بزێوترین کوردی ئەو سەردەمەی دژی رژێم بوو. ئەمڕۆ لەبناری گمۆ بەشداری لە

چـــالاکی پێشـــمەرگانە دەکـــرد. دوای دوو ڕۆژ لـــە بەغـــدا سەریهەڵدەدا. بەسەر دهۆکەوە بۆ سلێمانی دەگەڕایەوە، وێڕای چوار پێنج پ. م تەقە لەپارێزگاری سلێمانی دەکات، بەبێ ئەوەی بە تـەواوی شـارەزای کۆڵانـەکانی شـاربێت. ئـازاد هـەورامی بـە (٢٠) ساڵان ڕێکخستنی کەرکوکی گرتەوە. بەشێک لەهاوڕێکانی دوو تەمەنی ئەویان هەبوو. کەچی هـەموویان ئـەمیان بـە ((ریـش سپی))و دەمڕاستی خۆیان دادەنا!

# شیهابی شێخ نوری
## (٤)

شـیهابی شـێخ نـوری (١٩٣٢-١٩٧٦) یەکێـک لەئەنـدامانی دەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵەی مارکسی- لینینی کوردستان، ئەندێشـــەی ماوتســـیتۆنگ (کملــک) بـــوو. ئەو لەڕووی کـــاری رێکخســـتنەوە، دینەمـۆی ئەڵقەی رۆشـنبیریو شـانەو کۆمیتەی شـــارەکانی ســـەرەتای دامەزرانـــدنی کـۆمەڵە بـوو. لەسـۆنگەی ئەوەی پیاوێکی سادەو خاکی بوو پەیوەندی کۆمەڵایەتی بەهێز بـــوو، تـــوانیی ســـەرنجی زۆربەی ئەنـــدامان بـــۆ لای خـــۆی رابکێشـێتو زەمینە بـۆ ئەوەش خـۆش بکـات، وەکو کەسایەتی ژمارە یەکی خەباتی ژێرزەمینی دەربکەوێت دوای رۆیشتنی مـام جەلال بـــۆ بەیـــرووتو جیـــابوونەوەی گروپـــی (عێراقـــی) کە دیارترینیـــان فوئـــاد قەرەداخـــیو فـــازیلی مەلا مەحمـــود بـــوون، شـیهاب وەکـو سـکرتێرو هەڵسوڕێنەری ئەو رێکخـراوە سـاوایە شوێن پێی خۆی قایم کرد.

ئەم بە بەردەوامـی پەیوەنـدی تونـدوتۆڵی لەگەڵ مـام جەلالـدا هەبـــوو. پەیـــامو رێنمـــاییو زانیـــاری لەوەوە وەردەگـــرتو کاریگەرییو هەژموونی لەم رێگایەوە رەگی دادەکوتا. تا رۆژی رۆیشتنی خۆیو ئەندامانی سەرکردایەتی بۆ ناو خاکی ئێرانو گرتنیان لەوێ، ئەم بڕیاردەری بێ رکابەری رێکخراوەکە بوو.

شـــیهابو ئەنـــدامانی ســـەرکردایەتی، لەبـــری دەربـــازبوون، لەخـــۆڕا بە داوی پۆلیســـی ئێـــرانەوە بـــوون. دەوڵەتـــی ئێـــران

بەشێوەیەکی درامیی دڵتەزێن رادەستی جەلادەکانی کردنەوە. ئیعدامکردنی شیهاب، جەعفەرو ئەنوەر (١٩٧٦/١١/٢١) بووە رۆژی ناساندنی کۆمەڵەو نەفرەتکردن لە رژێم. ئیدیۆمی باوی ناوچەی سلێمانی (کەم بژیو کەڵ بژی) کە شیهابو هاوڕێکانی بە بەردەوامی دووبارەیان دەکردەوە، بەدرێژایی ساڵانی شۆڕش لەزیندانو شاخو شار، بووە ویردی سەر زمانی لاوانو شۆڕشگێران، بەتایبەتی ئەوکاتەی لاوان، بەعیشقەوە، بەپیری مەرگەو دەچوون.

شیهاب*: دووەم کوڕی شاعیری ناسراو شێخ نوری شێخ ساڵحە (١٨٩٦-١٩٥٨). ئەم وێڕای دوو ئەستێرەی گەش (رەشید نەجیبو عەبدوڵڵا گۆران) سێ شۆڕەسواری دیار بوون، کە هەریەکەیان بەشێوازی خۆی، سەرەتای بیستەکانی سەدەی بیستەم، شۆڕشێک بوون، کۆتو بەندی کلاسیکیان تەقاندەوە، بەشداری چالاکانەیان لە نوێکردنەوەی شیعری کوردی کرد. تا ئەمڕۆش جێگە پەنجەیان بە بیناو پەیکەری شیعری کوردیەوە دیارە.

رەنگە هەڵە تێگەیشتنێک لەسەر پرسی خزمایەتی نێوان شیهابو شاسوار جەلال (ئارام) رووبدات. دوو ئامۆزا دوای یەکتری سەرکردایەتیو رابەرایەتی کۆمەڵەیان بەدەستەوە بووە. دوور نییە شیهاب راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ لەڕووی

---

* زۆربەی زانیاریەکانم لەسەر شیهابی شێخ نوری لە فوئادی مەجید میسری، سالار عەزیز، مەلا بەختیارو شێخ ئەشرەف تاڵەبانیو خەباتی شێخ جەناب وەرگرتووە.

کەسایەتیەوە، لەقۆناغی منالّی یان مێردمنالّی کاریگەریی لەسەر شاسوار جەلال هەبووبێت. زۆرجار لەرۆژهەلاتدا هەلّوێستی سیاسیی خزمێک رەنگدانەوەی خۆی لەسەر سەرجەمی ئەندامانی بنەمالّەکەیان دەبێت. ئەم هاوکێشەو رایەلّەیە لەنێوان شیهابو ئارام، لایەنی کەم، پاش سالّی ١٩٧٠، چوارچێوەیەکی جیاوازی وەرگرتووە. دوو ئامۆزا، هاورێو هاوسەنگەرو دۆست بوون، بەلام لەسەر زۆر بابەتی سیاسیو فیکری ناکۆکو دژی یەکتری بوون!

هەردووکیان کۆمەلە بوون، کوردستانی بوون، پێشتر لەناو بالّی (م.س) بوون، لەبن کاریگەری ئەندێشەی ماوزەتۆن بوون، بەلام جیاوازی (١٤) سالّ تەمەنو جیاوازی ئاستی خوێندن، شیهاب (بروانامەی ناوەندی)، شاسوار (بروانامەی بەکالۆریۆس لە کۆلێجی بازرگانی بەغدا). یەکێکیان زۆری دەخوێندەوەو زۆری دەنووسی، ئەمەیکەیان کەمتری دەخوێندەوەو پشکی شێری کاتی خۆی بۆ پەیوەندی کۆمەلایەتی تەرخان دەکرد.

پلەی خزمایەتیان بەمشێوەیە بووە:

- شیهاب شێخ نوری شێخ سالّح شێخ عەبدولغەنی شێخ عەبدولقادری بەغدادی.
- شاسوار جەلال شێخ سەعید شێخ عەبدولغەنی شێخ عەبدولقادری بەغدادی.

بەغدادی لەچیەوە هاتووە؟

شێخ عەبدولقادر یەکێک لە شێخە بەرزنجەییەکانی قادری. سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم رێبازگۆرکی دەکات، تەریقەتی

قـادری بە نەقشبەندی دەگۆڕێتەوەو دەبێتە یەکێک لە خەلـیفە نزیکەکانی مەولانا خالیدی نەقشبەندی (١٧٧٩-١٨٢٧). مـاوەیەک لە بەغدا، شێخ عەبدولقادر جێنشینی ئەو بووەو لەسۆنگەی ئەم پلەوپایەیە نازناوی بەغدادیی پێبەخشراوە.

شێخ ئەشرەفی تاڵەبانی، کە ماوەیەک لەنزیکەوە ئاشنایەتی لەگەڵ شیهابدا هەبوو، ساڵی ١٩٧٢ ناکۆکی‌و جیاوازیی بیروڕای لەگەڵ بـاڵی کوردسـتانیدا هەبـووە ئەم یەکێـک لە دەمڕاسـتو سـەرکردەکانی بـاڵی (عێراقـی) بـووە. بەمشـێوەیە وەسـفی ئەو دەکات: "شەهید شیهاب مرۆڤێکی کارامەو کردە بوو. زۆر ئازا، خـۆڕاگر، خۆنەویسـت، سـادە. لەڕووی کـۆمەڵایەتییەوە پەیوەنـدییەکی فراوانـی لەگەڵ تێکۆشـەرانی کـوردو عەرەبـی عێراقیـدا هەبـوو. دەیتـوانی زوو بچێـتە دڵـی خەڵـکەوە. لە دروستکردنی رایەڵەو شانەو ئەڵقەی رۆشنبیریدا دەستێکی باڵای هەبوو. لە (مشتومڕی سیاسی)دا پیاوێکی نەرمونیان بوو. زۆر رێـزی بەرامـبەرەکەی گرتـووە، بەڵام لەڕووی رۆشـنبیری‌و تیـۆرییەوە وەکـو مامۆسـتا جەعـفەر عەبدولواحیـدو شاسـوارو فوئاد قەرەداخی‌و فازیلی مەلا مەحموود نەبوو.."

شیهابی شێخ نوری سـەردەمێک ئەندامی پارتی کۆمۆنیستی عێراق‌و دواتریش ئەندامی پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان بـووە. ساڵی ١٩٥٩ هەمزە عەبدوڵلا لەبن کاریگەری پارتی کۆمۆنیست، باڵێک دروست دەکات، دەیەوێت (پ.د.ک) وەکو حزب بمێنێتەوە، بەڵام هەرچـی رێکخـراوی پیشـەیی هەیە (قوتابیـان، ژنـان، جوتیـاران، لاوان..) تـێکەڵاوی رێکخـراوە پیشـەییەکانی پـارتی

کۆمۆنیست بن. بارزانی، هەمزە عەبدوڵڵا لە سکرتێری (پ.د.ک) دەردەکات‌و برایم ئەحمەد لەجێگای ئەو دادەنێتەوە. شیهابی شێخ نوری ئەندامێکی دیاری فراکسیۆنی هەمزە بووە. واتە: شیهابی شێخ نوری پاژێکی کارو خەباتی بۆ بزوتنەوەی ئازادی نەتەوەیی تەرخان کردووەو پاژەکەیتری بۆ خەباتی چینایەتی تەرخان کردووە. دیارە ئەمەش یەکێک بووە لە هۆکارەکانی ئەوەی ببێتە دینامۆیەکیتری دروستبوونی کۆمەڵەو ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری (کملک) بێت.

سالار عەزیز، کە یەکێک لە هاورێ نزیکەکانی شاسوار جەلال‌و شیهابی شێخ نوری بووە، گوتی:

"کاک شیهاب پیاوێکی قۆزو رێکوپێک، دڵسۆز، بەرێزو بەهەیبەت بوو. پێنج دەقیقە لەگەڵت دابنیشتایە، حەوت نوکتەی بۆت دەگێرایەوە. پەیوەندی خۆی‌و کاک ئارام، پەیوەندییەکی برایانە بوو. جیاوازییەکەیان ئەوەبوو: کاک شیهاب زۆر ماوی بوو: بیروباوەری ماوتسی تۆنگی بە تاکە سەرچاوەی مەعریفەو زانیاری‌و بیروباوەر دەزانی. شەهید ئارام مرۆڤێکی کراوە بوو، بیروباوەری ماوزەتۆنی بە تاکە سەرچاوە نەدەزانی. خوێندنەوەی خۆی بۆ رێکخستن‌و کاری سیاسی هەبوو. بەراشکاوانە نارەزایی لەسەر هەندێک سەرکردەو ئەندامی پلە باڵای کۆمەڵە دەردەبری.

هەر بۆ نموونە: سەبارەت بە حەمە سەعیدی میرزا عەباس،* کە گوایە: هاوڕێی (فەهەد) بووە. ئارام کۆمەڵێک سەرنج و ڕەخنەی هەبوو. شیهاب لەدڵەوە ڕەخنەو تێبینییەکانی پێناخۆش دەبێت. بێزارییەکانی خۆی بە پرسیارێک دەربڕی: کاک شاسوار تا ئێستا توانیوتە ئەندامێک بۆ کۆمەڵە رابکێشیت؟ ئارام لەوەڵامدا گوتی: ئەگەر بەمشێوەیەی تۆ بمەوێت ئەندام پەیدا بکەم، دەتوانم ڕۆژی پەنجا کەس پەیدا بکەم!" **

پرسیارێکم لە مەلا بەختیار کرد ئایا ئاستی سیاسیی و ڕووناکبیریی شەهید شیهاب چۆن بوو؟

گوتی: ئاستی ڕۆشنبیریی و سیاسیی باش بوو. جارێکیان سەردانم کرد، دانیشتبوو، کتێبەکانی ماوی لەسەر ڕەفەیەکی پشت سەری خۆی دانابوو. دیاربوو سەرقاڵی خوێندنەوەی کتێبەکانی ماو بوو.

سەرەتای هاوینی (١٩٧٥) فوئادی مەجید میسری*** چاوی بە شیهابی شێخ نوری دەکەوێت. هەردوولا گفتوگۆیەکی چڕوپڕ

---

* محەمەدی میرزا سەعیدی مەلا عەباس، یەکێک لە سەرکردە ناسراوەکانی کۆمەڵە بووەو ماوەیەک کادری پێشکەوتووی پارتی کۆمۆنیست بوو. لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند لەدایکبووە، لەسەردەمی گەنجایەتیدا، لەبن کاریگەری ئایدیۆلۆجیادا، جلوبەرگی شڕو کۆنی لەبەردەکردو تێکەڵاوی کرێکاران بووەو کرێکاریی کردووە، هەر بۆئەوەی بە (کرێکار)و مارکسی عەیار (٢٤) بناسرێت. (ئەمە قسەی هادیە سوورە لەسەر حەمەی میرزا سەعیدی مەلا عەباس).

** دانیشتنێک لەگەڵ سالار عەزیز ڕۆژی (٢٠٢٠/٢/١٤).

*** فوئادی مەجید میسری ڕۆژی (٢٠٢٠/١/٣١) لە کۆڕی (ئارامی رابەر) لەبەردەم ئامادەبووان و کەناڵە ئاسمانیەکاندا بیرەوەریەکانی خۆی لەسەر شیهاب و ئارام گێڕایەوە..

دەربارەی ناكۆكی سەرەكی‌و ناكۆكی لاوەكی دەكەن. چەند رۆژێک پێش ئەو یەكتر ببینینە، سەركردایەتی (كملک) بەیانێک دەردەكات، ئیمپریالیزمی ئەمریكی‌و زایۆنیزمی جیهانی بە ناكۆكی سەرەكی دادەنێت. لای ئەوان ناكۆكی گەلی كورد لەگەڵ رژێمی بەغدا بە ناكۆكی لاوەكی دادەنرێت. شیهاب بەگەرمی داكۆكی لە بۆچوونی سەركردایەتی (كملک) كردووە، ئاماژەی بۆ ئەوەش كردووە: گفتوگۆو دانیشتن لەگەڵ دەسەڵاتی بەغدا رەوایەتی خۆی هەیە. سەیر ئەوەیە، یەكێكی وەكو فەرەیدوون عەبدولقادر، كە ئەندامی سەركردایەتی بووە، رەنگە خۆیشی بەیانەكەی نووسیبێت، لەسەر لاپەڕەی بیرەوەرییەكانی خۆی ئەم باسەی بواردووە. پاش قسەكانی فوئاد مەجید میسریش، نە بە ئەرێنی، نە بە نەرێنی هیچ بەرسڤێكی نەبوو.

رژێم دوای نسكۆی (١٩٧٥) توانی لەناو پاژێک لەسەركردەكانی كورد (وەهم)ێک دروست بكات، گوایە: دەیەوێت لەكوردستاندا، ئازادی كاری سیاسی دەستەبەر بكات. زۆربەی سەركردە سیاسییەكانی ئەو سەردەمە، لەسەر بنەمای ئەو (بەڵێن)ەی وەریانگرتبوو، لەئێرانەوە بۆ بن دەسەڵاتی حكومەتی عێراق گەڕانەوە..

لەناو زیندان‌و لەبەردەم پەتی سێدارەدا، شیهاب‌و بەشێک لە هاوڕێكانی بوونە سمبۆڵ‌و ئەفسانەو رەمزی بەرەنگاری. خوێنی ئەوان بووە هەوێنی هەڵسانەوەو دەستپێكی بزاڤێكی شۆڕشگێڕانە دژی رژێم..

# فوئاد قەرەداخی

## (٥)

فوئاد قەرەداخی، لەدایکبووی ساڵی (١٩٤٥)، دەرچووی زانکۆی موستەنسەریەی بەغدا (بەکالۆریۆس ١٩٧٧) کۆلێجی (التربیە و علم النفس). شێخ عومەری باپیرە گەورەی لە قەرەداخەوە ماڵی بۆ ناو شاری سلێمانی گواستۆتەوە: بە بنەماڵە دەچنە سەر شێخە مەردۆخییەکانی قەرەداغ. لەتەمەنی چواردە ساڵیدا، ساڵی (١٩٥٩) یەکەمین گوتاری لە (پێشکەوتن) بڵاودەکاتەوە. سەرەتای حەفتاکانی سەدەی بیستەم، لەجیهانی رەخنەی ئەدەبیدا، بە دوو سێ لێکۆڵینەوە وەکو ژمارەیەکی گەورە سەیر دەکرا.* ئەو وەکو نووسەرێکی چەپ، خاوەن دەسەڵاتی باڵا، ناوی رۆیشت: لەڕوانگەی خەباتی چینایەتیو ئایدیۆلۆژیای ماوی، شیکاری ئەدەبی، کۆمەڵایەتی، سیاسی بۆ بابەتەکان دەکرد (روانگە، چیرۆکێکی حسێن عارف...).

ئەم یەکێک لە ئەندامە گرنگەکانی دەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵەی مارکسی- لینینی کوردستان بوو، کە بریتی بوون لە (مام جەلال، فوئاد قەرەداخی، شیهابی شێخ نوری، فازیلی مەلا مەحموود، فەرەیدون عەبدولقادر، دلێر سدیق). مام جەلال بە سکرتێری یەکەم، فوئاد قەرەداخی بە سکرتێری دووەم هەڵبژێردران. هەموو ئەندامانی تر پێکهاتەکەیان پەسەند کرد. مام جەلال سەرپەرشتی کۆبوونەوەکانی دەکرد. ئەو ماوەیە لە چۆمان بوو. لەمانگێکدا دوو سێ رۆژ بۆ بەغدا دەهات.

---

* گفتوگۆیەک لەگەڵ فوئاد قەرەداخی (٢٠٢٠/٢/٢٢) شێخ ئەشرەف تاڵەبانی بەشداری لە دانیشتنەکەدا کردو بابەتەکانی دەوڵەمەندتر جەکرد.

کۆبوونەوەی مانگێک لەو چەند ڕۆژەدا ئەنجام دەدرا. مام جەلال ئامادەی کۆبوونەوەکان نەبوایە، ئەوە فوئاد قەرەداخی وەکو سکرتێری دووەم سەرپەرشتی کۆبوونەوەکانی دەکرد.

فوئاد قەرەداخی نووسەری پەیڕەو و پرۆگرامی (کملک)ە، لەسەر داوای سەکردایەتی لێکۆڵینەوەیەکی هەڵسەنگاندنی هێزە سیاسییەکانی عێراق دەنووسێت.

فازیلی مەلا مەحمودو فوئاد قەرەداخی زۆر هاوڕێو هاوبیری یەکتری دەبن‌و پێکەوە لە ئاپارتمانێکدا دەژین. فازیل سەرەتا: پێش‌و پاش دامەزراندنی (کملک)، لەسەر کێشەی ڕێکخراوی کوردستانی هیچ پرسیارو سەرنجی نەبوو. ڕۆژێک فازیل کتێبێکی (قیادەی مەرکەزی) دەهێنێتەوە، کە بریتی بوە لە هەڵسەنگاندنی ئەزموون‌و مێژووی پارتی کۆمۆنیستی عێراق. ماوەی چل ڕۆژی ڕەبەق بۆ خوێندنەوەو شیکاری ئەو کتێبە تەرخان دەکەن. هەردووکیان دوو پرسیار لەناو کۆبوونەوەکاندا دەوروژێنن:

- ئایا کۆمەڵە دەبێتە پاژێک لە بزاڤی کۆمۆنیستی عێراق؟
- ئایا کۆمەڵە دەبێتە پاژێک لە بزاڤی ئازادی نەتەوەیی گەلی کورد؟

فوئادو فازیل دەبنە لایەنگری گرێدانی کۆمەڵە بە بزاڤی کۆمۆنیستی عێراقەوە. مام جەلال و شیهابی شێخ نوری دژی بیرۆکەی داکشان بەلای پارتی کۆمۆنیستی عێراق دەبن. فەرەیدوون عەبدولقادر لە ناڵ دەدات‌و لە بزماریش ناتوانێت بڕیاری لایەنگری بۆ هیچ لایەک بدات! مام جەلال داوا دەکات لەناو ڕیزەکانی کۆمەڵەدا ڕاپرسی بکرێت. کۆمەڵە ئەوکاتە تەنیا (۳۰-٤۰) ئەندامی هەبوو. چواردە ئەندامی دەنگ بۆ ئەوە دەدەن کۆمەڵە ببێتە ڕێکخستنێکی عێراقی‌و زۆرایەتی دژی ئەو

پێشنیازە دەوەستێنەوە.فوئاد زۆر هەوڵدەدات دوولەتبوون روونەدات. پێکەوە لەناو یەک ڕێکخراودا بمێننەوە، بەجیاوازی بیروباوەڕیشەوە. ئەو ڕۆژێک دەیەوێت بۆ سلێمانی بگەڕێتەوە، مام جەلال ئۆتۆمبێلی پێدەبێتو لەگەڵ فوئاد پێکەوە دەبن‌و ئەو دەیگەیەنێتە گەراجی (نەهزە)و بەدەم ڕێگاوە بیروڕا دەگۆڕنەوە. لەبەردەم ئەو ترمینالەدا مام جەلال پێیدەڵێت: "یەکێکمان دەیەوێت بۆ سلێمانی بچێتو ئەوەکەی ترمان دەیەوێت بەرەو دهۆک بڕوات. دەبێ هەر لەسەرەتاوە هەریەکەمان ئامانجی خۆی دیاری بکات، بەرەو کام شار دەیەوێت بڕوات. لەناوەڕاستی ڕێگادا ئەمە نابێت. لێرەوە دەبێ بڕیاری خۆمان بدەین..".

ڕۆژی (١٩٧٢/٥/١) کۆبوونەوەیەکی دوو ڕۆژی (کۆنفرانس) لەماڵی ئەندازیار حەمە هۆشیار دەکرێتو ڕێکخراوێکی نوێ لەدایک دەبێتو ناوی لێدەنێن: (ڕێکخراوی مارکسی-لینینی شیوعییەکانی عێراق)، سێ کەس بۆ سەرکردایەتی هەڵدەبژێرن (فوئاد قەرەداخی، ئەشرەف تاڵەبانی، ئەندازیار سلێمان عومەر حسێن)، ناوی دەنێن (ئەڵقەی ناوەندی)و فوئاد قەرەداخی دەکەنە سکرتێری خۆیان. ئەم ڕێکخراوە تەمەنی زۆر نابێت. فازیلی مەلا مەحمود دەیەوێت بۆ ناو ڕێکخراوی (وحدە القاعدە) ڕایانکێشێت، سەرکەوتوو نابێت. ڕۆژنامەیەکی نهێنی بەناوی (کۆمۆنیست) بڵاودەکەنەوە: تەنیا دوو ژمارەی لێدەردەچێت. فوئاد قەرەداخی سەروتارەکەی دەنووسێت. ژمارەی لاپەڕەکانی چوار لاپەڕەی تێنەپەڕاندووە.

پاییزێکی ئەم ڕێکخراوە، (ڕێکخراوی مارکسی-لینینی شیوعیەکانی کورد) دادەمەزرێنن. ئەم ڕێکخراوەش ناتوانێت بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بەردەوام بێتو هەڵدەوەشێتەوە..

# فازیلی مەلا مەحمود
## (٦)

فـــازیلی مەلا مەحمـــوود (١٩٤٩-١٩٨٩) لە ڤییەنـــا لەگەڵ د.ئەورەحمانی قاسملۆو هاوڕێکانیدا شەهید کرا. کوڕەزای مەلا رەسـوڵی دێلێـژەیە. بەکـالۆریۆس لە زانکـۆی بەغـدا، کـۆلێجی زانسـتە سیاسـیەکان (١٩٧١)، دکتـۆرا لە زانکـۆی ڤییەنـا، بەشـی زانســتە سیاســیەکان (١٩٨٢)، چەنــدین کتێــبو لێکـۆڵینەوەی بەئەڵمانیو عەرەبیو کوردی هەیە.

ساڵانی (١٩٦٨-١٩٧٠) سەرۆکی یەکێتی قوتابیانی کوردستان بــوو، ســەر بە بــاڵی (م.س)ی (پ.د.ک). پــاش یەکگــرتنەوەی هەردوولا بــووە ئەنــدامی ســکرتاریەتی یەکێتــی قوتابیــانی کوردستان.

سەرەتای (١٩٧٠) لاوە رۆشنبیرو چەپەکانی ناو باڵی (م.س) هەستیان کرد، باڵی (م.س) گەیشتۆتە بنبەست. گروپەکان کەوتنە خۆیـــانو بەرە بەرە بیـــرۆکەی دروســـتکردنی رێکخراوێکـــی مارکسی-لینینی ئەندیشـەی ماوتسی تۆنگ لەمێشکیاندا گەڵاڵە بوو.*

فازیلی مەلا مەحموود لەتەمەنی (٢١) ساڵیدا بووە ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵە. ساڵی یەکەم ئەمیش هەروەکو پێنج ئەندامەکەی تر بیری کردۆتەوەو هیچ لەئارادا نەبووە. پاشان خۆیو فوئاد قەرداخی، کە هەردووکیان دوو رووناکبیری

---

* گفتوگـۆیەک لەگەڵ فوئـــاد قەرەداخـــیو شـــێخ ئەشـــرەفی تاڵەبـــانی (٢٠٢٠/٢/٢٢).

چالاکو بیر فراوانی ناو سەرکردایەتی بوون، لەسەر شێوەو پێکهاتەی ئەم ڕێکخراوە، تووشی ناکۆکی فیکریو تێگەیشتنی جیاواز بوون:

(ئەم ڕێکخراوە کوردستانی یان عێراقی بێت؟)

فراکسیۆنی خۆیان دروستدەکەنو دەکەونە بن کاریگەری سیاسەتی سەرکردایەتی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی عێراقی (القیادە المرکزیە)ەوە. تا ساڵی (١٩٧٢) یەکەمین دوولەتبوون لەمێژووی کۆمەڵەدا ڕوودەدات.

بەشێک لە هاوڕێکانی فازیل پێیانوایە؛ ئەم ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ لەبن کاریگەری (سەرکردایەتی ناوەند)*ی پارتی کۆمۆنیست بووە. لە یەک دوو دانیشتندا لەگەڵ فاروقی مەلا مستەفا، جەختی لەسەر ئەوە کردەوە، کە ئەم بەپێچەوانەی ئەو دەنگۆیە، گوایە: فاروق هانی فازیلی داوە، لە کۆمەڵە جیابێتەوەو پەیوەندی بە سەرکردایەتی ناوەندەوە بکات، زۆر لەڕاستیەوە دوورە. "من پێمباشنەبوو، لە کۆمەڵە وازبهێنێتو بێتە ناو پارتی کۆمۆنیستەوە. ئێستا تۆ لەوێ ئەندامی سەرکردایەتیت. بێیتە لای ئێمە بە لایەنگر وەرتدەگرینو پاش شەش مانگ دەبیتە ئەندامو ساڵانێکی دەوێت تا تۆزێ بۆ سەرەوە هەڵکشێیت..".

فازیل بەقسەی فاروق ناکاتو ناتوانێت لەو کۆنسێپتە خۆی بترازێنێت، کە ماوەیەک لەناو مێشکیدا گەڵاڵەی کردووە. فازیل بەتەنیا دەڕواتو ئەندامەکانی تر، لەجێگەی خۆیاندا دەمێننەوە.

---

* القيادة المركزية للحزب الشيوعي العراق
الحزب الشيوعي العراقي (القيادة المركزية)

ئەمان مەرجیان بۆ پارتی کۆمۆنیست داناوە. پارتی کۆمۆنیست داواکانیان بۆ دواوە دەگێڕێتەوە..

ئەو دەڕوات، ئەمانیش (ڕێکخراوی مارکسی- لینینی شیوعیەکانی عێراق) دادەمەزرێنن. سەرکردایەتیەکەیان پێیگوتراوە (ئەڵقەی ناوەندی)، فوئاد قەرەداخی بەگشتی دەنگ بە سکرتێر هەڵدەبژێردرێت.

فازیل لەبواری پەخشان نوزسیندا بەرهەمێکی زۆری هەیەو نامەکانی خەمخۆریان نەبووە، یان ئاردی ناو دڕکن. لە شیعر هۆنینەوەدا دەستێکی باڵای هەبوو:

شێخ ئەشرەف تاڵەبانی بۆی گێڕامەوە: ساڵی (١٩٦٩) لە کافتریای زانکۆی بەغدا دانیشتبووین، کیژێک لەمێزێکی تەنیشتمانەوە دانیشتبوو، ناوی (ناسک) بوو. فازیل دەستی دایە قەڵەمو ئەم شیعرەی نووسی، کە من تەنیا دوو سێ بڕگەم بیرماوە:

ناسک.. ناسک..
دەستو پەنجە و گۆنا و باسک
هەروەک ترێ.. وەک قەڵماسک
هەروەک ئاسکەی هەردەو باسک
من بۆت سووتام
تۆش بێ ئاگای.. بەخوا ناسک!

ئێمەیش گوتمان: ئەگەر ئازای برۆ شیعرەکەی پێشکەش بکە!

ئەویش گوتی: ئەگەر سەنگەرێکی عەسکەر بوایە، بەبێ لێکدانەوە بۆی دەڕۆیشتم! بەڵام بۆ ناسک.. بەخوا دەتوانم بەس شیعری بۆ بنووسم!"

مـام جەلال لەسـەر ئەم شـيعرە بەتوندى رەخنەى لێگرتـووەو گوتــويەتى: ئەمە (شــيعرێكى بۆرجــوازى)يە! دەبــێ پيــاوى شۆڕشگێڕ لەسـەر دەستو بـازووى پرۆليتاريـا شـيعر بنوسێت. ديارە ئەمە تێگەيشتنێكى هەڵە بووە بۆ ماركسيەت. مـاركس دوو ديوانى شيعرى هەيەو زۆربەى شيعرەكانى دڵدارين...

من ئەم چەند دێڕەم لەسـەر يەك قۆنـاغى ژيانى فـازيلى مەلا مەحمــود نووســيوە، لايەنەكــانى تــرى ژيــانو چــالاكى و بەرهەمەكانيم بۆ خەمخۆرانى تر جێهێشتووە.

# نەوشیروان مستەفا
## (٧)

نەوشیروان مستەفا ئەمین خدر (١٩٤٤-٢٠١٧). وەستا خدر، باشخەیات بووە، لەسەردەمی عوسمانیدا باش خەیات پێیگوتراوە (ترزی باشی)یان (دەرزی باشی). وەستا خدری باشخەیات یەکێک لە خەیاتە ناسراوەکانی شاری سلێمانی بووەو لەبواری بەرگدووریدا پیاوێکی دەسترەنگین بووە.

ئەوەی راستی بێت من خۆم لەناخی دڵەوە پێمخۆش نییە لەسەر ئەم بابەتە بنووسم. دەنووسم: من پێمخۆش نییە بنووسم: چونکە سوور ئەو راستییە دەزانم، خوێنەرانی ئازیز، دوو بەشن:

بەشێکیان: هەواداری ئەون، تۆ هەرچی بنووسیت، ئەو پێشەکی خەتی چەپو راستی، لەبەر باخەڵی خۆی داناوە. تۆ هەزار بەڵگەی حاشاهەڵنەگرت پێبێت، لای ئەو تووڕێکی قوڕاوی ناهێنێت. هەمووی بە پیشەسازی دەستکردو خۆکردو هەڵبەستراو دادەنێت، ئەو هەر گوێی لێنییە. چونکە لەگەڵ قەناعەتو بەرژەوەندی بەرتەسکی ئەودا ناگونجێت.

بەشەکەی تر: وەکو تۆ بیردەکاتەوە. دەیان بەڵگەی بابەتیو مێژووییان بەدەستەوەیە، دەتوانن مەڵۆیەکی بچووک بخەنە سەر خەرمانی بابەتەکە، کەچی بەدرێژایی ژیانیان بێدەنگیی هەڵدەبژێرنو ورتەیان لێوە نایەت. لەدانیشتنی دووقۆڵیو چوارقۆڵیدا دەم هەڵدەهێننو رازی دڵی خۆیان دەدرکێنن، بەڵام

بەنووسین، یان لەبەردەم کەناڵە ئاسمانییەکاندا، راستیەکان هەندێ جار ئاوەژوو دەکەنەوە، رووداوەکان وەکو خۆی ناگێڕنەوە.

کێشەی نەوشیروان لەناو کۆمەڵەو کاری سیاسیدا یەکێک نەبوو! ئەو لەگەڵ خۆیو لەگەڵ خەڵکدا دەیان کێشەی هەبوو. بەشێکی نووسینو بیرەوەرییەکانی تەرخان کردووە بۆ دارشتنی کێشەکان؛ تۆڵەسەندنەوەو شکاندنی ئەم ئەو بەگوێرەی میزاج، لایەنی تری کێشەکانی پووش بەسەری کردوون. من لێرەدا لەرووی سیاسیەوە لەسەر ئەم کاریکتەرە دەنووسم، لایەنی (بیۆگرافی) کاری ئەم نووسینە نییە. شیکاری دەروونیش بۆ کەسانی پسپۆرو دەروونناس جێدەهێڵم..

## ١- تیۆری مارکسی:

ئەو بڕوای بە مارکسیەت نەبوو! نەشیدەزانی تیۆریی مارکسیزم چییە؟ خوێندنەوەی چەند نامیلکەیەکی ماوزەتۆن، مرۆڤ ناکاتە شارەزا، لە تیۆریی مارکسی! ئەو نە لەئاست (کورش لاشائی)و نە (ئیحسان تەبەری)و نە (مەنسور حیکمەت) بوو. کارێکی ئاساییە مرۆڤ مارکسی نەبێو هیچ شارەزاییی لە کاری تیۆریی مارکسی نەبێت! ئەو کەسی یەکەمی کۆمەڵە* بوو.

---

* مام جەلال لە پلینیۆمی چوارەم (٢٩-٢٠٠٩/١٠/٣١) گوتی: 'لەرووی فیکریشەوە، بەئاشکرا دەیگوت: کە مارکسیزم گەرۆکول بووەو سۆشیالیزم باوی نەماوە، کەچی خۆشی سکرتێری کۆمەڵەی مارکسی لینینی بوو! هەر ئەو باوەڕەی ئەویش بنەمای فیکری هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە بوو لەدواییدا'.

زۆربەی نووسینەکانی کۆمەڵە ئەم دەینووسی. دەبوایە لەناو کادرو ئەندامانی کۆمەڵەدا، خۆی بە کەسێکی مارکسی بناسێنێتو بەناوی ڕێکخراوێکی مارکسی- لینینیەوە بدوێتو بەرپرسیاریتی لەئەستۆ بگرێت!*

ئەو لە کۆبوونەوەکانی ناوەندی کۆمەڵەدا، تا ئەوکاتەی من ئاگادارم، بەراشکاوانە دەیگوت: "بیروڕای من لەم کۆبوونەوەیەدا چییەو چی نییە، دوا قسەی مام جەلال، دوا قسەی منە! بەدرێژایی ئەو ماوەیەی من کارم لەگەڵدا کردووە، سەردانی مام جەلالی دەکرد، ئەو هێڵی گشتی کۆبوونەوەو بڕیارەکانی بۆ دیاری دەکرد، ئەمیش تەنیا جێبەجێکردنی لەسەر بوو. کەسێک سەرنجو تێبینی لەسەر قسەیەک لەقسەکانی مام جەلال هەبوایە. مام جەلال بە تیلەی چاو سەیرێکی دەکرد. ئیدی ئەم بەتوندترین شێوە بەگژیا دەچوو.

---

مام جەلال لەناو پلینیۆم گوتی: "لەناو خۆشماندا، بێ ئاگاداری سکرتێری گشتیو نیوەی (م.س)و ناوەندی کۆمەڵەش، بڕیاری کوشتنی خەڵکی لە شارو لادێ دەردەکرد. ئەمەش بوو بە هۆیەکی گەورەی ناکۆکی ئێمەمانان لەگەڵ هێڵی نەوشیروان لەساڵی (١٩٨١)ەوە لەناو کۆمەڵەدا. تا کار گەیشتە ئەو رادەیەی هەڕەشەمان کرد بە بەجێهێشتنی وڵات ئەگەر کوشتار لە شارو لە لادێ رانەوەستێت، هەرچەندە، سەرەتا ئەنجامدانی ئەو تاوانانەو گەلێ بڕیاری ترمان لێ دەشاردرایەوە، بەڵام سەرەنجام، دوای ماوەیەکی کەم لەرێگەی بەرپرسانی گەورەی ناو شارەوە، راستیەکانمان هەموو زانیو چیکە فڕوفێڵ دادی نەدەدا. ئەم راستیانەش وای لێکردین بتوانین دوا سنور بۆ پاکتاوی جەستەیی ناڕەوا دابنێین! ئەمە یەکەمین ناکۆکیو دووبەرەکی ناڕاستەوخۆی گرنگی نێومان بوو، لەگەڵ پەیڕەوانی توندوتیژی).
* نەوشیروان مستەفا: (سەرچاوەی پێشوو) ل٣٦-٣٧.

زنجیرەیەک کەسایەتی ناسراو، لە شاخو شار، لەلایەن کەسانی نەناسراوەوە، تیرۆر کرانو چەند کەسێکیش لەپەناوە هەوڵی تیرۆرکردنیان دراو پێوە نەبوون. بەشێکیان ئەو نەیدەشاردەوەو دەیگوت: من فلانو فیسارم کوشتووە، یان بەبەرچاوی ژمارەیەک پێشمەرگەو کادر، شانازی بەوەوە دەکرد، چۆن بەدەستی خۆی تەقەی لەقوربانییە باڵبەستراوەکان کردووە: (عەبدوڵلا سوور، مامۆستا نەریمان- عوسمان حسێن،...) ئەو زۆرجار لەگەڵ ئەو پێشمەرگانە دادەنیشتو شانازی بەوەوە دەکرد، کە دەستی نەپاراستووەو لەوان زیاتر دەستی وەشاندووە. بەدرێژایی تەمەنی کۆماری کوردستان (مەهاباد) تەنیا چوار کەس کوژراون. دووانیان دوو ئازەرییان لە نەغەدە کوشتووە. یەکێک کوردێکی ماوەتی کوشتووە. حکومەتی ئەوێ رەزامەندی لەسەر ئیعدامکردنیان داوە. چوارەم کەس جاسوس بووەو گروپێک لاوانی خوێنگەرم تیرۆریان کردوە. قازی محەمەد فەرموویەتی: (وازتان نەهێنا تا کوردستانتان کردە گۆمی خوێن..).*

سەبارەت بە تیرۆرکردنی (نوری حەمەعەلی، عەبدولی سۆران،...) ئەمانە کەسانی نیشتمان پەروەرو ئەندامی یەکێتی بوون. برایم محەمەد شەریف (بلەی حەمە خورشە) نزیکترین دۆستی مام جەلال بوو: چەند رۆژێک پێش تیرۆرکردنی بڕی سێ هەزار دیناری بۆ رەوانە کردبوو.

---

* ئەم قسەیەم لە هێمن موکریانیو سەلاحی موهتەدی بیستووە.

خوێنـــدنەوەیەکی ســـەرپێی بیرەوەریەکـــانی نەوشـــیروان مستەفا، ئەو راستیەمان بۆ دەسەلمێنێت کە ئەو زۆر سـەرقاڵی شـەڕی براکـوژی بـووە. بەدەگمەن خـۆی لە شـەڕی سـوپای داگیرکەری کوردستان داوە. مرۆڤی ناسیۆنالیست دەبێ هەموو هێزو توانای خۆی بخاتە گەڕ بۆ یەکگرتنەوەی هێزەنیشتمانیە جیاجیاکـــان لەبەرەیەکـــدا دژی داگیرکەرانـــی وڵات. ئەگەر ئەم ماوییش بووبێـت، ئەوە (مـاو) لەشـەڕێکدا (چـان کـای چیـک)* بەدەست دەگرێت. مـاو ئـازادی دەکـات، بەمەرجێـک هەردوولا بەرەیەک دژی داگیرکەری یابانی دروست بکەن.

ئەم بەگـــوێرەی بیرەوەرییەکـــانی خـــۆی بێـــت: لـــوولەی تفەنگەکەی لە شـەڕی دژ بە رژێـم سـارد و لە شـەڕی کـورد بە کـورد گەرم بـووە (بـۆ نمـوونە: شـەڕی پشتئاشـان)** هەمـوو کەسێکیش دەزانێت مۆتیڤی راستەقینەی شەڕەکە چی بووە!

## ٢- خەونی ئەوەی جێگەی عەلی عەسکەری بگرێتەوە:

نەوشـیروان پیـاوێکی سـەربازی نەبـوو، بەدرێژایـی ژیـانی دەیویست وەکو سەرکردەیەکی عەسکەری دەربکەوێت، داماوە هەر بۆی نەدەهات. جەبار فەرمـان مامۆسـتا بـوو، مـاوەی چـوار ساڵیش زیندانی بوو. لەماوەیەکی کورتدا توانیی لەناو سـەرکردە سەربازییەکاندا ببێتە ژمارە (یەک).

---

* چان کای چیک: سەرکردەیەکی سیاسیو سەربازی چینیو سەرۆکی پارتی کۆمینتانگ بوو. دوژمنی سەرسەختی پارتی کۆمۆنیستی چینیو دامەزرێنەری کۆماری تایوانە.

** نەوشیروان مستەفا ئەمین: پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن. ل٢٩١.

نەوشیروان ساڵی (١٩٦٧) ئەندامی لقی (پ.د.ک- باڵی م.س) بوو. تفەنگێکی (پۆرسەعید)* دەکاتە شانی، وێڕای مەفرەزەیەکی پێشمەرگە (پاسەوانی) ناو شار دەکات. تفەنگی پۆرسەعید میلهێنانەوەی نەدەویست. ئەم میل دەهێنێتەوە. پۆرسەعید بەدەستی راستیەوە دەگرێت. لە شەقامی ئۆرزدی دەبێت. دەنگۆیان پێدەگات پەلێکی پێشمەرگەی پارتی گەیشتۆتە (چەق چەق) ئەم گوللە لەدەستی دەردەچێتو قاچێکی خۆی دەشکێنێت!

ئەو بەحیساب رۆژی (١٩٧٨/٢/٢٥) لەڕووی عەسکەرییەوە سەرکردایەتی شەڕی (چنگیان)ی کردووە! هەر کادرێکی سەربازی ئەم جۆرە هەڵەیە بکات، نابێ هەتا ماوە بەلای کاری عەسکەریدا بڕوات. ئەو سەرکردایەتی هێزێکی (٢٠٠) پێشمەرگەیی دەکات. دێی چنگیان دەکەوێتە نێوان کۆمەڵە شاخێکی گەردن کەش (کەتوو، باسکە رەقە، بەردە بۆر، قەڵا سارم، بەفرە سووران)، ئەمە بۆ هێزی پێشمەرگە خاڵی بەهێزە لەچاو دەشتاییو راستایی.

دوو دەستە پێشمەرگە ئەرکی بۆسەنانەوەیان پێدەسپێردرێت. دەستەی یەکەم (١٢ پێشمەرگە) لای چایخانەی (قەیماسە) بەدیل دەگیرێن. دەستەی دووەم لەناو ماڵێک خەویان لێدەکەوێت. ئەم دوو دەستەیە زوو جێگای خۆیان بگرتایە، دەیانتوانی گاڵە بە سوپا و جاش بکەن، دەیان سەربازو جاش بە دیل بگرنو بکوژن. بەپێچەوانەوە سوپاو جاش لەناکاودا دەستی خۆیان دەوەشێنن و هێزە (٢٠٠) پێشمەرگەییەکە پەرشوبڵاو دەکەن.

---

* پۆرسەعید: لە (ویزی)و (غەدارە) دەچێت.

نەوشیروان بەتەنیا rووودەکاتە شاخی (بەردە بۆر)و لەوێ خۆی بزر دەکات.*

### ٢- ترۆتسکی

بەگوێرەی قسەکانی ئازاد خۆشناو و (جۆن بۆنسل- John Bonzel) کە هەردووکیان پێش (١٩٧٥) هاوڕێی نزیکی نەوشیروان بوونو لە ڤییەنا یەکتریان بینیوە. جۆن بونسل، ئێستا پرۆفیسۆرێکی جووی نەمسایی خانەنشینە. پێرار ژمارەیەک کوردی ڤییەنا سەردانی دەکەنو پرسیاری نەوشیروانی لێدەکەن، ئەو بیری دەکەوێتەوە نەوشیروان کێیەو دەڵێت: پێش ١٩٧٥ پێکەوە خوێندکار بوینو پێکەوە بەشداریمان لە کۆنگرەو کۆبوونەوەکانی ئینتەرناسیۆنالیزمی چوارەم کردووە.

ئازاد لەسەر داوای مام جەلال پایزی (١٩٧٥) سەردانی ڤییەنا دەکات. ئەو بە راشکاوانە بەئازادی گوتووە: "ئازاد! تۆ سەری خۆت وازم لێبێنەو تاقەتی سیاسەتی کوردیم نەماوە. لێرە بۆ خۆم لەناو ترۆتسکیەکانم وەزعم زۆرباشە، نامەوێ لەخۆمی تێکبدەم!" دەیتوانی بەئازاد بڵێت: من پەیوەندیم بە سۆسیال-

---

* زانیاریەکانی نەوشیروان شپرزەیی پێوە دیارە.ئەو لە کتێبی (لەکەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ) ل٢٣٨ دەنووسێت: (دوایی دەرکەوت ئەوەی هەواڵەکەی بۆ ناردبوم فەرهادی مەلا رەزا بوو..) نەوشیروان خۆی لە هەواڵنامەی ژمارە (١) هەواڵی کوژرانی فەرهادی مەلا لە رۆژی (١٩٧٧/٨/١٥) لەگوندی بارۆیی بلاودەکاتەوە. کەسێک شەش مانگ پێشتر لەلایەن پێشمەرگەوە کوژرابێت، چۆن پاش شەش مانگ دەنگوباس لەرێگەی کەسێکەوە بۆ نەوشیروان دەنێرێت؟!

دیموکرات، بە لیبراڵەکانەوە باشە! سەیر ئەوەیە لای من باسی هەزارویەک شتی کردووە، بەڵام مەسەلەی ترۆتسکی بوونی نەدرکاندووە!

ئەو لەڕووی تییۆریەوە زۆر هەژارو دەستکورت بوو. تەنانەت نەیدەزانی (ترۆتسکیزم) چییەو بۆ لەگەڵ ئەو گروپەدا رۆیشتووە. ئەو لە نووسینەکانیدا (مەسەلەی ئەندامێتی) کە ساڵی ۱۹۷۸ بڵاوکراوەتەوە، بۆ نموونە: مارکس، ئینگلز، لینین، ماو، کیم ئیل سۆنگی بە سەرچاوەی رەسەنی مارکسیزم دادەنا، کەچی بە تەقەی تفەنگیش، بەلای ناوی لیۆن ترۆتسکیدا تێنەدەپەڕی. هەستم نەدەکرد، ئەو کەمترین زانیاری لەسەر ترۆتسکی، رۆزا لۆکسمبورگ، گرامشی هەبووبێت. لەکۆبوونەوەیەکدا لە تووژەڵە زانیاریەکانی (مەسەلەی ئەندامێتی) دووبارە کردەوە. من لەو کۆبوونەوەیەدا گوتم: تیۆرییەک هەیە، کە تیۆری مارکسی یە، لەوڵاتی جیاجیا هەوڵدراوە سیستێمی سۆسیالیستی جێبەجێ بکرێت ئەزموونەکان، سەرکەوتوو، سەرنەکەوتوو شایانی لێکۆڵینەوەو لێوەفێربوونن!

## ٤- کولتوری دیموکراسی

نەوشیروان، سێ چوار ساڵێک لە ڤییەنا ژیابوو، بەڵام هەستت نەدەکرد، شتێکی لە کولتووری دیموکراسی ئەو وڵاتەی هەڵکڕاندبێت. رەشەبا چەند توند بێت، ناتوانێت گۆڕانکاری بەسەر هەموو جۆرە بەردێکدا بهێنێت. ئەو، نە بڕوای بە دیموکراسی هەبوو، نە دەیزانی مافی مرۆڤ چییە! ئازادی تاک، دیل نەکوشتن، ئازادی بیروباوەڕ لای ئەو هیچ نرخێکی نەبوو.

مـن نەمبیسـتووە ئەو لە خـولی کادرانـدا ئامـاژەی بـۆ سیستمێکی دیموکراسیو ئیداریو کولتووری سیاسی رۆژاوایی کردبێـت. ئەو دەنـووکی تەنیـا لەسـەر هێـزە کوردسـتانییەکان دانـابوو. رۆژێـک دژی حسـیکو پاسـۆکو پـارتی کۆمۆنیسـت گوتـاری ئـاگرینی دەنووسـی، رۆژێکی تـر لە ئێسـتگەوە (قیـادەی مـوەقەتە لە چ بەرەیەکـدا وەسـتاوە)! مێشـکی ئەو، رووبەری جـوگرافی شـەڕی نـاوخۆی تێنەدەپەڕانـد. کەسـێک رەخـنەی لە تێزەکـانی ئەو بگرتـایە، شـەو و رۆژ دەکەوتە داشـۆرینی ئەو کەسەو هەوڵی ناوزڕاندنی دەدا.

ئەو خـۆی لە ڤییەنـا بڕیـاری داوە، دەربـارەی، رینیسـانسو رۆشنگەری هیچ فێر نەبێت. حاجی قادری کۆیی سـەدەیەک پێش ئەو لە ئەستەمووڵ دەرگای تێگەیشتنو لێوەفێربوونی کولتووری رۆژاوایـی خسـتۆتە سـەر پشـت، کەچـی ئەم لە ڤییەنـا بـووەو هەوڵی نەداوە زمانی ئەڵەمانی بەرێکوپێکی فێر بێت.

لە نووسـینە کۆنو نوێکانیـدا، هەسـت بەوە ناکەیـت، تیشـکی سـەرهەڵدانی بیری نەتەوەیی ئۆروپی بەرکەوتبێت. نە دەیزانـی قوتابخـانەی نەتەوەیی ئەڵەمـانی چییەو نە دەیزانـی قوتابخـانەی فەرەنسیو ئیتاڵی چین؟

### ٥- دژە ژن و مێینە

نەوشـیروان بـڕوای بە مـافی ژن، یەکسـانی نێوان ژنو پیـاو نەبـوو. بێگومـان، ئەگەر سـەرکردایەتی ئەوەنـدە دواکەوتـوو نەبـوایە، رەنـگە بیتوانیبـا، ژنـان لەنـاو ریزەکـانی رێکخسـتندا دەورێکی کـاریگەرتر بگێڕن! ئەو تێڕوانینێکی ئەرێنی بـۆ رۆڵی

ژنـان به کـاری سیاسـیو پێشـمەرگەییدا نەبـوو. ئەوەی راسـتی بێت ژمـارەیەک ژن لەناوشـار سـەرقاڵی کاری رێکخسـتن بـوون. لە شـاخیش دەیـان ژن لە ریزەکـانی شۆڕشـدا، شـان بە شـانی مێردەکانیان خەباتیان دەکرد. دوو کیژی دەرچووی زانکۆش لە بارەگاکـانی سـەرکردایەتی لەبـواری جیاجیـادا کاریـان دەکـرد. حەلیمە خـانیش (خـاتو حەلیم) تـاقە ژنـی پێشـمەرگە بوو، چەکی بەشـانەوە بـوو، شـان بە شـانی بـرا پێشـمەرگەکانی، دێ بە دێ دەگەڕا و بەشداری شەڕەکانی دەکرد.

ئەو نامەیەکی بۆ یەکێتی ژنانی کوردستان رەوانە کرد، داوای لێکردبوون ژمارەیەک کیژۆڵە بۆ دەرەوە بنێرن شـوو بە کـادرو پێشمەرگەکان بکەن. خوا بکات پریشـکی ئـاگر نەکەوێتە ئـامێزی قەلاسو پووشو پەلاشی وشکەوە. ژنـانی رێکخسـتنی نـاو شـار، ئـاگری شۆڕشـیان هەڵگیرسـاند. دەیـان نـامەی نارەزاییـان بـۆی رەوانە کــرد. ئەو چــاوەڕوانی ئەم کــارو کــاردانەوەیە نەبــوو. سـەردانم کرد، ئەو بەپێکەنینەوە بـۆی گێڕامەوە: "سـەرکردایەتی یەکێتـی ژنـان،.ئەوەنـدە جـوێنو قسـەی سـووکیان بـۆ رەوانە کردووم، لە هەموو ژیانمدا کەس قسەی وای پێنەوتووم!".

کەسـێک لە ڤییەنـا ژیـا بێـتو ژنـانی نەمسـایی لەنـزیکەوە ناسـیبێت، چـۆن بیـر لەوە دەکـاتەوە، فەرمـان دەربکـات، یـان بە نـامە، لەدوورەوە هـانی دەسـتە رەشـەکانی تیـرۆر بـدات، ژنـانی "بێڕەوشـت"ی گومـانلێکراو، بە رۆژی نیـوەڕۆ، بەبەرچـاوی منـاڵە ساواکانیانەوە بکوژرێن؟

من نامەوێ ئێستا دادگـایی بـۆ ژن بکوژەکـان دابنێم. دەمەوێ سـەرنجی خـوێنەری ئـازیز بـۆ ئەوە رابکێشـم: پاژێـک لە

سەرکردەکان ئاستی بیرکردنەوەیان چۆن بووە؟ شۆڕشێکی ساوا، سەرجەم کێشەکانی خۆی چارەسەر کردبێتو هیچ کێشەیەکی تری نەبێت، لە ناوگەڵی چەند ئافرەتێکی سۆزانی، کە جارجارە بۆ نیو دینار دەرپێیان بۆ سەربازێکی عەرەب داکەندووە! من چەپڵە بۆ بکوژەکان لێنادەمو فرمێسک بەسەر لاشەی قوربانیەکانیش هەڵناوەرێنم، بەڵام مافی خۆمە پاش چل ساڵ، ئەم پرسیارە بکەم: ئایا ئەمە رەوشتی یەکێکە بیەوێت گەلێکی ژێردەستە رزگار بکات؟

رۆژێکیان پێشمەرگەیەکم بینیو پرسیاری (حەملەی پاکو تەمیزی)*م لێکرد:

گوتم: "هەر بەڕاست کۆمەڵە ئەم کارانەی ئەنجامداوە؟"

ئەو گوتی: "من بەدەستی خۆم ژنێکم کوشت!"

گوتم: "ئایا بەڕاست لەشفرۆشو ئامرازی دەستی رژێم بوو؟"

ئەو گوتی: "راستیت دەوێت؟ نە لەشفرۆش، نە جاسوس، نە بەدڕەوشت! ژنێکی شۆخو شەنگ، باڵابەرز، زۆر بەڕێز و

---

* لە گۆڤاری کۆمەڵە ژمارە (٢) ئەم هەواڵە نووسراوە. من وەکو خۆی دایدەنێم:

حەملەی پاکوتەمیزی لە شاری سلێمانی لەماوەی دوو مانگی رابووردودا پێشمەرگە دلێرەکانی ناو شارو دەرەوە.. دەستیان کرد بە هێرشێکی فراوان بۆ پاکردنەوەی شاری سلێمانی لە ئافرەتی بەدخو و بەدڕەوشت کە داوودەزگا فاشیستەکان بۆ بڵاوکردنەوەی فەساد لەلایەکو بۆ کۆکردنەوەی دەنگوباسو جاسوسی لەلایەکی ترەوە بەکاریان ئەهێنان.. تاکو ئێستا زیاتر لە (٢٠) ژنی جاسوسو بەدخو ئیعدام کراون. (گۆڤاری کۆمەڵە ژمارە ٢ زستانی ١٩٧٩ ل٧٠)

سەربەرز! یەک دوو جار داوام لێکرد. ئەو هەڕەشەی لێکردم. ترسام حەیام بەرێت! منیش بەر گوللەم دا".

گوتم: "بڕیاری ناوەندی- کۆمەڵەیەو ناوی لەناو لیستی ژنە بێڕەوشتەکانە!"

من گوتم: "ناوەندی- کۆمەڵە بڕیاری وای نەداوە.. ئەمەی کردووتانە تاوانەو ئێوە بەرپرسیار دەبن!"

٦- کێوەکە بەرز نەبوو ...

لەماوەی نێوان (١٩٧٦-١٩٧٨) کۆمەڵە تووشی زنجیرەیەک نسکۆ، هەڵەنگوتن، کەندولەند بوو. سەرکردە مێژووییەکانی (شیهاب‌و جەعفەر)ی لەدەست دا. ئارام لە (١٩٧٨/١/٣١) لە تەنگی سەر بەتەنیا سەری نایەوە. ئازاد هەورامی لەناو زینداندا چاوی کردەوە. سالار عەزیز رەوانەی دەرەوەی وڵات کرا، ناوەڕاستی نۆڤەمبەری ١٩٧٨ گەڕایەوە. مایەوە مەلا بەختیار! مەلای ئەوکاتە، مەلای ئێستا نەبوو. ئەزموونی سیاسیی لەچاو ئەوان دەوڵەمەند نەبوو. ئاستی تیۆریی وەکو زۆربەی سەرکردەو کادرو ئەندامەکان لە قۆناغی دارەدارە بوو. بەقسەی خۆی ئەم پێشنیازی* بۆ مام جەلال کردووە: نەوشیروان ببێتە جێگرەوەی ئارام. ئەم پێشنیازە، ئەگەر بەمشێوەیە بێت، بەڵگەی کرچ‌و کاڵیی ئەزموونی سیاسییەو هیچی تر. حزبە کوردییەکان

---

* ئەمیرە محەمەد: ئازاد هەورامی، کەرکوکییەکی کوردستانی، سلێمانی ٢١٨ ل ٢٦.

هەر هەموویـان هەمـان کێشـەیان هەبـووە، ژ.ک*، بـۆ نمـونە، کەسـێکی لە ریزەکـانی خـۆی بە شـایانی ئەوە نەزانیـوە ئـاڵای سـەرکردایەتی بەدەسـتەوە بێـت، ئەم ئەرکە دەسـتۆی قـازی محەمەد خراوە.

من هیچ تەفسیرێکی ترم بۆ پێشنیازەکەی مەلا بەختیار نییە. ئەم پێشـنیازە لە پەنجـا لاوە ناڕاسـت بـووە. ئەو هـیچ نەبێـت بیـروڕای شاسـوار جەلالو کەسـانی تـری لەسـەر نەوشـیروان بیسـتووەو زانیـویەتی بەرنـامەی ئەو چییـە؟ لە دۆڵە (گۆسـتێ) پێکهەڵپـژان روویـداوە. مـن خـۆم لە قەرەداغو گەرمیـان بـووم، دەمبیسـت: نەوشـیروان دەیەوێت مەلا بەختیـار بچـوک بکـاتەوە (سـەری دوو بەران لەمەنجەڵێکـدا جێگایـان نـابێتەوە) ئیـدی ئەم پێشنیازە بۆ دەبێ لە دەمی تۆوە دەربچێت؟

ئـاوابوونی درامـاتیکی ئەسـتێرەی عەلـی عەسـکەری لەسـەر شانۆی سیاسی کوردیدا، ئەستێرەی بەختی نەوشیروانی گەشتر کـردەوە. عەلـی عەسـکەری وەکـو ئەنـدامی مەکتەبـی سیاسـیو رابەری (بسـک)و فەرمانـدەی گشـتی هێـزی پێشـمەرگەی کوردسـتان، هاوسـەرۆک بـوو، نەک کەسـایەتی ژمـارە (٢)ی نـاو یەکێتیو شۆڕش. ئەو رێزی بۆ ئەمو ئەو دادەنـا، بەڵام لە پرسە چارەنووسسـازەکاندا، هەمـوو چاوەکـان روویـان لە دەمـی عەلـی عەسکەری دەکـرد. کەسـایەتی عەلـی عەسـکەری کەسـایەتیەکی بەهێـزو جەمـاوەری بـوو، پـلەو پۆسـت دروسـتی نەکردبـوو. لەسەردەمی ئەودا مام جەلال بەخۆی رەوا نەبینیوە، فەرمانـدەی

* بـڕوانە: مامۆسـتا جەعـفەر: (کـۆمیتەی هەرێمەکـان هەڵوەشـایەوە.. یـان هەڵیانوەشاندەوە) لە هەفتەنامەی رووداو ٥/١٠/٢٠١٨.

گشتی هێزی پێشمەرگەی کوردستان بێتو بۆ عەلی عەسکەری بە دە پەنجە مۆری کردووە. پلەو پێگەی جەماوەریو کاریگەری کەسایەتی ئەو، لەگەڵ پلەو پێگەی مام جەلال هاوتەریب بوو.

من خۆم دەزانم باری دەروونی مام جەلال پاش رووداوە دراماتیکییەکانی هەکاری چۆن بوو؟ ئەمە بابەتێکە نامەوێ لەسەری بنووسم. نە قەڵەمەکەی من فێری ماستاو بووەو نە گەلی کوردیش بەرگەی گێڕانەوەی راستیی رووداوەکان دەگرێت. باپیرەم فێری کردم ئەوەی رابورد بەردێکی لەسەر دابنرێت! لە چاوترووکانێکدا لووتکەکانی یەکێتی وەکو ئاردی ناو دڕکیان لێهات. شۆڕش سڕایەوەو کۆتایی پێهاتبوو، کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان، ئەوکاتە، بڕیاریان دابوو، یەکێتی بگرنەوە.

لەم هەلومەرجە ئاڵۆزەدا نەوشیروان هێنرایە پێشەوە: چەکو پارەو پلە دابەشکردن رادەستی ئەو کرا. دیارە ئەو مەرجەشی بۆ دانرابوو: دامەزراوەی عەسکەری بەهێز بکرێتو کادرەکانی کۆمەڵە یەک لەدوای یەک جێگایان پێ لێژ بکرێتو چالاکیەکانیان لەقاڵب بدرێت!

### ٧- هەگبەی جوێنو قسەی رەق

نەوشیروان لە هونەری داشۆریو شەڕەجوێندا دەستێکی باڵای هەبوو. زۆریش حەزی دەکرد گوێ بۆ نوێترین داهێنانی جوێندان رادێرێت. ئیدی بۆ مەجلیس گەرمکردن، سەرلەبەری جوێنو داهێنانەکانی ئەمو ئەوی دەگێڕایەوە. رۆژێکیان ناسیاوێکی دەیەوێت سەردانی شاری سابلاخ بکاتو بە نەوشیروان دەڵێت:

"دەمەوێت سەردانی شاری سابلاخ بکەم هیچت ناوێت بۆت بهێنم؟"

نەوشیروان دەڵێت: "دیوانێکی شێخ رەزای تاڵەبانیم بۆ بهێنە!"

ئەو کەسە ماڵئاوایی لەو دەکاتو چاوی بە کۆمەڵێک دۆستو هاوڕێ دەکەوێت. پرسیاری لێدەکەن: "لای کاک نەوشیروان بویت دەنگو باس چییە؟"

ئەویش دەڵێت: "خۆی کەم جوێن دەزانێت، داوای لێکردووم دیوانێکی شێخ رەزای تاڵەبانیشی بۆ بکڕم!"

ئەو لە شەڕەجوێن کارامە بوو. دەستی شیعرنووسینی هەبوایە هەزاری وەکو شێخ رەزای دەخستە گیرفانیەوە. زۆرجار شەڕە جوێنی ژنە عەرەبی بەغدای بۆ دەگێڕامەوە:

"لەشاری بەغدا بووم. کۆمەڵێک دراوسێی عەرەبم هەبوو. سەیرترین جوێنی عەرەبی، کە بیستبێتم، ژنە عەرەبێک بە شاتە شات بەرامبەر ئەوەکەی گرتبوو. بەوەکەی دەگوت: (أجیلج أشک کسج بشتایم)* لەزمانی کوردی ئەم جۆرە جوێنەم بەرچاو نەکەوتووە.."

ئەو زۆر حەزی لە کەسانێک بوو، بەسەرهاتی قۆڕ قۆڕیان بۆ بگێڕایەتەوە. ئەمیش گەزێک دەمی دادەپچڕاندو پێدەکەنی. دانیشتەکانی لە دانیشتنی کەسانی سیاسی نەدەچوو. ئاراستەی گشتی شکاندنی ئەمو ئەو بوو. گرنگ ئەوەیە کەسێک سووک بکرێتو ناوی بزڕێنرێت..

---

* بێم بۆت، قوزت بە جوێن دەدڕم.

## ٨- زەبروزەنگ

نەوشیروان لەڕووی دەروونیەوە، کەسایەتیەکی ناجێگیرو (میزاجی) بوو. بەگوێرەی کەشوهەوا دەگۆڕا. لە دەیان شوێنی بیرەوەرییەکانی خۆی، نەیتوانیوە هەستو هۆشو (بنهۆش)* ی خۆی بشارێتەوە.

کەسێک ویستبێتی رێزی لێبنێتو دڵسۆزی بنوێنێت، ئەو لەبری سوپاسو پێزانین، بەڕوویدا هەڵشاخاوەو کابرای تەریق کردۆتەوە. جوتیارێکی گوندی باریکەدەر (پێنجوێن) ویستویەتی گەورەییو دڵسۆزی خۆی بنوێنێت، ئەم بە چ شێوەیەک بەگژ کابرای جوتیاردا چووە! ئەو دەنووسێت (ئیتر گەیشتە تینم خۆمم پێ رانەگیرا. راستبومەوە، بەتوڕەییەوە قسەیەکم پێوتو، وتم: "ئەگەر نەڕۆی هەڵئەسم لە لیستەی بەر مزگەوتەکەت هەڵئەکێشم.."** جوتیارەکە لەسۆنگەی گیانی بەرپرسیارێتیو حەزی یارمەتیدانی پێشمەرگەیەک، ویستویەتی ئەو بەتەنیا لەمزگەوت نەمێنێتەوە. لەهەلومەرجی ئەو رۆژگارەدا جوتیارەکە ترساوە شتێکی نەخوازراو رووبدات، رەنگە بە کەس چارەسەر نەکرێت. ئەو نەیناسیوەو پێویستی بە ماستاوکردن نەبوو. نەیویستوە کەسێک بەتەنیا لەمزگەت بەبێ نانو ئاو، بە بێ کەس سەر بنێتەوە. حەزی کردووە لەماڵێک دایمەزرێنێتو لەوێ خزمەت بکرێت.

---

* نووسەرانی کورد (وعی) و (اللاوعی) عەرەبی، وشەی هەستو نەستیان بەکارهێناوە. (هستیو نستی) فارسی بەرامبەر (بوونو نەبوون)ە. زیگموند فرۆید چەمکی (بنهۆش)ی بەکارهێناوە. من لەشوێنی تردا بەوردتر لەسەر (بنهۆش)م نووسیوەو نامەوێ سەرلەنوێ زانیارییەکان دووبارەبکەمەوە.

** نەوشیروان مستەفا ئەمین: لەکەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ ل٢٢١.

بێگومـان چەنـدین جـار ئەم رووداوەی بـۆ مـن گێـڕاوەتەوە!
رۆژێکیـان هـاوڕێیەکی پێیگـوت: ئەگەر کیژێکـی جـوانی وەکـو (برجیـد بـاردۆ) بـوایە، نەتـدەگوت: لە قـوڕو لیـتەی بەر مـزگەوتەکەت هەڵئەکێشـمو دڵـت نەدەشـکاند. ئەویـش لەقاقـای پێکەنینی دا.

ژمارەیەک پ.م دانیشتبووین (ئازاد هەورامی، پشکۆ ناکام،..) پشکۆ لەپڕ شیعرێکی خوێندەوە:

".. ئەی هەڤاڵی بێ سەروشوێن
رەنگی ئاسۆ نیشتۆتە خوێن

شـاعیرەکان شـیعر بنووسـن، باسـی جریـوەی ئەسـتێرەکان، گۆنـای ئاڵو قژی کاڵو مەمکی قوت دەکەن.. کـاک نەوشـیروان شیعرەکانیشی هەمووی خوێنو کوشتنو ملپەڕاندنە.."

هـاوڕێ (ب) گـوتی: "کـاک نەوشـیروان بە زمـانو بەکـردەوە، بەرامـبەر هاوڕێکـانی زۆر تونـدوتیژە. مرۆڤێـک بـارودۆخی دەروونی ئاسایی بێت، بەمشێوەیە هەڵسوکەوت ناکات!".

ئازاد: "دەتەوێت بەخشکەیی ناوی نەوشـیروان بخەیتە لیستی کەسە (سادی)یەکانەوە؟".

جەبـار گـوتی: "کـاک نەوشـیروان مـاوەیەک لە نەمسـا ژیـاوە، دەترسـم لەبـری ئەوەی لە فەلسـەفەی مارکسـی قـووڵبێتەوە، کەوتبێـتە بـن کـاریگەری بیروبـاوەڕی نـازیو فاشـیەوە، لەداهاتوودا کۆمەڵە، لە رێکخراوێکی مارکسیەوە بۆ رێکخراوێکی فاشی رەگەزپەرست بگۆڕێت..

ئـازاد هەورامـی گـوتی: "کـاک نەوشـیروان هەمـوویەتیو هیچیشی نییە:

١- ئەو زۆر رقی لە عەرەبەو دەڵێت: عەرەب بە هەشتیشم بۆ دروست بکەن نامەوێت. کێشەکە ئەوەیە ئەو رقی لە شارەزووری‌و هەولێری‌و بادینی‌و کەرکوکییە..

٢- ئەم بڕوای بە لەناوبردنی خەڵکە، حەزی لە خوێن رشتن‌و ئازاردانی ئەم‌و ئەوە، ئەمەیە هاوڕێیان پێیانوابێت، ئەم کابرایە سادی بێت. پیاوی سادی، ڕێگە بەخۆی نادات لە لووتکەی دەسەڵات جێگیر بێت..

من پێموایە نەوشیروان بەرهەمی ژینگەیەکی ناسروشتی ئاڵۆزو باڵۆزە. دەبێ لەقۆناغی منالی‌و ساوایی چەندێک تاڵاوی چێشتبێت، لەبری بەهەشتی منالی، ڕۆژانە دۆزەخی چەند جار بۆ هەڵخرابێت. ئەو ساڵانێک لە ڤییەنا بووە، بریا لەبری خوێندن‌و سیاسەت، برینە دەروونییەکانی خۆی چارەسەر بکردایە..

# ئازاد هەورامی

## (٨)

### ژیلەی خەونێکی سەوز

مـن نـازانم ئەگـەر ئـازاد هـەورامی تـا ئـەمڕۆ بژیابایـە، ئایـا ئـەویش لـەبازاڕی بەرژەوەنـدی ئـابووری و سیاسـی ئـەم سـەردەمەدا، کـەوی و دەسـتەمۆ دەبـوو، دەخـەسـێنرا؟ گیـانی یـاخیبوونی شۆڕشگێڕانەی دەکێشرا؟ لەپشت مێزێکی نـەوتاوی دڕوون و دزێودا گرمۆڵـە دەبوو؟ بۆ کات بەسەربردن چـاوی بەسەر تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان سۆمای تێدا دەما؟ ئەویش دەبووە بازیچەیـەکی بچـووکی قورمیشـکراوی دەسـتی کەرکـەدەن و نەهـەنگ و دێوەزمـەکانی بـازاڕی شـێواوی جیهـانی قێزەونـی سیاسـەت و بازرگـانی، یـان خـاچی ئاڵـەنگاری و ڕووبەڕووبوونەوەی لەسەر شان هەڵدەگرت و تفی لەناو چاوە مۆنـەکانی دەسـەڵات و کورسـی و مێز و تـەلار دەکرد و گیتارە تۆز لێنیشتووەکەی بەدەستەوە دەگرت و گۆرانی بۆ هـەژار و چەوساوەو بێنەوا و دڵشکاوەکان دەوت؟

ڕۆژی ٣١/ی ئـاب ٢٠١٩ سـی سـاڵی ڕەبـەق بەسـەر شـەهیدبوونی (ئـازاد هـەورامی) دا تێدەپـەڕێت. پیاوێـک لێوانلێـو، تـژی لە خۆشەویسـتی و میهرەبـانی و دڵسـۆزی، لـە جیهانێکـدا جانـەوەر و دڕنـدە و پیاوکوژەکـان، پێیـان لەسـەر پـێ دانـاوە و دەست بەسمێڵە خوێناوییەکانیاندا دەهێنن. ئەو سمبۆلی جوانی و پـاکی و ڕەوشـت بـەرزی و بـوێری و ڕاسـتگۆیی بـوو. پیـاوێکی

سەرڕاست، زمانپاراو، دەنگخۆش، سەرناس، قورس و گران و خاوەن هەڵویست بوو. هەر لەدوورەوە دەم و چاوی، پەپوولە و گوڵی لێدەباری و خەندەو بزە سەر لێوەکانی جێنەدەهێشت. ئەو هەمیشە تفەنگەکەی و گیتارەکەی بەیەکەوە بوون. تفەنگەکەی دەبووە گیتار. چاوت دەنووقاند و چاوت دەکردەوە گیتارەکەی دەبووە تفەنگ. گیتار لێدان و گۆرانی لە سێبەری تفەنگ وناڵەی تۆپ و هاڕەی فڕۆکەی جەنگی لە ئازاد هەورامی داهات.

## لاوێکی سەرکردە

تەمەنی بیستساڵان، تەمەنی گاڵتە و گەپ و مۆسیقا و ژیانی ڕۆمانسیە. ئازاد شەپۆلی توندوتیژیی ڕووداوەکان بۆ سەرەوەیان هەڵداشت.

ئەیلوولی ساڵی ١٩٧٥ لەئەمنی کەرکوکەوە فەرمانی گرتنی بۆ دەردەچێت، ئەویش بڕیاری بەرەنگاری و بەگژاچوون، خۆ بەدەستەوە نەدان دەدات. ڕوودەکاتە شاری سلێمانی و ماوەیەک لەماڵی هاوڕێ و دۆست و ئاشنا دەمێنێتەوە. دەبێتە ئەندامی (کۆمیتەی هەرێمەکان)ی کۆمەڵە، کە ئەوکاتە دینامۆی خەبات و خۆ ڕێکخستنەوە و ململانێ بوو دژی ڕژێم. لەناوخۆش کۆمەڵە، هێزی سەرەکی و کارای یەکێتی بوو، کە بەدەستی بەتاڵ: بە بێ چەک و تەقەمەنی و پوول و پارەو ڕێکخستنێکی بریندار و لەتلەتکراو، زەمینەی ئامادەکاری هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی خۆش دەکرد.

ئەوکاتە ئازاد بیست ساڵی تێنەپەڕاندبوو. بە دیمەن گەنج و کەم تەمەن، بەڵام بە هەڵسوکەوت و ئاخاوتن و بیرکردنەوەو تێگەیشتن، ئەوپەڕی بەڕێز، ژیر، ڕێک و پێک و سەنگین.

ڕێکخستنی هەرێمی کەرکوک لەچەند لایەکەوە هەڵتەکێنرابوو! پاژێکیان بەر تۆڕی شاڵاوی گرتن کەوتبوون. پاژێکی تریان بەر ڕمی هێرشی ڕاوەدونان کەوتبوون. مەترسی خۆ بەدەستەوەدانی ئەم و ئەو شمشێری دیمۆکلیس بوو، بە ژوور سەری پەیکەری تێکشکێنراوی ڕێکخستنەوە هەڵواسرابوو. چەندین کێلگەی مین و بۆسەی جاڵجاڵۆکە لەدەست و پێی ڕێکخستن ئاڵاکابوو. ئازاد لەچایخانەکانی سابوونکەران و سەرچنار دانەنیشتبوو، چای دیژلەمە فڕبکات و یاری بە تەسبیحی قەزوانی ئەبڵەق بکات و خەون بە شۆڕیجە و ئیمام قاسمەوە ببینێت. ئەو لە سلێمانیەوە شانەکانی ڕێکخستنی دەگرتەوە و سەرلەنوێ دەنکە قەزوانەکانی تەسبیحە پچڕاوەکەی دەهۆنیەوە، ئەمجارەیان بە شێوەیەکی قایمتر و تۆکمەتر. دەورێکی گرنگی بینی لەپێکهێنانی دەستەی چەکداریی دەوروبەری کەرکوک.

### ناوەندی کۆمەڵە

لەناو سەرکردەکانی ئەوسای یەکێتیدا، دوو کەسم بینیوە، کە بەرچاویان ڕوون بووەو هۆشیاری مێژووییان بۆ کاریگەری و دەوری خۆیان لە پرۆسەی دروستبوونی مێژوودا، کە مەبەستیان بووە شوێن پەنجەی خۆیان بە قۆناخەکەوە ببینن:

ئەم دوو کەسایەتییە دەیانزانی چییان دەوێت و دەبێ چی بکەن و بەکام ئاڕاستەدا هەنگاو بنێن:

١. مام جەلال.

٢. شاسوار جەلال(ئارام).

ئەم دووانە لەئاوێنەی مێژوودا خۆیان دەبینی و هەر یەکەیان پرۆژەیەک لە مێشکیاندا گەڵاڵەی کردبوو. سەرکردەکانی تر، تەنیا بوورغویەکی بچووک بوون لەناو پرۆژەیەکی گەورەدا. من لەناو ئەم هەموو سەرکردانەدا، کەسێکم بیرناکەوێتەوە تێگەیشتنێکی تایبەت و هەڵوێستێکی جیاوازی هەبووبێت، لەبواری دووربینی و بەرچاو روونیدا، بەردێکی لەسەر مەڵۆیەک دانابێت، لەوەرچەرخانێکی مێژووییدا خوێندنەوەی تایبەتی خۆی هەبووبێت و قسەی خۆی کردبێت: ئاماژەیەکم بەرچاو نەکەوتووە، ئەمڕۆ بتوانم لەسەریان بدوێم و دەستیان لەسەر دابگرم.

سالار عەزیز، کە ئەوکاتە ئەندامی (م.س) و (کۆمیتەی هەرێمەکان)بوو، کەسایەتیەکی بەرچاو، خاوەن هەڵوێست و قسە رۆیشتوو بوو، تا رادەیەکی زۆریش هەڵوێستێکی جیاواز و خوێندنەوەی خۆی بۆ رووداوەکان هەبوو. ئەو تێگەیشتن و تێڕوانینی خۆی نەدەشاردەوە، بەدەنگێکی زوڵاڵ و دلێر بیروبۆچوونی خۆی دەردەبڕی، بەڕوونی پێی لەسەر ئەوە دادەگرت، کە یەکێتی دەستبەرداری رێبازی چەپ نەبێت و چەپایەتی خۆی کاڵ نەکاتەوەو کۆمەڵە سەربەخۆیی خۆی بپارێزێت و نەتوێتەوە. ئەو زۆر بە دیپلۆماسی و رێزەوە، هەڵس و کەوتی دەکرد. بەرامبەر هەر هێرشێکی ناڕەوا بێبنەما،

هاوسـەنگی دەپاراسـت و بـە ئەوپـەڕی حیکمەتـەوە ئیـدارەی ململانێکانی دەدا. چاوی ئەو هـەر زۆر بەجوانی ((دان و داو))ی دەبینی و حـەزی نـەدەکرد ئـاڵۆزی و گرێکـوێرە دروسـت بێـت، هەرچەند سوور دەیزانی هەندێ کـەس بەخوێنی سـەری تینوون و بەشێکی (خەبات)یان بۆ پاشقوڵگرتن تەرخان کردووە.

مـن نامـەوێت لەسـەر کۆبونـەوەی فراوانـی کۆمەڵـە لە ناوەڕاستی ئازاری ١٩٧٨ لەنۆکان بنووسم، چونکە لەوێ نـەبووم و ئـەم بابەتـە نووسـینێکی تایبـەتی دەوێـت. ئـەم کۆبوونەوەیـە شـەش هەفتـە پـاش شـەهیدبوونی شاسـوار جـەلال(ئارام) کـرا. نەوشـیروان مسـتەفا، پێشـتر لـەناو سـەرکردایەتی ی. ن. ک جێگـەی خۆی دابین کردبوو، ئەندامی دەستەی دامەزرێنـەریش بوو. تا کۆبوونەوەی نۆکان، دوورو نزیک خۆی وەکو ئەندامی کملک نەناسـاندبوو. خۆیشـی لەبیرەوەریەکانیدا جەختی لەسـەر ئـەوە کردووە، کە بڕوای بەتیۆری مارکسیەت* نـەماوە بـەڵام ڕازیبووە(لغاية في نفس يعقوب)** ببێتـە سکرتێری ڕێکخراوێکی مارکسی.

گومـان لـەوەدا نییـە، ئەگـەر سـالار عـەزیز لـەدەرەوەی وڵات نەبووایـە، ڕەنگـە کۆبوونـەوەی نۆکـان هـەر نەکرایـە! ئـەو لەدوورەوڵاتـەوە ئـاڵای نـاڕەزایی بـەرزکردەوە، بەتونـدی دژی دەرئەنجامـەکانی کۆبوونەوەکـەی (نۆکـان) بـوو! پاش چـل ساڵ

---

* نەوشیروان مستەفا ئەمین: لەکەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ، بەرلین ١٩٩٧ ل ١٧٢

** لە قورئاندا دەقەکە بەم شێوەیە نووسراوە: (لحاجة في نفس يعقوب قضاها).

ئەوە من هەڵوێستەکەی ئەو بەراست دەزانم و هەقی خۆی بوو نارەزایی دەربڕێت. سەرکردایەتی رێکخراوێک، یەکێکیان شەهید دەبێت، دەبێ سێ سەرکردەکەی تر کۆبوونەوەی خۆیان بکەن و بڕیاربدەن، کەسانی تر بۆ (کۆمیتەی هەرێمەکان) هەڵبژێردرێت، یان کۆبوونەوەیەکی فراوان بکرێت و سەرکردایەتییەکی نوێ هەڵبژێردرێت. دانانی کەسێک وەکو (حاکمی رەها) بۆ کۆمەڵە و بەبێ پرسی سێ سەرکردەکەی تر، ئاراستەی کۆمەڵەی گۆڕی و پاشان بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی درا.

کۆبوونەوەی فراوانی کۆمەڵە سێ کەسی هەڵبژارد وەکو (ناوەندی ـ کۆمەڵە) کە ئەمانەی خوارەوە بوون:

١. نەوشیروان مستەفا ئەمین.

٢. ئازاد هەورامی.

٣. مامۆستا جەعفەر.

لەکاتی کۆبوونەوەکانی نۆکاندا بەندە لەبازیان بووم و ئاگام لەکارو ئەجیندای کۆبوونەوەکە نەبوو. بەنامەیەکی کورت ئاگادار کرامەوە: دەبێ بەزووترین کات، بەرەو سەرکردایەتی بکەومەڕێ. من نە نەوشیروانم پێشتر دەناسی و نە دەشمزانی ئازاد هەورامی کێیە؟ بۆیە هەر یەکسەر کەوتمە پرسیارکردن و زانیاری کۆکردنەوە بۆ ئەوەی بزانم لەگەڵ ئەم دوو هاوڕێیەدا چۆن چۆنی کار بکەم؟ سیروان تاڵەبانی لەنزیکەوە ئازادی دەناسی و پێیگوتم: (کاک ئازاد مرۆڤێکی دڵسۆز و خوێندەوار و بەرێز و گران و دڵسۆزو چالاکەو لە بنەماڵەیەکی بەرێزو خوێندەوارە).

من ئەم پرسیارەشم لە سیروان کرد:

((ئایا ئازاد دەتوانێت جێگای شەهید ئارام بگرێتەوە؟))

ئەو گوتی: ((ئازاد بەتەمەن جارێ زۆر منداڵ و کەم ئەزموونە، سەرکردایەتیکردنی کۆمەڵە و هێزی پێشمەرگە کارێکی ئەوەندە ئاسان نییە، بەڵام ئەو دەتوانێت دەورێکی باش بگێڕێت، چونکە لەناو خەڵک زۆر خۆشەویستە!)).

سەرەتای مانگی ئەیاری ۱۹۷۸ لەگەڵ کۆمەڵێک پ. م بەرەو سەرکردایەتی کەوتینەڕێ و ملی ڕێگای هات و نەهاتمان گرتە بەر. ناوەڕاستی ئەیار گەیشتینە مەملەکەتی خڕي نێوزەنگ ((خڕینێرزەنگ))، ئیدی نە سەرکردایەتی لەنۆکان بوو، نە ناوەندی ــ کۆمەڵە لەو ناوەیەدا مابوونەوە هەر هەموو سەرکردایەتی و هێزی پ. م بنکە و بارەگایان پێچابووەوە . بەرەو دۆڵە ((گۆستە))* هەڵکشابوون.

## قەفەز و بولبول

هێزی پ. م لەناوەڕاستی مانگی نیسانی (۱۹۷۸)ەوە سنوور بە سنوور، بەرەو دۆڵە ((گۆستە)) دەکەونەڕێ، کە دەکەوێتە سەر سنووری تورکیاو پاژێکە لەناوچەی برادۆست. ئامانجی ئەم لەشکرکێشییە بنکەو بارەگا دانان بوو لەوێ، نەک شەڕوشۆڕ و پەلاماری هێزەکانی (پ. د. ک) لەو دەڤەرە. گوایە: ساڵێک پێشتر لەهەمان شوێندا بنکە و بارەگایان داناوە، هیچ

---

* دۆڵە گۆستە: لەسێ سنوورەوە نزیکە. جاران هەر بۆ سوعبەت پێیدەگوترا: دۆڵە فشە. ڕۆژێکیان لە نەوشیروانم پرسی بۆ ناوی ئەم دۆڵە نراوە دۆڵە فشە. ئەویش گوتی: ئەوەندە فشە لەوێ دەکرا و پلان دادەنرا کوردستان ڕزگار بکرێت و ڕژێم بڕوخێنرێت ناوی نرا (دۆڵە فشە)!

رووداوی دڵتەزێن و نەخوازراو رووی نەداوە. مام جەلال کاتێک دەنگوباسەکانی بیست، دەفتەری بڕیاری کۆبوونەوەکانی سەرکردایەتی دەکردەوەو بەدانیشتووانی دەگوت: ئەرکی ئەو هێزانە دانانی بنکە و بارەگا بووە لەدۆڵە ((گۆستە)) و هیچی ترو خۆیان لەشەڕوشۆڕ بپارێزن، کەچی ئەوان سنووریان بەزاندووە، بەرەو قووڵایی خاکی باکووری کوردستان رۆیشتوون.

هێزەکانی ی. ن. ک بەسەرکردایەتی عەلی عەسکەری سەرەڕای برسێتی و شپرزەیی و ماندووبوون و شەونخونی، لەدیوی کوردستانی خواروو جێگیر نابن و سنوور دەبەزێنن. دیارە لەوێ بەشێک لەعەشایەری چەکداری باکووری کوردستان، سەرەڕێیان لێدەگرن و لەهەر چوار لاوە گەمارۆیان دەدەن و ناهێڵن بە ئاسانی دەربازبن. هێزەکانی ی. ن. ک بەشێوەیەک شپرزە دەبن و سەریان لێدەشێوێت، لە بری پاشەکشە و گەڕانەوە بۆ ئەمدیو، واوەتر دەڕۆن و بەرەو قووڵایی باکووری کوردستان دەکشێن و بواری دەربازبوونیان بە هیچ شێوەیەک نامێنێت!

ژمارەیەکی زۆر (پ. م) شەهید دەکرێن و ژمارەیەک بەدیل دەگیرێن و ژمارەیەکی زۆر کەم وەکو (جەمال عەلی باپیر و حەمەی حاجی مەحموود و ... تاد) دەرباز دەبن، کە بە شێوەیەکی ئەفسانەیی، پاش نزیکەی مانگێک، گەیشتنە (دۆڵەنێ) و بارەگای کاتی سەرکردایەتی..

ئـازاد هـەورامی، مـولازم عومـەر عەبـدوڵڵا، شـێخ عـەلی (کەشـکۆڵ)، ، عـەلی شـیعە، حامیـدی حـاجی خالیـد.. لـەناو گیراوەکاندا دەبن.

مـولازم عومـەر بـەحوکمی ئـەوەی پەیوەندییـەکی فراوانـی کۆمەڵایەتی هەبوو، لەناو سەرکردایەتی پارتیش چەندین دۆست و ناسیاوی هەبووە، کەوتبووە گفتوگۆیەکی جیدی لەگەڵ پاژێک لـە سـەرکردایەتی (پ.د.ک) مـانگی ئـابی ١٩٧٨ ئـازادی دەکـەن و ڕێگـەی پێـدەدەن، پـەیامێکی پـارتی بـۆ سـەرکردایەتی کۆمەڵـە بهێنێتەوە. ئەویش نامەکەی رادەستی مـام جەلال و نەوشـیروان کردبـوو. کۆمەڵـە هـیچ بەرسـڤێکی نـەبوو. تێگەیشـتنی سـامی و پاژێـک لەسـەرکردایەتی پـارتی ئـەوەبوو : باڵـە چەپـەکانی نـاو یـەکێتی و ئەوانـەی پێشـتر ((جـەلالی)) نـەبوون: (سـەرکردایەتی کۆمەڵـە + بـاڵی رەسـوڵ مامەنـد) پێویسـتە لەگـەڵ پـارتی نزیـک ببنـەوە و دەسـەڵاتی بـاڵی ((جـەلالی)) لـەناو بزوتنـەوەی رزگـاری نەتـەوەیی گـەلی کـورد وردوخـاش بکرێـت. لـەم کاتـەدا سـامی، بەهەمان تێڕوانین و تێگەیشتن چەندین نامەی ئاڕاستەی رەسـوڵ مامەنـد کردبـوو. نەوشـیروان مسـتەفا لەناملیکـەی (کـارەسـاتی هـەکاری) ئامـاژەی بەنامـە گۆڕینـەوەی سـامی و رەسـوڵ مامەنـد کردووەو ئەم بۆچوونەی ئەوان پشتڕاست دەکاتەوە..

ئەوکاتــەی مـولازم عومـــەر گەڕایـــەوە، ســـەرەتای مـــانگی ئـەیلوولی ١٩٧٨ بـوو، ئێمـە لـە (وارمیـوان) هـەوارمان خسـتبوو. نامەیـەکی کـورتی ئـازاد هـەورامی هێنایـەوە، کـە ئاڕاسـتەی مـام جـەلال کرابـوو. ئـەویش وەکـو زۆربـەی کـادرو پێشـمەرگەکان تاوانی تێکشکانی حەملەکەی هـەر هـەمووی خستبوو، ئەستۆی

((فەرمانــدەی گشـتی هێـزی پێشـمەرگەی کوردسـتان)).
نەوشیروان لـەناو دەیـان نامـەدا، کـە پێیدەگەیشـتن تـەنیـا ئـەو نامەیەی پیشاندابن! من نازانم بۆ نەوشیروان تـەنیا ئـەم نامەیەی پیشـاندابن و نامـەکانی تـری لێـدەشـاردینەوە؟ نـازانم نامەکـە لەلایەن بەرپرسەکانی پارتیەوە بینرابوو یان نە؟
دیـارە تـا کـاتی نووسـینی نامەکـە، ئـازاد نـەیزانیبوو، عـەلی عەسکەری و خالید سـەعید و شێخ حسێن بابا شێخ لەژیاندا نەماون. من پاش چل ساڵ حەزناکەم ئەو بڕگەیەی نامەکە وەکو خۆی بنووسمەوە، ناشمەوێ درۆ لەگەڵ خوێنەری ئازیزدا بکەم. هیوادارم ڕۆژێک لەڕۆژان شالاوی عەلی عەسکەری کە پیاوێکی ژیر و وریاو بوێرە، زۆر نهێنی و بەڵگەنامەی ڕووداوەکانی لای خـۆی پاراسـتووە، خـۆی یـان کەسـانی تـری بـە ویـژدان و ئـەکادیمی، بیرەوەری و نامـەو دۆکۆمێنتـە ڕاسـتەقینەکانی عـەلی عەسـکەری وەکو خـۆی بڵاوبکەنـەوە. ئازاد نووسـیبووی: ((کـاک عەلی عەسکەری هۆی سـەرەکی ئەم تێکشکان و کارەسـاتە بـوو. لـەم ڕووداوانـەدا بۆمـان دەرکـەوت ئـەو نـەدەبوو سـەرکردایەتی ئەم هێزە گەورەیـەی بەدەسـتەوە بێت. ئەگـەر ئـەمجارە ئازادکرا هەق نییە بکرێتە ئامر مەفرەزەش))!
ئەو پەندە ئۆرووپیە زۆر ڕاستە: (ژێرکـەوتن یـەک بـاوکی هەیـە و سـەرکـەوتن هـەزار). ئەم نامەیە لە زیندانـەوە نووسراوە هیچ کەسێک نییـە لەزینداندا ژیـان و شـێوەی بیرکردنـەوەی ئاسـایی بێـت. مـن دڵنیـام ئـازاد دەسـت و قـاچی لـەکۆت و زنجیـری بەندیخانـەدا نەبووایـە، ڕسـتەکەی بەشـێوەیەکی تـر دەنووسـی:

ئـازاد لـەرۆژانی زیندانـدا، چرکـە بـە چرکـەی کارەسـاتەکەی لەبەرچاو بووە و چاوەڕوان بووە کۆتایی بە ژیانی بهێنرێت.

گومان لەوەدا نییە عەلی عەسکەری لەو رووداوانەدا شـەهید نەکرایـە، هەنـدێ کـەس، کـە دەسـەڵات و ناویـان پەیـداکرد، نەیانـدەتوانی یـەک لـەدەی ئـەو سـەرکەوتنە وەدەسـتبهێنن، کـە وەدەستیانهێنا..

## پاش هەڵاتن

ئازاد و شێخ عەلی (کەشکۆڵ) نزیکەی یەک ساڵ لە زینداندا بوون: عەلی شیعە و حامیدی حاجی خالید پاش یەک ساڵ و نیو ئازاد کران. ئەم چوارە پێکەوە لە ژوورێکدا دەبن، هـەر یەکسـەر تێبینی ئەوە دەکەن ئازاد و شێخ عـەلی دەتـوانن لەپەنجەرەکـەوە دەربچن. عەلی شیعە و حامیدی حاجی خالید وەکو ئەوان باریک نـابن و بـە پەنجەرەکـەوە نـاچن. دووانیـان هەڵـدێن و دوانیـان دەمێننەوە.

ئازاد بوون لە زیندان بۆ ئازاد وەکو دووبـارە لەدایکبوونـەوە بوو. زۆرجار بە نوکتەوە بیرەوەری رۆژە سـەخت و تاریکـەکانی دەگێڕایەوە.

هـەر کەسێک باسـی سـامی لا کردبایـە و بیگوتبایـە پیـاوێکی مارکسـی و چەپـە، وەکـو فیشـەکە شـیتە بـە ئاسـماندا دەچـوو.. دەیگــوت: هەڵوێســتی زۆر نامرۆڤانــە بــووەو زۆر بێڕێــزی بەرامبـەرمان کردووە! ئێمـە دیل بووین! ئێمـە زینـدانی سیاسـی بووین!

جاریکیان بەلای چەمەکەی نۆکاندا پێکەوە دەڕۆیشتین، دوو سێ (پ. م) کوڵیان* دەکرد. تەنەکەی ئاویان لەسەر سێ کوچک دانابوو، ئەو ناوەیان کردبووە چڕە دووکەڵ. ئازاد گوتی: ((سامی جاریکیان ئێمەی بینی، ئاومان گەرم دەکرد و دەمانەویست خۆمان بشۆین. ئەو هانی پاسەوانەکانی زیندانی دا، ئاوە گەرمەکە قەلپ بکەنەوە و ئاگرەکەش بکوژێننەوە. پێی گوتن: ئەمانە بۆ سەیران هاتوون؟ بە چلەی زستانیش بۆمان نەبوو خۆمان بە ئاوی گەرم بشۆین! پاسەوانەکان مرۆڤانەتر بوون و چاوپۆشیان لێدەکردین..))!

من گوتم: ((بۆ سامی ڕێگەی نەداون بەچلەی زستانیش بە ئاوی گەرم خۆتان بشۆن؟))

ئازاد: ((بە پاسەوانەکانی گوتبوو با لەسەرمانا نەخۆش بکەون و زوو بمرن!))**.

---

* کوڵ کردن: خۆشتن بەئاوی گەرم.

** ڕۆژێکیان بۆ مەکتەبی عەسکەری دەچووم. بەلای ژوورێکی سادەو بچوکدا تێپەڕیم، کە ژمارەیەک خەڵک لەوێ دەستەبەر بوون(زیندان) پێشمەرگەیەکی پارتی، بەچاوی پڕ لە فرمێسکەوە بۆ لام هات. گوتم: ((کاکە بۆ دەگریت چی رووی داوە؟)) ئەو گوتی: ((ئەو پاسەوانە لەسەر هیچ خراپ لێیدام!)). بانگی پاسەوانی زیندانم کردو پێمگوت: (( ئەمانە میوانن، ئەمانە دیل نین!)) گوتم: ((بۆ لێیتداوە؟ ئەو گوتی: ((بە گۆڕی بابم لێمنەداوەو سوعبەتم لەگەڵدا کردووە!)) .

مولازم عومەر بینی. ڕووداوەکەم بۆ گێڕایەوە. ڕۆیشتبووە خوارەوە، پاسەوانی زیندانەکەی کردبووە ژوورە. پاش هەفتەیەک بەڕێکەوت بە هەمان شوێندا تێپەڕیم. هەمان پێشمەرگەی پارتیم بینی بە پێکەنینەوە بۆ لام هات و داوایکرد پاسەوانەکە ئازاد بکرێت. گوتی: ((تۆبەی کردووەو داوای لەمن

هەر جاریّ پێکەوە سەردانی بارەگای پێشمەرگەکانمان بکردایە و بەرێکەوت ساوەریان لەسەر ئاگر بوایە. ئازاد یەکسەر زیندانی گوندی (کەچەڵوو)و زیندانەکانی تری بیر دەکەوتەوە: سامی، کە پێشتر ئەندامی پارتی کۆمۆنیست و سکرتێری یەکێتی لاوانی جیهان و خوێندنی لە وڵاتە ئۆروپیەکان تەواو کردبوو، پاسەوانەکانی بینیبوو ساوەرەکەیان بەجوانی بۆمان کولاندووە، بە ڕوویاندا هەڵشاخابوو، پێیگوتبوون: ساوەرەکەیان بۆ مەکوڵێنن، ئەمانە شایانی ئەوە نین چێشتی ئاساییان پێشکەش بکرێت، با تووشی سەرەتان بین!

## بڕیاری کوشتن

هەردووکیان زۆر هاوڕێم بوون و زوو زوو لای من کۆدەبووینەوەو لاپەڕەکانی جارانمان بەدیوێکی تردا هەڵدەدایەوە. من زۆر حەزم دەکرد((کارەساتی هەکاری)و کارەساتەکانی تریش سەر لەنوێ بنووسرێنەوە: لەدوو تۆی یەک کتێبدا، تێڕوانینی ژمارەیەک کادرو سەرکردەی پارتی و یەکێتی پێکەوە چاپ بکرێن. وریا سەعاتچی و شێخ عەلی (کەشکۆڵ) بیرۆکەکەیان پێباشبوو. ئێمەی کورد فێربووین پێش ڕووداوێک جوێنبارانی یەکتر دەکەین! لەکاتی ڕووداوەکەش هەر جوێن بارانی یەکتر دەکەین! پاش ڕووداوەکەش هەر جوێن دەدەین و یەکتر تاوانبار دەکەین. ئیدی ئەم هێرش و پەلامارە،

---

کردووە تکای بۆ بکەم لای ئێوە، بەڵکو ئازاد بکرێتەوە..)). گوتم: ((زۆر جوانە زیندانی بۆ پاسەوان بپارێتەوە، لێبوردنی بۆ دەربچێت!)).

نـەوە بەنـەوە دەڕوات و ئەنجامەکـەش لـەرابووردووی خۆمـان، لەئەزمونــەکانمان هــیچ فێــر نــابین و لــە بازنەیــەکی بەتاڵــدا دەسووڕێینەوە!

گـەلانی پێشکـەوتوو، بـە بـەردەوامی کـار لەسـەر رابـوردووی خۆیـان دەکـەن! واتـە: دیاردەیـەکی سیاسـی ــ کۆمەلایـەتی لـەقۆناخێکی مێژووییدا روو دەدات، بۆ نموونـە: فاشیزم! ئـەوان چاویـان نـانوقێنن و پووشبەسـەری ناکـەن: فیلم و دۆکـۆمێنتی لەسـەر بڵاودەکەنـەوە. زانکۆکان، بـە تایبـەتی زانسـتی سیاسـی و کۆمەڵناسی، زاناو پرۆفیسۆری گەورە، وانە و سیمناری زانسـتی بۆ تـەرخان دەکەن! سەدان کتێبی لەسەر دەنووسـن و منـاڵ هـەر بە مناڵی فێردەکەن، ئەم دیاردەیە وەکو سیستێمی سیاسی وەکو بیروباوەڕیش چەند زیانبەخشە... تاد.

رۆژێکیان شێخ عـەلی (کەشکۆڵ) و وریا سـەعاتچی و بەندە پێکەوە دانیشتبووین، شێخ عـەلی بـە پێکـەنین و نوکتـەوە هەندێ رووداوەکــانی ســاڵی (١٩٧٨) ی دەگێڕایــەوە. وریــاش ئــەم رووداوەی گێڕایەوە

((ئەوکاتــەی هــەڤاڵانی یــەکێتی لــە زیندانــدا بــوون، ئێمــە (ژمارەیـەک لـە گەنجـە چەپـەکانی سـەرکردایەتیی کـاتی پـارتی لـەژوورەوە دانیشـتبووین. لـەپڕ بـووە دەنگـە دەنـگ و هـات و هـاوار. نـەمانزانی چـی ڕوویداوە؟ بـە پەلـە پـەل هاتینـە دەرەوە، دەبینـین زیندانیـەکان هێنراونەتـە دەرەوە و دەیانـەوێت بیانبـەن! ئازاد هەورامی، عەلی شیعە، شێخ عـەلی (کەشکۆڵ) و حامیدی حـاجی خالیـد..تاد. لـە شـوێنێک بـوون. مـن بـە ئـامر مەفرەزەکـەم

گوت: ((ئەوە دەتانەوێ چی بکەن؟)) ئامر مەفرەزەکە گوتی: ((ئەمانە بڕیاری کوشتنیان بۆ دەرچووە..)).

منیش گوتم: ((کێ بڕیاری دەرکردووە؟))

ئەو گوتی: ((سامی بڕیارەکەی دەرکردووە و من جێ بەجێی دەکەم!))

منیش گوتم: ((کاکە تۆ بڕۆ ئەمە کاری تۆ نییە و ئێمە خۆمان لەگەڵ سامی قسە دەکەین. ئەم جۆرە بڕیارە، لەمەکتەبی سیاسی کۆبوونەوەی لەسەر دەکرێت و بڕیاری لەسەر دەدرێت... تاد)).

ئێمە نەمانهێشت ئەو تاوانە رووبدات. ئەو رۆژە بەڕێکەوت ئەگەر ئێمە لەوێ نەبووینایە، کار لەکار ترازا بوو!..))

## گابریل گارسیا مارکیز

ئازاد پێیگوتم: رۆمانەکەی گابریل گارسیا مارکیزت خوێندۆتەوە، بەعەرەبی دەست دەکەوێت و ناوی(مائە عام من العزلة)یە و بەفارسیش تەرجەمە کراوەو ناوی (سد سال از تنهائی)، ئەمە خەڵاتی نۆبلی پێبەخشراوە!من گوتم: هێشتا دەستم نەکەوتووە، هەوڵدەدەم پەیدای بکەم و بیخوێنمەوە.

ئازاد گوتی : ((رۆمانێکی مۆدێرنی زۆر نایابە. من لەزیندانددا دەستم کەوت و دووجار خوێندمەوە. دەبێ بیخوێنیتەوە بۆ تۆ زۆر پێویستە، بەراستی پێویستە!)).

ئەوەندە باسی رۆمانەکەی گابریل گارسیا مارکیزی بۆ کردم من (مائة عام من العزلة) و (سەرهەنگ کەسێکی نییە نامەی بۆ بنووسێت)م خوێندەوە و پاشان هەوڵمدا بە ئەڵمانی زۆربەی نووسینەکانی بخوێنمەوە. خوێندکارێکم لەزانکۆ ناسی

ناوی(ماریـا)بوو، تـا خـوا حـەز بکـات کیژێکـی بـەڕێزو قـورس و جوان و خان و مان بوو. ئەویش وەکو گابریل گارسیا مـارکیز خـەڵکی (بۆگوتـا)بوو، وەکـو زۆربـەی کۆڵۆمبیـەکان شـانازی بـە مـارکیزەوە دەکـرد. ئـەو فێـری کـردم چـۆن لـەمارکیز تێبگـەم. مەخابن ئازاد لەژیاندا نـەماوە تـا بـە سـوبعەتەوە پێـی بڵێم: هـەر کاتێک ناوی مارکیز دەبیستم یان دەبینم، تۆ و ماریام بەیەکەوە بیر دەکەویتەوە!

# گروە زیندان

## (٩)

ڕۆژانـی ١٦ــ ١٩٧٩/٨/٢٠پاژ پاژ زیندانیە سیاسییەکان، بـەر بڕیاری لێبووردنی گشتی کەوتن. پێش ئەوەی بڕیاری لێبووردن دەربچێـت، ئەوانـەی لەسـەر ڕژێـم جێگـای مەترسـی بـوون، لەماوەیـەکی کورتـدا بەڕووکەش دادگـایی کـران و کۆتـایی بـەژیانیان هێنـرا. زوو دەنگوباسـەکەمان پێگەیشـت، کـە هـاوڕێ گیراوەکانی کۆمەڵە دەرگای زیندانیان لێکراوەتەوە، بە ئاسپایی ڕەوانەی زێدی خۆیان کراونەتەوە. ئەم هەواڵە بایەکی ساردو فێنێک بوو بەسەر دڵە سووتاوەکاندا تێپەڕی. هاوڕێیانی کۆمەڵە ئەمـەیان بە مژدەی فـەڕو شادی دانـا. تێکۆشـەران پێی ئۆخژن بـوون. خـەونێکی چاوەڕواننـەکراو هاتـەدی. ئـەوە ڕاسـتە ئـەو هاوڕێیانـە دەیـانتوانی مێژوویـەکی پڕ سـەروەریتر تۆمـار بکـەن: خۆیـان لـەداوو دەهـۆی ڕژێـم بپـارێزن، بـە ئاسـانی پێـوە نـەبن. بـەڵام مـرۆڤـە مرۆڤـە: زۆر جـار بـەڕێی خـۆی نابینێـت، چجـای ئامـانجێکی زۆر دوورو نادیـار. مرۆڤ دیلی تێگەیشـتن و خـەیاڵ و تێڕوانینـی خۆیـەتی، ناتوانێـت بـە ئاسـانی سـنووری تـەونی جاڵجاڵۆکەی خەونەکان تێپەڕێنێت.

هاوڕێیـان سـێ چـوار سـاڵێکیان لـە پشـت دەرگـا ئاسـنینە خوێناوییەکاندا بەسەربرد. ڕۆژانە دەیـان جـار دەمردن و زیـندوو دەبوونـەوە. جـاران دەگـوترا: زینـدان قوتابخانـەی تێکۆشـەرانە. لەوە دەچێت، ئەم ڕستەیە، لەسەردەمێکی کۆندا، لەسـەر دیـواری

گرتووخانەیەکی داڕووخاودا نووسرابێت! دۆخی زیندانەکانی سەردەمی بەعس، سنووری خەیاڵی دڕندایەتی تێپەڕاندبوو.

هیوایەکی زۆر لەسەر ئازادکردنی هاوڕێیان هەڵچنرابوو. پێمانوابوو: بە ئازادبوونی ئەوان، گوڵ و وەنەوشە دەبارێت. کۆمەڵە بووژانەوەیەکی بێسنوور بەخۆیەوە دەبینێت، هەر بە فڕین بەرەو هەوراز دەفڕێت. شوێن برینەکانی شەهاب و جەعفەر و ئارام سارێژدەبێتەوە. ڕێبازی بەهێزکردنی کۆمەڵە دەگیرێتە بەر، نەک کوێرەڕێی هەڵدێرو هەڵوەشاندنەوەو لەناوبردنی پەسەند بکرێت. ماران گەستە، دوای پەنجا ساڵیش هەموو دەرگایەکی ئاسنینی لێ دەبێتە دەرگاو پەنجەرەی زیندان، بە تەقەی تفەنگیش لێیان نێزک نابێتەوە. ئەمان هەر زوو کەوتنە خۆیان لەبن سێبەری شمشێری ڕەشی ڕژێمدا نەمانەوە. ئەمجارەیان زانیان گەل، ڕێکخستن، تفەنگ و شاخ هەیە. زۆر بە گەرمی پێشوازییان لێکرا. ڕاستە تاقیان بۆ لێنەدرا. ئاهەنگ و مارشی نیشتمانی و بە گوڵباران بە پیریانەوە نەچووین. خۆشمان هەر نانە ڕەقە و بنەبەردو کەورگمان هەبوو. نانت جۆبێت و خوڵکت گەنم. ئەوەی لە دەستمان هات لەهونەری پێشوازی پێشکەشمان کردن. کەس لەدڵی نەدەهات، وشەیەک، ئاماژەیەک دەربڕێت، بۆنی دڕک و زراوی لێوەبێت.

پێشتر، کە لەناو شاردابووین، بەشێک لەهاوڕێ خوێن گەرمەکان، سیناریۆی پێداچوونەوەی ڕەخنەگرانەی لەمێشکی خۆیدا گەڵاڵە کردبوو. مێژووی پڕ هەورازو نشێوی کۆمەڵە پێویستی بە خوێندنەوەیەکی تر هەبوو. تۆ چارەنووسی کۆمەڵەت گەیاندە بنبەست و خۆشت گەیاندە بەر پەتی سێدارە.

پایزی خەزان و گەڵارێزانی ١٩٧٥ فرمسێک و خوێنی بەسەر کەلاوەی رێکخستندا باراند. کادرو ئەندامان لەناو تونێلی نا ئومێدیدا، لەهیچ سەرێکەوە تروسکاییان لێوە دیار نەبوو. چەند ئەندامێکی دیار تا رادەیەک پەراوێزخراو، بەڵام چالاک و روونـاکبیرو بەهیمەت لەبەردەم زریـان و رەشەباو باوبۆراندا چەقین. ئومێدیان بە نائومێدی بەخشی و نـاوی خۆیان نـا (کۆمیتەی هەرێمەکان)، ئەمانە بوونە دینەمۆی بەرەنگاری و ئومێدبەخشین.

دامەزرێنەری راستەقینەی کۆمەڵە ئەم چوار سەرکردەیە بوون. ئەمانە تەنیا ناوی کۆمەڵەیان بۆ مابوەوە. رێکخراوێکی تریان دروست بکردایە زۆر قازانجیان بوو. ماڵی بێ ئەزموونی و بەرچاو روونی کاول یێت، رێکخراوێکی نوێ دروست دەکەیت و رادەستی کەسانی نا ئەمین و ناشایستەی دەکەیت و ئەوان لەبناغەوە هەڵیدەتەکێنن. چەند ناخۆشە تۆ کەسانێک بەسەرکردە دابنێیت، ریشی خۆت بەدەستیانەوە بدەیت. کەچی ئەوان دوای خەیاڵ و ئەندێشەیەکی نەزۆک کەوتبوون: سنوور بەزاندن بە ئەوپەڕی نە شارەزایی، نەبوونی زانیاری وردو پێویست، هەر هەمووی تەختەی چرووک و ڕزیو بوو، لەبن پێیاندا خۆی نەگرت! ئەوان لە یەک دوو دانیشتنی برایانەدا، سەر لەبەری رووداوە دراماتیکیەکانی پاش گرتنی (ئەنوەر زۆراب)یان گێڕایەوە. ئێمە پێمان گوتن: بۆ لە کوردستان نەمانەوە؟ راستە یەکێتی لەشام دامەزراوە، بەڵام شۆڕش لە (زبداني) و (بلودان) و چایخانە (طلیطلة)وە هەڵناگیرسێنرێت! شۆڕش لە بناری قەندیل و ئاسۆس و سوورێن هەڵدەگیرسێت. ئەوان پاش چوار

ساڵ زیندانی داکۆکییان لە پلانەکەی* خۆیان دەکرد! کەس لە گوڵێ کاڵتری پێنەگوتن. ئەرکی ئێمە هەر دڵدانەوەو سارێژکردنی برینەکان بوو، نەک هەڵدانەوەی لاپەڕە خوێناوییەکانی رابووردوو.

سێ ساڵ، گۆڕانکاری گەورە روویدابوو. لە چەندین شوێندا. ناوچەی رزگارکراو، یان ناوچەی نیمچە رزگارکراومان هەبوو. سنووری نێوان عێراق و ئێران بەدەست هێزی پێشمەرگەوە بوو. شەڕی زۆر قورس لەگەڵ رژێمدا دەکرا. دەیان بارەگای (پ. م) و سەرکردایەتی هەبوون. رێکخستنی ناو شارو لادێ هەنگاوی زۆری بەرەو پێشەوە نابوو... کەس نەیدەتوانی ئەو گۆڕانکاریانە نادیدە بگرێت. زۆربەی هەڤاڵانی (گروە زیندان) پێیان وابوو، هیچ نەکراوە، لەبەر ئەوەی گوایە ئەوان: بە گەرمی پێشوازیان لێ نەکراوە و خوێنی (سیاوەحش) رژێنراوە. تا ئێستاش** هەر جوێن بە (کۆمیتەی هەرێمەکان) دەدەن و ئەوەیان لەبەرچاو نییە: لەماوەی سێ ساڵدا، هێزی سەربازی و

---

* جاران نوکتەیەک لەسەر سەرکردەیەکی پارتی کۆمۆنیستی عیراق باوبوو، کەناوی (ع.ع)بوو. هاوڕێکانی زیندان دەڵێن: بن دیوای زیندانمان هەڵکۆڵیوەو دەتوانین بە ئاسانی خۆمان دەرباز بکەین. ئەو دەڵێت: من رازی نیم، ئەمە هەڵەیە! ئەوان هەڵدێن و (ع. ع) بەزۆر دەرباز دەکەن و بە سەلامەتی دەگەنە سلێمانی. پێی دەڵێن: نەمان گوت: پلانەکەمان سەرکەوتوو دەبێت. ع. ع دەڵێت: ئێستاش هەر دژی پلانەکەم!

** بڕوانە: بیرەوەرییەکانی: فەریدون عەبدولقادر، د. ئەرسەلان بایز، عەلی بچکۆل... تاد. تێڕوانین و هەڵسەنگاندیان بۆ خەبات و چالاکی (کۆمیتەی هەرێمەکان) زۆر نازانستی و نا بابەتییە. مرۆڤ دەبێ بە ویژدانەوە سەیری مێژووی خۆی و خەڵک بکات.

ڕێکخستن دروستکرابوو و ئەوان لەبن دارگوێزەکانی تووژەڵەدا بارەگای خۆیان دادەمەزراندەوە و بە ماڵ و مناڵەوە لەوێ نیشتەجێبوون.

## ناوێکمان دۆزیەوە

لەم قۆناخەدا نەوشیروان لەبارێکی دەروونی زۆر خراپدابوو. هاتنی ئەوان پەتێک بوو بۆ ((یوسف)) شۆڕکرایەوە. نەوشیروان لەکاتی دامەزراندنی کۆمەڵەدا، لەگەڵ شەهابی شێخ نووری زۆر ناکۆک بوو. پێش ئەوەی سەفەری ڤییەنا بکات، سەردانی هەفتەنامەی (هاوکاری) کردبوو. لەوێ چاوی بە ژمارەیەک نووسەرو رووناکبیر کەوتبوو، پێیگوتبوون: (لە ژیانما جارێکی تر لەگەڵ مام جەلالدا کاری سیاسی ناکەم). من نامەوێت قسەکانی لەسەر شەهاب و فەرەیدون بگێڕمەوە. هاتنی هاوڕێیانی زیندان، دەرکەوتنی مانگ بوو، پاش هەور رەوینەوە. ئەم قین و داخی کۆنی بۆ ماوەیەک خەفەکرد. ئەمانیش وەکو یاریزانێک هاتنە مەیدانەوە. نەوشیروان لە پشت دارو دەوەنەوە چەپڵەی بۆ لێدەدان و هانی دەدان چنگ لە زەوی بگرن و بە پشتا نەکەون و تا دەتوانن دەستبوەشێنن.

ناسراوترین ئەندامانی ئەم گروپە، ئەمانە بوون: (فەرەیدوون عەبدولقادر، عومەری سەید عەلی، جەبار فەرمان، دارۆی شێخ نوری، عەلی بچکۆل، ئەرسەلان بایز، ئازادی مەلا، ئاسۆی شێخ

نوری، ئیبراهیم حسێن، ئاوات عەبدولغەفور، ئەنوەر حەسەن..)*
ئەندامانی ئەم گروپە سەرەڕای ناکۆکی و جیاوازی هەڵوێست و ململانێی کۆنیان لەگەڵ یەکتردا، کۆمەڵێک پێشینە و باکگراوندی هاوبەشیان هەبوو. لەکاتی دوو لەتبونی پارتیدا، ئەمانە چەکی کەوای باڵی (م. س)یان گرت، پاژێکیان کادرو ئەندامی رێکخستنی ئەوان بوون.

پاش دامەزراندنی کۆمەڵە، یەکێکیان ئەندامی دەستەی دامەزرێنەر بوو. ئەوەکانیش ئەندامی چالاک و دیاری ئەو رێکخراوەبوون. ئەمانە زمانی یەکتریان دەزانی، پاژێکیان خووی یەکتریشیان گرتبوو. لە تاکتیک و ململانێی دەستەگەری و مانۆڤەردا کارامە و پسپۆربوون.

یادەوەری زیندانیشیان، رووبەرێکی فراوانی ئەزموون و پێکەوە ژیانی نێوان چوار دیواری تاریکی رۆژانی سەختیانی دادەپۆشی. شێوەی ئاخاوتن و قسەکردنیشیان گێڕانەوەی بەسەرهاتە ناخۆشەکانی زیندان بوو.

زۆربەی ئەندامانی ئەم گروپە، دوو دوو، سێ سێ سەردانی بارەگاکانیان دەکرد، حەزیان لەوەبوو خەڵک بناسن و بناسرێن. بە بەردەوامیش لەهاوڕییانی کۆمیتەی هەرێمەکانیان دەخوێند. بەرە بەرە وەکو گروپێک یان باڵێکی جیاواز لەناو کۆمەڵەدا ناسران. خۆشیان بە شێوەیەک پێشکەش کرد، گوایە: ئەوان خاوەن ماڵی رەسەنن، بە ((کودەتا)) دەسەلات و پلە و پۆست

---

* ئازادی مەلا و دارۆی شێخ نوری بۆ نمونە خۆیان بەهاوڕێی ئەم گروپە نەدەزانی!

لەدەستیان دەرهێنراوە. ئەو ڕۆژانە هاوڕێیانی شاخ، لەسەر ناوێک بۆ هاوڕێیانی تازە ئازادکراو رامابوون. یەکێک پێی دەگوتن: ((کوتلەی سجن)) یەکێکی تر پێی دەگوتن ((هاوڕێیانی زیندان))... هتد.

ئازاد هەورامی و من دانیشتین و بیرمان کردەوە ناوێکی گونجاو بۆ ئەم هاوڕێیانە بدۆزینەوە. لەسەر کێش و سەروای گروپە سیاسییەکانی ئێران، کە هەریەکەیان لەماوەیەکی زۆر کورتدا، چەندین دوولەتبوون و سێ لەتبوونی بەخۆیەوە بینیبوو، بەتایبەتی (چریکهای فیدائی خلق ایران) کە ناوی گروپێکیان (گروه زیندان) بوو. من بۆ سوعبەت پێشنیارم کرد، با نێوی ئەمانیش بنرێت: ((گروه زیندان))، ئازاد هەورامی هەر زۆر بە ئاواز و میلۆدی رستەکانی من پێکەنی و پێشنیارەکەی بە جوان دانا. ئیدی لەو ڕۆژەوە ناوەکە ڕۆیشت.

# گوتارێك گۆمەكەی شلەقاند
## (١٠)

(کۆمیتەی هەرێمەکان) رۆڵێکی گەش و کاریگەری لەمێژووی کۆمەڵەدا هەیە. مێژووی ئەم رێکخراوە بە شێوەیەکی بابەتی و زانستی کاری لەسەر نەکراوە. بە پێچەوانەوە، دەزگایەکی پرۆپاگەندەی زەبەلاح کاری لەسەر شێواندنی مێژووی ئەم رێکخراوە کردووە، رەشی بە سپی گۆڕیوە، سپی بە ڕەش لەسەر تەناف هەڵخستووە. ماوەی تەمەنی ئەم سەرکردایەتییە زۆر کورت خایەن بوو.. پاش چل ساڵ نووسەرو سیاسەتزانان لە قازانجیان نەبووە یەک لاپەڕە لەسەر ئەم دوو ساڵە بنووسن!

کێشەی بنەڕەتیش ئەوەیە، ئەندامانی (کۆمیتەی هەرێمەکان) دووانیان شەهیدبوون و دووانەکەی تریان هیوای تەمەن درێژییان بۆ دەخوازم. سالار عەزیز، بیری لەبیرەوەری نووسین نەکردۆتەوە. ئەو زۆرترین زانیاری لەسەر شاسوار جەلال (ئارام)و کۆمیتەی هەرێمەکان و سەرەتای شۆڕش و ململانییەکانی ناو کۆمەڵە هەیە.. تاد، نووسینەوەی ئەو زانیارییانە لەسەر ئەو قۆناخە بەرپرسیارێتییەکی گەورەیە، بۆ دەوڵەمەندکردنی کولتوری سیاسی کورد زۆر پێویستە. مەلا بەختیار، هەر زۆر بە وردی رووداوەکانی بیرماوە، بەڵام پلەی سیاسی و حزبی ئەو رێگای نادات بیرەوەری ژێر بەڕە بخاتە سەر بەڕە. شاسوار جەلال(ئارام) جوانەمەرگ نەبوایە، مێژووی کۆمەڵە بە شێوەیەکی جیاواز دەنووسرایەوە. ئەو نووسەرێکی

کارامه و بەتوانابوو. بەرچاوی روون و خۆی بە خاوەن پەیام دادەنا. لەو هەل و مەرجە سەختەدا بەردەوام دەینووسی. دەیزانی چی دەنووسێت و چۆن بیروباوەڕو هەڵویستی خۆی دەگەیێنێت! سالار عەزیز و ئازاد هەورامی، کەسایەتیان رۆمانسی شۆڕشگێڕ بوو، هەر لەکەسایەتی (هاملیت)ی شانۆگەریەکەی ولیەم شکسبیر دەچوو. هۆگرو متووی ئاوازو مۆسیقاو گۆرانی بوون. بە گۆرانی و مۆسیقاو ئاوازو سرورودی نوێ دیمەنی شۆڕشیان گۆڕی. لە کاری سیاسیشدا خاوەن هەڵوێست و تێڕوانین و بۆچوونی خۆیان بوون. عەیبەکەیان ئەوە بوو لە هونەری پاشقولگرتن، لە پشتەوە خەنجەر وەشاندنیان نەدەزانی. لە فرت و فێلکردنیشدا کۆڵەوار بوون. مەلا بەختیار لەماوەیەکی زۆر کورتدا بووە مەلا بەختیارێکی تر. لەناو شار سەرپەرشتیاری رێکخستن و پەیوەندییەکان بوو. دەستەی چەکداری بۆ ناوشار دەهێنایەوەو لەپەناوە رەمزێک لە رەمزە دزێوەکانی رژێمیان تەخت دەکرد. لەخوتبەدا شیشرۆنی* شۆڕش بوو. لەبواری نووسیندا دارەدارەی داڕشتنی نووسینی سیاسی بوو.

دەمەوێت بەراشکاوانە ئەوە بنووسم، ئێستاش پاش تێپەڕبوونی چل ساڵی رەبەق بەسەر ئەو قۆناخەدا، کەس ئەو قۆناخەی بە شایانی ئەوەی نەزانیوە، چوار لاپەڕەی لەسەر

---

* کارکۆس تولیوس شیشرۆن (١٠٦ ز ـ ٤٣ پ. ز) ناسراوترین گوتاربێژی سەردەمی رۆما بووە (فەیلەسوف، شاعیر، سیاسی، قانونی و پارێزەر بووە).

ڕەشبکاتەوە. نەنووسین لەسەر مێژووی ئەم دوو ساڵەی تەمەنی کۆمەڵە (١٩٧٦/١/١ ـ ١٩٧٨/١//٣١) بوارێکی فراوانی بۆ کەسانی ئاست نزم ڕەخساند، ئەسپی شەل و گێڕی تانە و تەشەری خۆیان لەم مەیدانەدا تاودەن. من نالێم: هیچ نەنووسراوە، بەڵام هەموو نووسینێک ناچێتە ئاستی کاری زانستیەوە: پاژێک لەنووسینە سیاسییەکانی ئارام گوڵبژێرکراوە. چەند وتارێک لەسەر ئەم کەسایەتیە نووسراوە. هەندێک لە ئەندامانی (کۆمیتەی هەرێمەکان) لەسەر پاژێک لەکارو چالاکی خۆیان لێدوانیان داوە. بینینی دارستان شتێکە و بینینی تاقەدارێکی دارستان شتێکی ترە.

هەڵسەنگاندن شتێکی ترە: شیکاری ورد بۆ قۆناخی پێش و پاش (کۆمیتەی هەرێمەکان) تۆ سلێمانی پێش (١٩٩١)ت نەبینیبێ، ناتوانیت بە ئاسانی لەسەر سلێمانی پاش ڕاپەڕین بنووسیت. ساڵی ٢٠٠٣ تا ئێستا، ئەمە قۆناخێکی جیاوازە. مێژووی کۆمەڵەی (جوانەمەرگ)یش سێ قۆناخە. کەسێک تەنیا باسی یەک خاڵ بکات، یان تەنیا خۆی ببینێت، یان تەنیا تیشک بخاتە سەر چالاکیەک لەچالاکیەکانی خۆی، ئەمە دەبێتە هۆی بە هەڵە تێگەیشتن، یان مانگرتن لە تێگەیشتن.

مامۆستا جەلال تۆفیق لە (دەراوی گورگان) بۆی گێڕامەوە: (پاش بیست سێ ساڵی تر باسی ژیانی پێشمەرگایەتی بۆ منداڵەکانمان بکەین. لە دڵی خۆیان دەڵێن: باوکمان خەڵەفاوە، یان قسە دەبزرکێنێت با بۆ لای دکتۆرێکی دەروونی بەرین..)!

سەرکردە هەیە، کاری زۆر سوودبەخشی ئەوتۆی نەکردووە، بەڵام توانای دەربڕینی باشی هەبووە: ئێستا ئەو لەناو خەڵکدا

فریشتەیە. ئەو کەسەی قوربانی داوەو بۆ فیداکاری کردووە، رەنگە بە شەیتان دانرابێت.

مەلا بەختیار رۆژی ۱۹۷۹/۱۰/۸ لەبن ناوی (باوکی ئاوارە) گوتارێکی نووسی بەناونیشانی (چەند تیشکێ بەسەر هەندێ لایەنی خەباتی کۆمەڵەدا)* لە گۆڤاری کۆمەڵە ژ (٦)

---

* مەلا بەختیار (باوکی ئاوارە) ئەم پەرگرافەی لە گوتارەکەی بەم شێوە دارشتوەو ئێمە بەبێ دەستکاری دەقە دادەگرین: (لێرەدا، راستەیەک هەیە، پێویستە نەیشارینەوەو بیخەینە روو، بۆ کەڵک وەرگرتن بۆ ئەوەی هەڵە دووپات نەبێتەوە، بۆ ئەوەی چیدی کارەساتی لەو چەشنە روونەدەن، ئەویش ئەوەیە، نەدەبوایە ئەو هاورێیانە مەیدانی خەبات جێ بهێڵن، کە بەجێشیان هێشت نەدەبوایە رێگای ئێران بگرنەبەر، هەق نەبوو، چاوی لای دوژمن بنوقێنن و هەروا بە ئاسانی بکەونە داویەوە.
لەو کاتەدا کە ئەوان نیشتمانیان جێ هێشت ناوەوەی نیشتمان، سەنگەری خەبات و خزمەتکردن و چەسپاندن و جێگیرکردنی کۆمەڵە بوو، نەک دەرەوە.
باروددۆخ هەرچۆنێک بێ، تێکۆشەرە راستەقینەکان دەتوانن بمێننەوەو لەئامێزی جەماوەری دڵسۆزدا خۆیان وەشارن و درێژە بە خەبات بدەن. تاقیکردنەوەش ئەو راستیەی سەلماندووە کە هەر کاتێک رابەرو کادیرە پێش کەوتووەکانی هەر حیزب و رێکخراوێک کۆری خەباتیان چۆڵ کردبێ و ویستبێتیان لەهەندەرانەوە خەبات بکەن و ئەرکی سەرشانی خۆیان بەجێبهێنن، لەکاتێکیشا کە نیشتمان پێویستی بەمانەوەیان بووبێ، ئەوە نەیان توانیوە وەک پێویست ئەرکەکانیان ئەنجام بدەن و سەرکەوتن بەدەست بهێنن، چونکە هەر ئەو سەرکردەو کادرانە جێگای بڕواو متمانەی هاورێیانی خۆیان و جەماوەرن کە لەرۆژانی تەنگ و پڕ مەترسی و ناخۆشی دا خۆیان رادەگرن و هەڵنایەن. خۆ ئەگەر هەر تەنها رۆژانی خۆشی سەنگی مەحەک بێ بۆ شۆرشگێڕن ئەوا بێگومان هەموو کەسێ شۆڕشگێڕە..).

بڵاوكراوەتەوە. مەلا پێش ئەوەی گوتارەكە بۆ من رەوانە بكات، پیشانی نەوشیروانی دابوو، ئەو دەست خۆشی لێكردبوو. پێشتر بە منیشی گوت: لەسەر ئەزموونی خۆت هەر جارە بابەتێك بنووسە!

من گوتارێكم لەسەر (شەڕی پارتیزانی) و (هەڵۆی سوور) نووسی.

مەلا بەختیار لەبری ئەوەی لەسەر سەرجەمی ئەزموونی خۆی لەناو (كۆمیتەی هەرێمەكان) دا بابەتێك بنووسێت، تەنیا دەست بۆ پاژێك دەبات: مەسەلەی رۆیشتنی سەركردایەتی بۆ ئێران و گرتنیان لەسەر سنوور، گوتارەكەیان وەكو (كراسەكەی عوسمان) بەرز كردەوەو فرمێسكی ناكامی و نائومێدی خۆیان بەسەریدا هەڵوەراند. ئەوەی راستی بێت فرمێسكی ئەوان ئەوەندەی بۆ پلەو پایە بوو، یەك لەهەزاری ئەوەش بۆ (كراس)ەكە نەبوو. ئەوان چاویان بەرایی نەدەدا ئەو رێكخراوەی ئەوان دایانمەزراندبوو، چوونە زیندانەوە، ئێستا ئەوان چاوەڕوان بوون، كاریان پێ بسپێردرێت. لەڕووی دەروونییەوە بۆ ئەوان كارێكی قورس بوو. ئێمەیش بۆ چارەسەرێكی گونجاو دەگەڕاین، هەردوولا پەسەندی بكەن.

مەلا بەختیار لەچەند دانیشتنێكدا زۆر بەڕێزەوە داوای لێبووردنی كرد، ئەگەر بە نامەبەست پریشكی وشەیەك كەسێكی بریندار كردبێت. نەوشیروان مستەفا لەدانیشتنەكەدا دانی بەوەدا نا، كە ئەو: هانی زۆربەی هاوڕێیانی داوە، لەسەر ئەزموونی خۆیان بنووسن و پێشتر گوتارەكەی خوێندۆتەوەو مەبەستی شكاندن و بریندار‌كردنی ئەوان نەبووە.

ئەو هەموو، روونکردنەوە و شێر و ڕێویە، دڵۆپێک ئاو بوو، بەسەر ئاسنیکی سوور سوورکراودا ڕژێنرا. فەرەیدون و عومەری سەید عەلی هەر دەیانگوت: ((کاک نەوشیروان ئێمەی (إحتضان) کرد، ئێوە ئێمەتان (إحتضان) نەکرد، وشەی (إحتضان) واتە: لەئامێزگرتن. ئێمە گەرمیانی بەسزمان و داماو هیچ شارەزاییمان لە فەلسەفەی (إحتضان) و (محتضان) نەبوو! ئیدی بۆیە ئەوان لەجۆری پێشوازیمان دڵیان گەردی گرت.

ئێمە ئەوکاتە هەموومان سۆفی و لەجیهانی سیاسەتبازیدا پۆلی یەکەمی سەرەتاییمان تێنەپەڕاندبوو. سەرقاڵی خەبات و فیداکاری بووین. بیرمان تەنیا لای ئەوە بوو، سەنگەرێک چۆڵکرا، دەبێ هەوڵبدەین زوو ئەو سەنگەرەکە پڕ بکرێتەوە. هیچ بڕیارێکی پێشەکی دراومان لەسەر هاوڕێیانی (گروە زیندان) نەبوو. پێمانوابوو ئەوانیش وەکو ئێمەن و زۆر پەرۆشی کۆمەڵەن و دەتوانین پشتیان پێ ببەستین!

ئێمە نەماندەزانی ئەمانە چەند کارامە و سیاسەتبازو پشوو درێژن و لەو سەرەوە دێنەوە و تا ڕۆژی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەش دەست لەناوی دەست بە یەکگرتوویی دەمێننەوە.

# نالا رادەستکردن

## (١١)

زۆرجار ئازاد هەورامی و من قسەمان دەکردەیەک. گوتمان: با ئاوێک بەم ئاگرەدا بکەین! ئێمە لەناوەندی کۆمەڵەش نەبین، هەزار کار بۆ خۆمان پەیدا دەکەین. لەیەکەم کۆبوونەوەدا، ئێمە دەست لە ئەندامێتی خۆمان لەناوەندی ـ کۆمەڵە هەڵدەگرین با دووان لەوان جێگاکانمان بگرنەوە.

لە یەکەم دانیشتندا، ئامادەبووم، دەست لەئەندامێتی ناوەندی ـ کۆمەڵە هەڵبگرم بۆ ئەوەی یەکێک لەوان جێگەکەم بگرێتەوە. ئازاد هەورامیش، بە ئەوپەڕی گیانی لەخۆبوردن و بەرپرسیارێتیەوە، دەستی لەئەندامێتی ناوەندی ـ کۆمەڵە هەڵگرت. لەئەنجامی دەست لەکارکێشانەوەی ئێمە، عومەری سەید عەلی و فەرەیدوون بەخۆشییەوە چوونە جێگاکانی ئێمە.

دیارە ئەمە یەکەم هەنگاوبوو بۆ لێدانی ئێمە و پاشتریش بۆ هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە. بێگومان دەبوایە کۆمەڵە ئەوکاتە کۆنفرانسێک ببەستێت و هەڵسەنگاندنێک بۆ هەردوو قۆناخەکە، یان هەرسێ قۆناخەکە بکات، ئینجا لەوێ بڕیاری هەڵبژاردنی سەرکردایەتی نوێ بدرێت. ئێمە لەخۆمانەوە سەیری ئەم و ئەومان دەکرد و قەت خەیاڵمان بۆ ئەوە نەدەچوو لە پشتەوە خەنجەری ژەهراوی بوەشێنین.

## د. قاسملۆ

## (١)

د. ئـەورەحمان قاسـملۆ (١٩٣٠ــ١٩٨٩) سـكرتێری گشـتی (دبیرکـل) حزبـی دیمـوکراتی کوردسـتانی ئێـران (حـدکا)بوو، پیاوێکی زانا، شارەزا لـەداب و نـەریتی کۆمەڵایـەتی و پەیوەندییـە نێودەوڵەتیـەکان، وەکـو کەسـایەتییەکی سیاسـی، کاریگـەر، دەستڕۆیشتوو، لە قسە و هەڵس و کەوت و خوێندنەوەدا، کەسی بەهاوشانی خۆی نەدەزانی.. مرۆڤێکی قورس و گران، بە توانا لە نوکتەگێڕانەوەو قسەی خۆش. کەسایەتیەکی دامـەزراو، دەیزانـی چۆن ڕێـزی خـۆی بسـەپێنێت و ناچـاری بەرامبەرەکـەی بکـات، بـەدرێژایی دانیشـتنەکە گوێی بۆ رادێرێـت، بـەبێ ئـەوەی شـتێک بەدەستەوە بدات. (حدکا)هێزبوو، دەیتوانی جەماوەر لـەموکریان و ناوچەکانی تریش ببزوێنێت. گفتوگۆ لەگەڵ ئێراندا بە بێ حـدکا بـەڕێوە نـەدەچوو. چونکـە ئـەم هێـزە لـەڕووی سـەربازییەوە، یـەکێک بـوو لـە کاریگـەرترین هێزەکـان. پەیوەندییـەکی پتـەوی لەگـەڵ رژێمـی پێشـووی بەغـدادا هـەبوو. چـەک و تەقەمـەنی و یارمەتی، بە بەردەم سمێڵی ئێمەدا تێدەپەڕی.

د. قاسملۆ خۆی بەهاوشـانی هیـچ سـەرکردیەکی کوردی ئـەو سەردەمەدا نەدەزانی! مـام جـەلال زۆر ڕێزی لێدەگرت و تێبینی و پەیام و ئاماژە ناڕاستەوخۆکانی ئەوی بەهەند وەردەگرت.

ڕۆژێکیان مولازم عومەر و من پێکەوە بووین، پێشمـەرگەکان ئاگاداریـان کردینـەوە، کـە شـاندێکی (حـدکا) بەسـەرۆکایەتی د.

قاسملۆ بەرەو بارەگای مام جەلال بۆ تووژەڵە دەڕۆن. مام جەلال لەوێ نەبوو. ئێمە دووسێ دەقیقەیەک پێش شاندەکە گەیشتین. مام جەلال نیوسەعاتێک دواکەوت. قاسملۆ لەرایەڵ و پەیوەندی جیاجیای مام جەلال لەکاروباری رۆژهەڵات زۆر پەست بوو. ئەو، کێشە قورس و ئاڵۆزەکانیشی بە نوکتەیەک چارەسەر دەکرد، ئەوەبوو گوتی:

((ئەرێ مامۆستا جەعفەر! مام جەلال بۆ ئەوەندە حەزی لە نامە نووسینە. هەر کوێخا دێیەکی لای ئێمە، بیست نامەی مام جەلالی لەبەر باخەڵی قایم کردووە! بۆ ئەوەندە نامە بۆ ئەو خەڵکە دەنووسێت؟ سەرکردەی سیاسی گەورە، خۆی لەنامە ناردن دەپارێزێت. ئەگەر کارێکی گرنگی بە کەسێک هەبوو، دەبێ راسپاردە بۆ ئەو خەڵکە بنێرێت، نەک نامە! ئەو ئەگەر ئەوەندە حەزی لەنامەنووسینە با رۆمانێک بنوسێت و بڵاویبکاتەوە!)).

مولازم عومەر بە شێوازی نوکتە و قسەی خۆش گرژییەکانی هێور کردەوە.

****

شەوێکیان لە بەنوخەڵەف ـماڵی کوێخا خدر ـماینەوە.

شاندی حدکا: د. قاسملۆ و غەنی بلوریان و فەتاحی کاویانی بوو.

شاندی ی. ن. ک: مام جەلال، مولازم عومەر، بەندە بوو.

ئێوارەکەی مام جەلال چاوەڕوانی ئەوە بوو، قاسملۆ دەستپێشخەری بکات و کۆمەڵێک چەک و تەقەمەنی و پارە

بەدیاری پێشکەشی شۆڕش بکرێت. د. قاسملۆ خۆی بە نوکتە لەچاوەڕوانییەکان دەدزیەوە.

بەیانی لەکاتی بەرچاییدا مام جەلال گوتی: ((ئەمشەو خەونێکی خۆشم بینی!)).

ئێمەش هەموو گوتمان: ((خوا بەخێری بگێڕێت!)).

مام جەلال درێژەی بە گێڕانەوەی خەونەکەی خۆی دا: ((لەم خەونەدا د. قاسملۆ ١٠٠ کلاشینکۆف و ١٥٠ ژێ سێ و ٢٠ رەشاش و نیو ملیۆن دیناری داینێ. مام غەنیش ٨٠ کلاشینکۆف و ١٢٠ ژێ سێ و ٢٠٠ هەزار دیناری بەدیاری داینێ..)).

د. قاسملۆ کەسێک نەبوو لەخەو پەرژین تێنەگات و پەیامی بەرامبەر نەخوێنێتەوە، یەکسەر گوتی: ((ئەوەی مام غەنی دەتانداتێ یان ناتانداتێ ئەوەی خۆی دەزانێت! بەڵام ئەوەی من تەنها هەر خەون دەبێت!)).

# هەڵوەشاندنەوەی بڕیاری م. س
# (٢)

کۆتــایی ئــابی ١٩٧٩ ئێمــە جــاری لــەداوداوی بــووین، بانگــەوازێکی (م.س)مــان پێگەیشــت، بەدەســتی مــام جــەلال داڕێژرابوو، بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی لە رادیۆو چاپکردنی: داوا لە هەرێمەکانی یەکێتی دەکات: چوار هەزار پ. م، سەنگەر بۆ ئەودیو بگوازنەوە، پشتیوانی لەهێزەکانی حدکا بکەن!

چەنـد جارێـک بانگەوازەکـەم خوێنـدەوە، هـیچ تێنەگەیشـتنم! گۆڕانکـاری بنـەڕەتی بـوو(١٨٠) دەرەجـە لەسیاسـەتی ی. ن. ک بەرامبەر ئەودیو. دەیان پرسیار خۆیان وروژاند:

- یەکێتی بە راشکاوانە دۆستی کۆمەڵە و شێخ عیزەدین بوو، حـدکا دوورتـرین نزیـک بـوو. تـەم و مـژی گومـان و نیشـانەی پرســیار هەمیشــە رایــەڵ و پردەکــانی نێــوان هــەردوولای دادەپۆشی!

- دەستوەردانی یـەکێتی لـەڕووداوەکانی ئـەودیو، دیاریکراو و سنوردار بوون!

ـــــ دوو رۆژ پێشـــــتر (م. س)ی (ی. ن. ک) و (حـــــدکا) کۆبوونـەوەی هاوبەشـیان هـەبووە، دوور و نێزیـک ئامـاژە بـۆ سیاسەتی هاوبەش و تێگەیشتنی هاوبەش بەدی نەکراوە!

ســەعاتێک پــێش پەخشــکردنی بەرنامــەکان، بــەهۆکی تــۆکی پەیوەندیم بە مولازم عومـەرەوە کرد. بە زمانی کۆدی داخراو قسەمان دەکرد:

((ئەگەر بانگەوازەکە ئەم ئێوارەیە بڵاو نەکرێتەوە زیانی بۆ پەزەکان دەبێت؟)).

مولازم عومەر گوتی: ((پێش نیوەڕۆ کۆبوونەوەی (م. س) هەبوو، بەداخەوە تۆ لێرە نەبوویت. بڕیارەکە بڕیاری (م. س)ە!)).

من گوتم: ((هەشتەش لەسەر مەشتە! با ئەمڕۆ نەبێ بەیانی بێت!)).

مولازم عومەر گوتی: ((من ئاگاداری مام جەلال دەکەمەوە. با چاوەڕوانی بڵاوکردنەوەی بەیانەکە نەبێت..)).

من گوتم: ((بڵاوبکرێتەوە کێشەی تێدەکەوێت، دواتر بۆمان چارەسەر ناکرێت!))

ئەو گوتی: ((چاکتر وایە پاش پەخشکردنی بەرنامەی ئەمڕۆ خۆت بۆ ئێرە بێیت و دوو بە دوو قسەی لەسەر بکەین!)).

سەعات هەشت لە مەکتەبی عەسکەری بووم. ئەوەی راستی بێت، من ویستم بزانم: ئەم دوو رۆژە، کە من لە داوداوێ بووم چی ڕوویداوە؟

گوتم: ((کاک عومەر! لە نووسراوەکەدا نووسراوە چوار هەزار (پ. م) ئاودیوی سنوور بن. ئەم هەموو هێزە بڕوات، لەدیوی خۆمان چۆلەکەش نامێنێتەوە، بەرامبەر سوپای عێراق بگرێت!

دووەم: ژمارەی هەرێمی پێنج چەندە؟)).

مولازم عومەر گوتی: ((٨٠ پ. م !)).

من گوتم: ((ئەی ژمارەی هەرێمی دوو؟)).

هەرێمەکانم یەک بە یەک ژمارد و کورتی هێنا.

گوتم: ((ژمارەی (پ. م)ی هەرێمی پارێزگاری چەندە؟)).

ئەو گوتی: ((١٥٠٠ پ. م!)).

گوتم: ((ئایا هەمووی شەڕکەرن و دەتوانن ڕەوانەی شەڕگەکان بکرێن؟)).

ئەو گوتی: ((٣٠٠ پ. م شەڕکەرن و شارەزایی شەڕی پارتیزانیان هەیە!)).

من گوتم: ((لەگەڵ حدکا هیچ تێگەیشتن و هاوئاهەنگی هەیە؟)).

مولازم عومەر گوتی: ((هەروەکو جارانە و هەر ئاگاداریش نین، ئێمە ئەم بڕیارەمان داوە!)).

من گوتم: ((ئەی دیوی عێراق: سەدام بەڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ پەیامی ناردووە، ئاڕاستەی لوولەی تفەنگەکان بە دیوی ئەملادا بگۆڕین؟)).

ئەو گوتی: ((ڕژێمی بەغدا لەهەل و مەرجی ئەمڕۆدا ئامادە نییە هیچ بدات، نە بەڕاستەوخۆ نە بە ناڕاستەوخۆ، داواشی نەکردووە سادەترین پەیوەندییان لەگەڵماندا هەبێت!)).

من گوتم: ((ئازووقەی چەند ڕۆژمان هەیە؟)).

ئەو گوتی: ((تەنیا یەک هەفتە!)).

من گوتم: ((با دوو هەفتە بێت!)).

من پرسیارێکی زۆرم کرد، وەڵامەکەی لە قازانجی ڕەوانەکردنی چوار هەزار پ. م نەبوو. لە ئەنجامدا من پرسیارێکم لە مولازم عومەر کرد:

((شەڕی کوردستانی ڕۆژهەڵات سوودی چییە و ئەنجامی چییە؟ ئەمە حەوت مانگە شا ڕووخاوە، ئەم پەلە پەلە چییە لە شەڕ هەڵگیرساندن!)).

با ئێمە نەبینە کەوا سووری بەر لەشکر، نەبینە بەشێک لە کێشەکان و ببینە بەشێک لەچارەسەر. داوا لە ئێران بکەین گفتوگۆیان لەگەڵدا بکات. گفتوگۆ بۆ هەردوولایان باشە. با کوردی رۆژهەلات بە دەستی خۆیان ولاتەکەی خۆیان کاول نەکەن!)).

مولازم عومەر پشتیوانی لە پێشنیازی گفتوگۆ کرد.

بۆ رۆژی دوایی سەردانی مام جەلالمان کرد. سەر لەنوێ تێروانینی خۆمم پێشکەش کرد. ئەویش پێشنیازی گفتوگۆی پەسەند کرد، بەبێ کۆبونەوەی (م. س) بڕیارێکتر دەرکرا. بڕیاری ئەمڕۆ ۱۸۰ دەرەجە پێچەوانەی بڕیاری دوێنێ بوو. نامەی رەوانەی سەردەشت کرد، پەیوەندی بە داریوش فروهەرەوە بکرێت و داوای لێبکرێت لەگەڵ هێزە کوردستانییەکاندا گفتوگۆ و رێگای دیالۆگ و لە یەکتر تێگەیشتن بگیرێتەبەر و بە شێوەی دیموکراسیانە و ئاشتیانە کێشەی گەلی کورد لەودیو چارەسەر بکرێت.

داریوش فروهەر بە بروسکە مام جەلالی ئاگادار کردەوە، حکومەتی ئێران ئامادەیە بۆ دانیشتن و دیالۆگ و دۆزینەوەی چارەسەر.

لە هەمان کاتدا رێگەیاندا ئازووقە بهێنین و کارئاسانی زۆریان بۆ کردین. پەڵە هەوری گرژی و سرکە بارین بە ئاسمانەوە نەما.

مام جەلال گوتی: ((مامۆستا جەعفەر تۆ نەبویتایە کێشەیەکی گەورەمان تووش دەبوو، چارەسەرکردنی ئاسان نەبوو..))!

## میهرەجان ـ تەقینەوە

## (٣)

میهرەجـانی دووەمـی شـیعری کـوردی ٢٩ ــ ١٩٧٩/٣/٣٠ لەشـاری سلێمانیدا گیرا. سـی و نۆ شـاعیر بەشـداربوون. دوو سێ شـاعیری لاو دەنگیـان دلێربـوو. بـەبێ تـرس و دوو دڵـی رووبەڕووی رژێم وەستان و پەنجـەیان بە چاوی جەلادەکانـدا دەکـرد. هەڵوێسـتی ئـەمان هـەر زۆر لـە هەڵوێسـتی (محمـود درویـش و سـمیح القاسـم و...)توندتربوو، لەگـەڵ تێبینیکردنـی جیاوازی عەقڵی دەسـەلات لـە هـەردوو ولاتدا. کـورد، شـاعیری زۆر ئـازای هـەبوو، کـەچی ئـەدەبی بـەرەنگاری بـەو شـێوەیە لەدایک نـەبوو، کە ناسنامەیەک بە گەلێک ببەخشێت. دەکرا لای ئێمەش، ئەم رۆژە وەکو رۆژی وەرچەرخان لە مێژووی گەلی کوردسـتان تۆمـار بکرێـت. وەکـو شـۆڕش و سـەرەتای ئـەدەبی بەرەنگاری پێشوازی لێبکرێت.

کێشـەکە لای شـاعیرو نووسـەرەکان نـەبوو. کێشـەکە لای ئاستی ئـەقڵی سیاسـی کوردییـە، کە ناتوانێت سـنووری لـۆژیکی کوێخایەتی تێپـەڕێنێت و لـە یـەک بازنـەی بەتاڵدا دەسـووڕێتەوە. ئەدەبی بەرەنگاری، لە زامالێ* پرۆژەی بزاڤی رزگاریی نا ئاشـنا بە رۆشنگەری و رینیسانسدا لەدایک نابێت.

رژێمی تۆتـالیتری بـەعس، بـە تیرۆرو تۆقانـدن و داپلۆسـین، بـواری جوڵـەو هەناسـەدان و چاوکردنـەوەی نـەدەدا. بێگومـان لـەناو هـۆڵی میهرەجانەکـەدا، جگـە لـە پارێزگـار و لێپرسـراوە

---

* زامال: منالدان.

گەورەکانی رژێم، تۆڕێکی چڕوپڕی چاودێری و راپۆرتنووسانی سووک و سەلیم، دیواری ترس و لەرزی لەمێشکی پاژێک لە بەشداربواندا ئەستووتر دەکرد. ئێمە لەشاخ، لەرێگەی جیاجیاوە، کاسێتی شیعرەکانمان پێگەیشت. دەستە دەستە پێشمەرگەکان، بە رامانەوە گوێیان بۆ شیعرەکان رادەدەێرا. کەس نەیدەتوانی بە ئاسانی بڕوا بەوە بهێنێت: ئەم شیعرانە لە میهرەجانێکی شیعریدا لەشاری سلێمانی خوێنرابنەوە. بڕواشمان نەدەکرد. شاعیرەکان بە زیندوویی، قاچیان لەدەرگای هۆڵی میهرەجانەکە ترازابێت. من ئێستاش دەنگی (هەڤاڵ کوێستانی، حەمە سەعید حەسەن، محەمەد بەدری، ناسر حەفید..) لەناو گوێمدا دەزرنگێتەوە.

ئایا لەمێژووی گەلی کورد لەسەدەی بیستەمدا، شیعرێک بەرچاو دەکەوێت بتوانرێت نێوی لێبنرێت (شیعری بەرەنگاری) لە بیستەکانی سەدەی رابووردودا ناوی (حەمدی، پیرەمێرد، شوکری فەزلی، شێخ محەمەدی خالسی،...) هەروەها رۆمانی (لەخەوما) بەرچاو دەکەوێت، سەری رمی شیعرەکانیان ئاڕاستەی دەسەڵاتی کوردی کراوە، نەک دەسەڵاتی داگیرکەر.

دوای لێدانی بزوتنەوەی رزگاری کورد (١٩٧٥) رژێم پێیوابوو، سەربەرزکردنەوەو هەڵسانەوە جارێکی دی، خەونە! لەپڕ، تەنیا حەوت مانگ پاش هەرەس، ئەنوەر قادر محەمەد لەبن ناونیشانی (وەرەخواریێ... ئەی خواکەی غەریبان لە کلکەی هەوری ئاڵەوە وەرە خوارێ)ی بڵاوکردەوە. هەموو رووناکبیرێک پاش خوێندنەوە شیعرەکە هەستی دەکرد:

گەلی کورد چۆن کپ دەبێت و بورکانێکی تر چاوەڕوانی تەقینەوە دەکات.

خۆ من چەمە زستانە نیم، هەر هاوین هات هەڵبڕوکێم
ئەستێرە نیم، شەو نەبێ نەتوانم بفڕم
خۆریش نیم، بە باڵە مەڵە، بەرۆژدا ئاسمان تەی بکەم
چۆن کپ ئەبم!
بەڵام گیانە هەر کە ویستم تەنیا شیعرێ بۆ تۆ بڵێم
لێزمەی فرمسێک بوو بەدێڕ و بوو بە سنووری
ولاتێ..
ناویان نا ولاتی گریان
وەختێ وتم: ئەو باڵابەرزو شەنگەی تۆ
بە کلووری هەموو دنیا ناگۆڕمەوە
دووربا.. دووربا.. قەبری (عەنبەر خاتوون)م دی
باسی چی بکەم
بۆ خەوی زڕاویان ئەبەم
ئەبمە باران و سبەینێ
بەسەر لووتکەدا دا ئەکەم
چۆن کپ ئەبم؟!

من سەرەتا پێموابوو، ئەم شیعرە، لەسۆنگەی چڕی تەم و مژ، بەدوای یەک ریزکردنی میتافەکان دا•، تەکنیک و تان و پۆی رەوانبێژی، بەبێ پرس و ترس بە بەرچاوی شمشێری سانسۆردا تێپەڕیوە. ئەم شیعرە یەکەم شیعری بەرەنگاری بوو، یەکەم تەقینەوەی ناوەڕاستی پایتەخت بوو. ئەم شیعرە بۆ مانگی ئۆکتۆبەری ١٩٧٥ لووتکەی ئاڵەنگاری و رووبەڕووبوونەوە بوو. رووناکبیرانی ئەو سەردەمە شیعرەکەیان بە یەکەم پریشکی

• میتافە: metaphor : وێنەی شیعری.

ئاگری شۆڕش دادەنێن. دەزگای سانسۆری رژێمیش بە یەکەم نیشانەی سەربەرزکردنەوەو هەڵسانەوەی تێگەیشتن.

پاش بڵاوبوونەوەی (وەرە خوارێ ئەی خوای غەریبان) چەند قەسیدەیەکی (رەمزی) و (نیمچە رەمزی) بڵاوکرانەوە، کە بە ئاسانی بۆنی نارەزایی و یاخیبوونیان لێدەکرا، بەڵام تا کۆتایی ئازاری ١٩٧٩ تەقینەوەی راستەوخۆ، بورمەلەرزە رووینەدا وەکو ئەوەی لە میهرەجانی دووەمی شیعری کوردی روویدا: ئاماژەکان رۆمانسی و بارگاوی بوون بە لێکدانەوەی جیاجیا:

**ئەرۆم دایە!**
**ئەگەر ئیتر نەهاتمەوە**
**ئەبم بە گوڵ لەو چیایە!**

دیارە هەل و مەرجی سیاسی، تیرۆر، تاساندن، لەبەردەم ئاوات و هەستی شاعیردا، لەمپەری سەخت و ترسناک بوون. شاعیر نەتوانێت ببێتە (گوڵ لەو چیایە!) ئەوە ئەمسەرو ئەوسەری هاوکێشەکە نییە! مەرج نییە سەرجەمی شاعیرو نووسەران بۆ چیا برۆن! مەرجیش نییە ئەوەی لەشاخ بێت دەبێتە گوڵ . ئێمە لەو شاخە درووپشک و قاڵۆنچەشمان بینیوە. یەڵمازگۆنای لەچیا نەبوو، لە زیندان و دیوی ئەودیوی دەرگای ئاسنین ژیانی بەسەربرد و بوو بە گوڵێک و لەبەرۆکی مرۆڤایەتی درا. نیلسۆن مەندێلا پاش بیست و حەوت ساڵ زیندانی و ئازار، دوای ئازادکردنی بەگوڵی مایەوە!

**هەڵەبجە(غەززە)ی خەمناکە و**
**مندالانی پۆلیس بەردەباران ناکەن،**
**دووکاندارەکانی دووکان**

بەرووی پۆستاڵدا داناخەن،
سلێمانی (سۆیێتۆ)یەو
گەنجەکانی دەست نادەنە یەخەی
سیخوڕ،
هەموو گوندێکی کوردستان
چاوەڕوانی ئەنجامەکەی (گێرنیکا)یەو
کەچی رۆژنامە و گۆڤارو
ئاژانسی دەنگوباسەکان
نوستووی گوێی گان
وروووژاوە
هەر شارەزەدەواڵە و وروووژاوە،
هەر قوتابی قوتابخانەکەی هیتلەرەو
گەڕی لەم ناوە ئاڵاوە

شیعری (هەڵەبجە غەزەی خەمناکە) پاش چل ساڵیش میدالیای زێڕینی وەرنەگرتووە، لەخوێندگە و زانکۆ و میدیای ئەمڕۆدا جێگای گونجاوی خۆی پێنەدراوە. ئێمە لەبەرئەوەی فەرهەنگی سیاسیمان زۆر لاوازە، ناتوانین دوو هەڵوێست هەڵاوێر بکەین: شاعیر لەتاریکترین مێژووی لەناوبردنی گەلی کوردا، چۆکدانادات، سەنگەر لێدەدات، بەتوندترین شێوە هێرش دەکاتە سەر رژێم. هەمان شاعیر روو لەشاخ دەکات، پاژێک لە کەسایەتی و سیاسەتی کوردی بەدڵ نابێت، بەرامبەر رێبازو ئاکاری ناڕاست، بێدەنگی هەڵنابژێرێت. ئامادە نابێت ببێتە (شاعیری حزب) چەپڵە بۆ کەس لێنادات و سەرکردەکان تووڕە دەکات. لەو رۆژەوە حەمە سەعید حەسەن لای ئەوان

لەدەفتەری (نەبووان)دا ناوی دانراوە و کەس بۆی نییە ئەوی بیر بکەوێتەوە!

سەیرە نۆ ساڵ پێش لێدانی هەڵەبجە بە چەکی کیمیایی، شاعیر پێشبینی کردووە، رژێم دەست بخاتە بینی ئەم شارە. پێشبینی ئەوەشی کردووە چارەنووسی هەموو گوندێکی کوردستان لە (گێرنیکا)ی سەردەمی فرانکۆ باشتر نابێت.

که تۆ هاتیت
دوا نامەتم دەخوێندەوە
بە خەتێکی سور نوسیبوت: ـ
ئەشکەوتەکان نارِوخێن و چوک دانادەن
ئەمجارەیان...
چیاکان تارای، سپی بەفری لوتکەکانیان....
ناکەن بە ئاڵای تەسلیم بوون و...
سەری بەرزیان بۆ هیچ شایەک نەوی ناکەن
ئەمجارەیان...
هەر گەر دەلوولێ هەڵبکا
لەبیابان بێ یاخود چیا
خۆڵەمێشی سەر پشکۆکان، بۆ دوورترین جێگا دەبا
ئەوسا پۆلۆی ئاگردانی توانای ئێمەش
گڕ لە پووشووی زەبروزەنگی هۆلاکۆی بەغدا بەر دەدا
ئەوسا چاوی حەزی ئێمەش
لەجێ ی هەر بۆمباو هەر مینێ
داری ئازادی دەبینێ

(دوا نامــه) کــەی هــەڤاڵ کوێســتانی لووتکەیــەکي تــرە لــە لووتکەکانی شیعری بەرەنگاری. مەخابن ئەو لەسەر ڕێبازەکەی خۆی ئەوەنــدە بــەردەوام نــەبوو. دووســی هۆنراوەیــەکی تــری هۆنیەوە و درێژەی بەو ڕێگایە نەدا. کێ دەیوێراو ئەو سەردەمە نـاوی (هۆلاکۆی بەغدا) بهێنێت و بەدەنگی بەرز هـاوار بکـات: ئەمجارەیان شۆڕش تووشی نوچدان و نسکۆ نابێت؟

گۆنـەری شیعری بـەرەنگاری زۆر کورت بوو. هـەڤاڵ لەشار نەمایـەوەو ڕوویکـردە شـاخ. شـاخ پێویسـتی بـە (مامەریشـە) و (فەرەج تریفەیی) و (ئەحمەد گریانە) و (ئاسۆی دەلاک)بوو، نـەک شاعیرو چیرۆکنووس و هونەرمەند.

هەڤاڵ لەشـاخ چەند هۆنراوەیـەکی نووسی، دەتوانرێت وەکو مەڵۆیـەک لەسـەرخـەرمانی ئـەدەبی بـەرەنگاری دابنرێت. شـاعیر مۆتیڤی نەبێت ناتوانێت بنووسێت، بەشێک لەسەرکردەکان ڕقی دنیایـان لەشـاعیران بـوو. کـەش و هـەوای شـۆڕش یارمەتیدەری بارانی شیعر نەبوو.

ئـەو ڕەنگـە بەلایـەوە ئاسـان نـەبووبێت، وەکو حەمـە سـەعید حەسـەن شـیعر بکاتـە خەنجـەر و نـووکەکەی لـەبن گـوێی ((سـەرکردە)) مەزنـەکانی شـۆڕش بچـەقێنێت. ئـەو نەشـیدەتوانی وەکو شێرکۆ بێکـەس بـەگوێرەی دڵـی سـەرکردەو فەرمانـدەی کـەرت و هەرێمـەکات شـیعر بنووسـێت: هـەر پێشـمەرگەیەک شەهید بوو، یەکسەر شیعرێکی لەسەر بنووسێت. شێرکۆ شـان بەشانی ڕاگەیاندنی یەکێتی کاریگەری خۆی هەبوو.

چـوار سـاڵ زینـدان پشـکۆ نەجمـەدینی کـردە شـاعیر. بنـاری (شـنروێ)و (باڵانبۆ)کانیـاوی شـیعریان لای ئـەو نەتەقانـدەوە، کاتێـک هەڤاڵـەکانی دوێنـێ ، لـەناو گـەوڕو شـیاکەدا دەسـتیان

لەپشتەوە بەستەوە، دەرگاکەیان خڕ لەسەر داخست، پەپوولەی شیعر ئازارەکەیان کەمتر دەکردەوە.

یەکێکیتر لە سمبۆلە گەش‌و دەگمەنەکانی ئەدەبی بەرەنگاری حسێن مەولوودە، کە لە ناو شۆڕش ناوی لێنرابوو: مەلا عەلی (١٩٥٢-١٩٧٩ ) ئەم شاعیرو کادرە سیاسیە، بە دەستێک قەڵەم‌وبیر، بە دەستێکیتر کلاشینکۆف‌و چەک. ڕۆژی ١٩٧٩/١/٣٠ لە سۆنگەی غەدرو خیانەت‌و بێشەرەفی جاسوسێکەوە بە برینداری دەستگیرکرا. ڕۆژی ١٩٧٩/٧/٢٧ ئیعدام کرا. لە ماوەی کەمتر لە شەش مانگدا، پتر لە (٣٥) هۆنراوەی لە بن سێبەری سێداردا نووسیوەو ڕەوانەی ئەودیوی دەرگا ئاسنینە داخراوەکان کراوە. ئەو سەرجەمی شیعرەکانی بەوردی لە سەر کاغەزی ناو پاکەتە جگەرەو یەک دیناری و دە دیناری نووسیوە.

کەسێک لە نێو چوار دیوارو پشت دەرگای ئاسنینی داخراو، پاسەوان، چاودێری چڕ، شیعری زۆر جوان‌و بەرز بنووسێت ، ئەمە چ شێرێک‌و چ پاڵەوانێک بووە؟

ئەمەیە گیانی بەرزی نەبەزین‌و چۆکدانەدان‌و بەرەنگاری بێسنوورو بێوێنە. مرۆڤێک سوور بزانێت، پاش چەند ڕۆژێک، پەت، هەڵواسین چاوەڕوانیەتی، کەچی ئەو وەکو" پیرەمەگروون"و "قوچباش"و "لالش" زەق زەق سەیری نێوچاوی مەرگ دەکات‌وچاو ناتروکێنێت. دێتەوە یادی شەوێکی قەندیل :

ئاسمان ئاوێنەی پێش کەژاوە بوو
سامالێکی بێ، هەورو ژاوە بوو
بەلام ئاسمان‌و زەوی ئەندێشەم
شانۆی نواندنی سەر ئاژاوە بوو

.....................................

له دلما تۆوی چەند بیرەوەری
سەوز بوو، گوڵی کردو، هەڵوەری
دیسان بۆ وەرزی تازە تۆوی رشت
تا، بێ گوڵ نەبێ بۆ کوێرەوەری

.....................................

لەو جێ ڕەشماڵو هۆبەو هەوارە
لوت بە بۆن کەوتو چاو بە شەوارە
بۆیە تا ئێستاش ناتوانم باسی
تەواو بنوسم دەست کوڵەوارە

لووتکەی چەکوش، سەری سادروبناری کۆدۆ. ئەو کەمتر لە بیستو حەوت ساڵ ژیا: بڕوانە وێنە شیعرەکانو میتافەو دەنگی مۆسیقاو داباریني فەنتازیاو توانەوەی رەوانبێژی لە ناوکێشو سەروادا. فەرهەنگی زمانو وشەی پڕ لە ئاوازو مۆسیقا، لە بەردەم قەمچی جەلادو پەتی سێدارەدا، دەتەقێتەوەو قەتیس نابێت.

# گەشەکردنی مەکتەبی راگەیاندن

## (٤)

مەکتـەبی راگەیانـدن رۆژ بـەرۆژ فراوانتـر دەبـوو. لـەپایزی ١٩٧٩ بۆ پـایزی ١٩٨٠ بـە لێشـاو لاوانـی خـوێن گـەرم روویـان لەشـاخ دەکـرد. ژمارەیـەک شـاعیرو نووسـەرو روونـاکبیر، مەکتـەبی راگەیانـدنیان ئـاوەدانتر کـردەوە. دیارترینیـان: هـەڤاڵ کوێسـتانی، جـەمیل رەنجبـەر، ئاسـۆ عـەلی، بورهـان مسـتەفا ــ فـەرهاد ــ ئـازادی حـاجی عەبـدوڵلا هـەورامی، ئومێـدی سـەعید گەوهەر (حاجی ئومێد)...

کۆتایی ١٩٨٠ ئەبو بەکر خۆشناو، فەرهاد سەنگاوی، ئومێدی مەلا رەزا، حاکم عومەر عەزیز ژاژڵەیی هاتن... ئەم تیمـە تیمێکی بەهێز بوو. ئەندامانی تیمەکە، هەموویان مرۆڤی دڵسـۆزو کارامـە و بـەرێزبوون. قورسـایی بـەڕێوەبردنی راگەیانـدنی یـەکێتی و کۆمەڵە لەسەرشانی ئەم هاوڕێیانە بوو.

هەڤاڵ کوێستانی پێش ئەوەی، خۆی بگاتە تووژەڵە((دوانامـە)) لــە هــەموو کــۆڕو کۆبوونەوەیەکـدا ئامــادە بــوو. زۆربــەی سەرکردەو کادرو پێشمەرگەکان شیعرەکانیان ئەزبەر بوو.

دەنگدانــەوەی ئــەم شــیعرەو (هەڵەبجـە غــەززەی خەمناکـە) ســنووری پێشــبینی و تینویــەتی و ئــاواتی خــەڵکی تێپەڕانــد. نەماندەزانی کاردانەوەی رژێم بەرامبـەریان چـی دەبێت؟ بەپەتی سێدارەوە دەیانبینین، یان لـەناو کۆڵانێکدا ((کەسـانی نەناسـراو)) بە دەمانچەی بێدەنگ ساردیان دەکەنەوە. ئەم شیعرانە لووتکەی

بوێری بوون. هەڤاڵ زوو ماڵئاوایی لەشار کرد و لە راگەیاندن گیرسایەوە. ئەو ئەقڵی سیاسی کوردی بە باشی نەخوێندبووەوە. ئەوان شەیدای هاش و هووش و کەش و فشی تاوس بوون. کەس هیچ خوێندنەوەیەکی قووڵی بۆ بەرهەم و پەیامی ئەدەبی و سیاسی نەبوو. نەیاندەزانی گرنگی (ئەدەبی بەرەنگاری) چییە!

ئەبو بەکر خۆشناو: شاعیرێکی لاوبوو. دیوانێکی بچوکی (کۆلۆمبس کیشوەرێکی تر دەدۆزێتەوە) بڵاوکردەوە. نەمبیستووە دیوانی دووەمی رەوانەی چاپ کردبێت. مرۆڤێکی هێژاو قورس و گران بوو. بەشێکی زۆری خۆشنووسی و کارەکانی راگەیاندن لە ئەستۆی ئەوبوو. دواتر خۆی بۆ وەرگێران تەرخان کرد و دەستەبەرداری شیعر بوو.

جەمیل رەنجبەر: بە تەمەن لە ئێمە گەورەتر بوو. زۆر هاورێی کاکم بوو. لە هەولێر یەکترمان ناسی. دیوانێکی هەبوو. شیعرەکانی ناگاتە ئاستی شیعری بەرەنگاری. ماوەی مانەوەی لە راگەیاندن زۆر کورت بوو. دەستەیەک پ. م بەرەو بناری قەندیل رۆیشتن. پێیگوتم: دەمەوێ لەگەڵ پێشمەرگەکاندا گەشتێک بکەم. لە شەرێکی سەختدا، هەلیکۆپتەر چەندین پێشمەرگەی شەهید و بریندار کرد، یەکێکیان جەمیل رەنجبەر بوو.

حسێن بەفرین: لەشار دیوانی (گرێبەند)ی بڵاوکردەوە کە بەنموونەی ئەدەبی بەرەنگاری دادەنرێت. دیوانێکی لە شاخ چاپکرد بەناوی (خاک و خوێن). مرۆڤێکی هەست ناسک، یەکجار بەرێز، سەربەرزو خاوەن هەڵوێست. رەخنەی زۆری بەرامبەر

به شۆڕش هەبوو. ئێستاش هەندێ بڕگەی شیعرێکی لە گوێمدا دەزرنگێتەوە: (ئاخ لە جەرگم! ئۆف لەمەرگم!).

ماوەیەک بزربوو. بە نامەیەک بۆ مولازم عومەر زانیمان لە کوردستان رۆژهەلاتە: (لەکاتی زەردەوە بۆ سەردەشت رۆیشتم. لەوێشەوە بۆ بۆکان. لە غەریبییەکەوە بۆ غەریبییەکی تر..). رۆژێکیان لە ئەمستەردامەوە بۆ لۆزان چووم. دوو رۆژ لەوێ مامەوە لەگەڵ کیژێکی هاوڕێم بۆ فلۆرەنس چووین.. لەسەر دەریا سەیری شەپۆلە تووڕەکانم دەکرد، لە کاتی خۆراوابوندا، نامەکەی حسێن بەفرینم بیرکەوتەوە. مرۆڤ لە شوێنی خۆی هەڵکەنرا چەند قورس و ناخۆشە!

# جۆش و خرۆش
## (٥)

کادرەکانی مەکتەبی راگەیاندن دەورێکی گرنگیان لە دەوڵەمەندکردنی زمانی نووسینی ئەدەبیاتی سیاسیی کوردی گێڕا.مام جەلال نووسینەکانی خۆی بۆ تایپکردن رەوانەی ئێمە دەکرد. زۆرجاریش بۆ میوانی سەردانی دەکردین، هەلێکی باش بۆ گفتوگۆو بیروڕا گۆڕینەوە دەهاتە پێشەوە. نووسەر و شاعیرەکان راشکاوانە رەخنەی خۆیان لێدەگرت. هەندێ جار ئامادە نەبوو دەستکاری نووسینەکەی خۆی بکات و لەسەر تێگەیشتنی پێشووتری سوورتر دەبوو. هەندێ جاریش بیروڕای بەرامبەرەکەی پەسەند دەکرد.

بۆ نمونە: گوتارێکی بۆ ناردین پڕبوو لە دەستەواژەی (جۆش و خرۆش): رۆژی نەورۆز جەماوەر هاتە جۆش و خرۆش. هەڤاڵ کوێستانی بە مام جەلالی گوت: دەستەواژەی جۆش و خرۆش لەڕووی زمانەوانیەوە هەڵەیە. هەڤاڵ لەسەر هەق بوو: (جۆش و خرۆش) مانایەکی تری هەیە. مام جەلال هەفتەیەک دواتر گوتارێکی بۆ ناردین شەش ئەوەندەی گوتارەکەی پێشوو (جۆش و خرۆش)ی بەکارهێنابوو.

ئەو زۆر (زەروو بابەت)ی بەکاردەهێنا بەرامبەر (طفیلی)ی عەرەبی: واتا: کەسانێک، کە خۆیان کار ناکەن و هیچ بەرهەمێکیان نییە، لەسەر پارەو کارو داهاتی ئەم و ئەم دەژین بەبێ ئەوەی شتێکیان کردبێت. هەڤاڵ کوێستانی (زەروو بابەت)ەکانی بە (مشەخۆر) گۆڕی. ئیدی لەو رۆژەوە مشەخۆر بووە چەمکێکی سیاسیی باو.

## سیروان مەجید ماوەتی و نەوشیروان
## (٦)

مامۆستا شەریف و حاکم عومەر عەزیز، کە هەردووکیان ئەندامی سەرکردایەتی (بسک) و (ی. ن. ک) بوون، بڕیاری گەشتێکی ناوچەی ئالان و سەفرەو زەروونیان دابوو. وێڕای دەستەیەک پ. م گوند بەگوند دەڕۆن. پێشمەرگەیەک نوکتە و قسەی نابەجێ ی هەڵڕشتبوو. مامۆستا شەریف زۆرجار، پێش ئەوەی نوکتەیەک بگێڕێتەوە، لەقاقای پێکەنینی دەدا. حاکم عومەر قسەکانی پێشمەرگە گەنجەکەی بەدڵ نابێت و زۆر بەجوانی ئامۆژگاری دەکات و بەڵێنی لێوەردەگرێت دووبارەی نەکاتەوە.راپۆرتنووسێک، کێچ دەکاتە گا، راپۆرت رەوانەی نەوشیروان دەکات. کاسەکە بەسەر سیروان مەجید ماوەتی دەشکێتەوە. مامۆستا شەریف بە مایەی گۆبەندەکە دادەنرێت. سیروان پێشمەرگەیەکی تازە پێگەیشتوو بوو، بڕوا ناکەم ساڵی ١٩٨٠ تەمەنی (١٨) ساڵی تێپەڕاندبێت. نەوشیروان رقی دنیای لەمامۆستا شەریف بوو. حەزی دەکرد بیشکێنێت و دەریپەڕێنێت.

بەیانییەکیان لەبن دارگوێزەکانی سەرچاوەی تووژەڵە، بابەتی کۆبونەوەی (م. س)مان تاوتوێ دەکرد. نەوشیروان هات و راپۆرتەکەی بەدەستەوە بوو. گوتی: ((من خۆم لێپێچینەوە لەگەڵ سیرواندا دەکەم و دەبێ بزانم کێ هانی پێشمەرگەکانی داوە جوێن بە سەرکردایەتی بدەن!)). قسەکانی بە بڵمە بڵم تەواو کردو بەرەو ناو چەم داگەڕا.

پاش دوو سەعاتێک ئەحمەدی دادی هات. زۆر تووڕە بوو. داخی دڵی خۆی لای ئێمە هەڵڕشت. زێرۆی عەبدوڵلا رێوی

گـوێی لەدەنگـە دەنگـی ئەحمـەدی دادی بـوو. ئەحمـەدی دادی گوتی: ((ئەم نەوشیروانە نە خوا دە ناسـێ، نـە ویژادنـی هەیـە، نـە بـەزەیی: منـاڵێکی سـەرەوخوار بەدارێکـەوە هەڵواسـیوە، بـە شوولێکی تەڕی ئەستوور ئەم مناڵـەی کوشت. بڕۆن ئـەو مناڵـە لـەبن دەسـتی دەربکـەن. داوای ئیعترافـی لێـدەکات و دەڵێـت: ئیعترافی پێ نەکەم، بە زیندوویەتی لەبن دەستم دەرناچیت!)).

زێڕۆ گوتی: ((ئیعتراف پێ کردن، بـە هەڵواسین و دارکاری و لێدان نابێ . رادەستی منی بکەن بەنیو سەعات. بە قسەی خۆش، بەبێ لێدان و هات و هاوار، وای لێدەکەم هـەرچی بزانێت بیخاتـە سەر کاغەز. لێدان هیچ سوودێکی نییە!)).

جـەمال ئاغـاو د. کـەمال خۆشـناو و زێـڕۆ چـوون و لـەو سـەرەوە سـیروانیان بـەنیوە ڕۆح و خـواری و گێـڕی و قـژی بژەوە هێنایەوە.

زێـڕۆ، سـیروانی لەگـەڵ خـۆی بـردو پـاش بیسـت دەقیقـە، هاتنەوە.

زێڕو گوتی: ((بە بیست دەقیقە، دانی بەوەدا نـا، کـە هانـدراوە جـوێن بـدات و قسـەی نابـەجێ بکـات. ئـەوەش قسـەکانی خـۆی بەنووسین نووسی و لەبنەوەش ئیمزای کردووە!))

سـالار عـەزیز: سوێندی دا، کە ئەو پێشمەرگەیە جارێکی تر لێینـەدراوەو هەڕەشـەی لێنـەکراوە، بـە ترسـاندن و تۆقانـدن ئیفادەی لێوەرنەگیراوە!؟.

زێـڕۆ عەبـدوڵلا: بـە گـۆڕی شـەهیدان سـوێندی خـوارد، کـە بەتـەنیا تـەکنیکی لێپێچینـەوەی پۆلیسـی بـەکارهێناوە. نـە زەبروزەنگ، نە گوشار، نە قسەی نایاسایی بەکار نەهێناوە....

پرسیارەکە لە سیروان کرا، دڵنیای کردین، کە زێڕۆ بـەڕێزەوە هەڵس و کەوتی لەگەڵدا کردووە!

# ڕۆژی نۆی تەمووزی ڕەش

# (٧)

سێ چادری سپی، لەناو دۆڵێکی سەوزدا سەمایان دەکرد. مەکتەبی ڕاگەیاندن جمەی دەهات. لەدوورەوە لەچاپخانەیەکی کێوی دەچوو. (چاپخانەی ئیبراهیم عەزۆ) ناوەندێکی چالاکی چاپ و وەشاندن بوو. بن ساباتە گەورەکە سپیی دەکردەوە. لاپەڕەکانی هەواڵنامەی ژمارە (٩) ڕایەخی بەردەم پێشمەرگەکانی دادەپۆشی. بەهەرەوەز، لاپەڕە لاپەڕە لەسەر یەکتر دادەنران. بەرگی تێدەگیراو بە ئامێر، دەرزی لێدەدرا. ئیدی لەوێوەوە بەسەر ڕێکخستن و هەرێم و ڕێکخراوەکاندا دابەش دەکرا.

من وردبینی وەرزنامەکەم دەکرد. ئیسکەندەر حەیدەر ڕۆستەم گوتی : (حەزدەکەین پشوویەک بدەین. ئەمڕۆ هەواڵنامەکە تەواو دەکەین).

منیش گوتم: ((بەشێکی باشی کارەکەتان ئەنجام داوە. پشوو بە تەنیا تامی نییە! دوو سێ کەس بڕۆن میوە لەناو دێ بکڕن. دوو سێیەک لەکانییەکە ئاو بهێنن و چا لێنێن. دەی تۆزێ بجووڵێنەوە. بڕۆن دەم و چاوتان فێنک بکەنەوە. منیش ڕیشم زۆر هاتووە. تا ئێوە دێنەوە من ڕیشم دەتاشم!)).

پێشمەرگە و کادرەکان بڵاوەیان لێکرد. لوقمان حەیدەری برای ئیسکەندەر بایباڵی دەدا. ئاوێنەیەک بە کۆڵەکەی بەردەم

کەپرەکەوە هەڵواسرابوو. پاژێکی رووخساری خۆمم بەکەفەوە تێدا دەبینی. گوێزانەکەم لەریشم دا. چالاک بە تەنیشتمەوە وەستابوو. چاوی بە ئاسمانەوە نووساندبوو. دەیویست دەرزی لەناو کادا بدۆزێتەوە.

لەپڕ گوتی: ((مامۆستا ئەوە فڕۆکە نییە؟)).

فڕۆکە جەنگیەکە لەئاست گوندی (سوونی)وە دادەکشا. یەکەمین جاربوو هاوار بکەم و بڵێم: ((فڕۆکە هات. قەسف دەکات. رابکەن. بۆ ناو چاڵەکان رابکەن!)).

کونە تەیارەکان دە بۆ بیست مەترێک لەکەپرەکەوە دووربوون. من فریای چاڵی دووەم کەوتم، کە دوورتربوو. گەیشتمە چاڵەکە و گرمە و ناڵەی تەقینەوەی ساروخەکە یەکێک بوو. تۆزێک سەرم بەرزکردەوە چڕە دووکەڵێکی رەش ئەو ناوەی داپۆشیبوو. ئاسۆ عەلی خۆی گەیاندبووە چاڵەکە:

من گوتم: ((شەهید و بریندارمان هەیە؟)).

ئاسۆ لەچاڵەکە چووە دەرەوەو گوتی: ((لاشەی شەهید و بریندار نابینم!)).

من گوتم: ((لەکونە تەیارەکان دوور مەکەونەوە. ئێستا فڕۆکەکە دێتەوە!)).

ئاسۆ گوتی: ((قاچێک دەبینم و فەرهاد دیار نییە!)).

فەرهاد (بورهان مستەفا) سەرقاڵی تایپکردن دەبێت و گوێ لەگۆرانی دەگرێت. لەبری ئەوەی لەشوێنی خۆی دابنیشێت. لە ئەنجامی بیستنی دەنگە دەنگ و هات و هاوار، لەبری داگەڕان، بۆ سەرەوە هاتبوو. دوو مەترێک لە شوێنی لێدانی ساروخەکەوە دوور بوو. دواتر پل پل پارچەکانی لاشەیمان

لەسـەر سـینیەکی رەش کـۆکربەوە. ئـازادی حـاجی عەبـدوڵلا نیوەی قۆڵی چەپی لێبوەوە. خوێن فیچقەی دەکرد. د. شادمانی فوئاد *مەستی زوو فریای ئازاد و لوقمان حەیدەر کەوت. لەبن دارگێلاسەکە، برینەکانی دووربیەوەو دەرمانی کردن و بە لەفاف پێچایەوە، ئینجا رەوانەی سەردەشت کران.

### دەنگۆی کۆماری کوردستان

رۆژی ١٧/ی ئەیلـوولی ١٩٨٠ عیـراق تـاک، لایەن، رێککەوتننـامەی جەزائیـری ١٩٧٥/٣/٦ هەڵوەشـاندەوە. ئێـران هەڵـبەزی و داکـۆکی لە جێگیرکردنـی رێککەوتننـامەکە کـردو پەزامەنـدی لەسـەر بڕیـارەکەی عیـراق دەرنەبـڕی. گـرژی و ئاڵۆزییەکان بەرەو تەقینەوەو دەستوەشاندنی سـەربازی چوون. رۆژی ١٩٨٠/٩/٢٢ فڕۆکە جەنگییەکانی عیراق، لەچەند قۆڵێکەوە، پەلامـاری بـنکەی سـەربازییەکانی ئێرانیانـدا. هێـزی زەمینـی عیـراقیش، دەسـتی بەسـەر چەنـد خـاڵێکی سـەربازی سـتراتیژیدا گرت.

سەدام پێی وابوو: سەد قەل بە بەردێک: بەتیرێک دوو نیشـان دەشـکێنێت: دەنگـی شـیعەکانی عیـراق کـپ دەکـاتەوە. ئەگەری راپەڕین و هەڵسـانەوەی شیعەی خـواروی عیراق دەسڕێتەوە.

---

* د. شادامانی فوئاد مەستی: پزیشکە، مرۆڤێکی چەپ و نیشتمان پەرەوەرو لەبنەماڵەیـەکی ناسـروای شـاری سلێمانیە. لەسـەرەتای شەسـتەکانەوە بـۆ خوێنـدن بـۆ ئـوروپـا رۆیشـتووە. مـاوەی پتـر لـە سـاڵێک لـەخڕی نێوزەنـگ وتووژەڵە بوو. پیاوێکی کۆمەڵایەتی قسەخۆش و دڵسۆزو خاوەن هەڵوێستە.

فۆبیـای (هەنـاردەکردنی شۆڕشـی ئیسـلامی) دەکـوژێنێتەوە. لە تێڕوانینی سەدام بۆ تەرازووی هێزی عەسکەری ئێران و عیراق، پەلامـاردانی ئێران: سـەیرانێکی کورت خـایەن، چـا خـواردنەوەی پاش نیـوەڕۆی بەهـاران دەبێت. سـوپای ئێران هەڵوەشـاوەتەوە. دەوڵەت، ئـامرازی بەرگـری نیـیەو ئاخونـد لەکـوێ و کـاری سـەربازی لە کـوێ؟ نـوکی درێشـەیەکی چکۆلانە، بەر لاسـمتی رژێمـی ئێـران بکەوێـت، سـەرتاپای دامەزراوەکـانی دەوڵەت دادەکەون و نەتەوە ژێـر دەسـتەکانی ئێـران (کـوردو عەرەب و ئازەرو بلوچ و  ترکمن سـحرا..) رادەپەڕن و سەربەخۆیی خۆیـان رادەگەیەنن.

مەکتەبـی سیاسـی لە کۆبـونەوەی بەردەوامـدا بـوو. لێـدوان، گفتوگۆ و زانیـاری وەدەسـتهێنان زۆر پێویسـت بـوو. قۆنـاغێکی نوێ هاتە پێشەوەو دەبوایە پێشبینی دەرهاویشتەو ئەگەرەکانی پەرەسەندنی جەنگ بکرێت! کوردی هەردوو دیو، دەست لەنـاوی دەسـت، سـتراتیژێکی سیاسـی و عەسـکەری هـاوبەش دابڕێـژن. عـومەر شێخمووس و بەنـدە دیـاری کراین نـوێنەرایەتی یەکێتی بکەیـن و لەگەڵ قاسـملۆو دەفـتەری سیاسـی (حـدکا) و (کۆمەڵە) دابنیشـــن. لەســـەر پێشـــهات و قووڵبـــوونەوەی تەنـــگەژەو لێکەوتەکانی شەڕی عیراق ئێران قسەی جیدی بکەین.

د. قاسملۆ ئەو کاتە بارەگاکەی بۆ دەڤەری (سەرشـاخان)، کە نـاوچەیەکی زۆر سـەخت و شـاخاوی و لێرەواری چـڕو پڕبـوو گواستبوەوە، ئەشکەوتێکی نەدیوی کردبووە بارەگای خۆی و بە ئاسـانی ئەو شـوێنە نەدەدۆزرایەوە. پاسـەوانی ئەو نـاوچەیە، سیسـتەمی چـاودێری تونـدوتۆڵ بـوو، خۆی بە پیرمـانەوە هـات،

بەگەرمی پێشوازی لێکردین. هەموو گیانی پێدەکەنی. لەکەش و هەوایەکی خۆشدابوو، سەیری داهاتووی گەشتی کوردستانی دەکرد. دڵنیا کرابوو، ڕووداوەکان بە قازانجی گەلی کورد تەواو دەبن. زۆر پرسیاری داخراو و کراوەی لێکردین. ئینجا هاتە سەر کرۆکی باسەکە:

"سوپای عیراق پتر پێشڕەوی لەناو خاکی ئێراندا بکات، دەوڵەتی ئێران لە گرێژنە دەردەچێت و هەڵدەوەشێتەوە. ئێمە دەبێ ئەم هەلە بقۆزینەوە، وەکو سەردەمی کۆماری کوردستان، سەربەخۆیی رابگەیەنین. سەربەخۆیی راگەیاندن پێویستی بە پشتیوانی و دان پێدانانی نێودەوڵەتی هەیە. ئێران دوژمنی زۆرەو لە دۆخی شەڕدایە لەگەڵ عیراق. ئێمە زانیاری وردمان هەیە، لە هەلومەرجی ئەمرۆدا سەربەخۆیی رابگەیەنین، عێراق پێش هەموو دەوڵەتان ئامادەیە دان بە سەربەخۆیی کوردستاندا بنێت. من دەمەوێ بزانم: ئێمە سەربەخۆییمان راگەیاندو عیراق دانی پێدانایین، ئێوە هەڵوێستان چی دەبێت؟".

عومەر شێخموس گوتی: "هەڵوێستی ئێمە هەڵوێستی کوردستانییە. هەر بەشێکی کوردستان ئەمڕۆ رزگار بێت، لەقازانجی بەشەکانیتر دەبێت، گرنگ ئەوەیە لە ئەنجامی ئەم جەنگ و پێکدادانەدا، بەشێکی گەلەکەمان سەرکەوتن وەدەستبهێنێت. بێگومان ئێوە ئەگەر بتوانن سەربەخۆیی رابگەیەنن، پێویستیتان بە پشتگیرییەکی نێودەوڵەتی بەرفراوان دەبێت و کاردانەوەی زۆری لێدەکەوێتەوە. عێراق لە قازانجیەتی پارچەیەک لە ئێران جیابێتەوە، ئێوەش لە قازانجتانە دانپێدانانی نێودەوڵەتی وەدەستبهێنن"..

د. قاسملۆ گوتی: "لە هەلومەرجی ئێستادا، عێراق لەسەر پرۆژەی هەڵوەشاندنەوەو پارچە پارچەکردنی دەوڵەتی ئێران کاردەکات. بۆیە یەکەمین دەوڵەت دەبێت، کە دان بەسەربەخۆیی کوردستاندا بنێت، بەهەموو هێزو توانایەکەوە پشتیوانی لە هەنگاوەکانی ئێمە دەکات. لە کوردستانی خوارووودا لە چاو کوردستانی رۆژهەلات، بارودۆخی سیاسی بۆ سەرکەوتن وەدەستهێنان زۆرباش نییە. جوڵانەوەکەی لای ئێوە لە سۆنگەی جێگەو شوێنی جیۆسیاسیەوە، زۆر زەحمەتە بتوانێت تەرازووی سیاسی و سەربازی بگۆڕێت"..

من گوتم: "هەروەکو کاک هۆمەر باسی کرد، بیرکردنەوەی ئێمە کوردستانییە واتە: لە روانگەی گشتییەوە دەڕوانینە رووداوەکان. کام بەش توانی زووتر خۆی رزگار بکات مایەی دەستخۆشییە و پێویستە سێ بەشەکەی تر، پێش لایەنی دەرەکی و ئەم دەوڵەت و ئەو دەوڵەت پشتیوانی لەپرۆژەی سەربەخۆیی ئەو بەشە بکەن. ئێمە ئامادە نەبین بە هەموو هێزو توانایەکمانەوە پشتگیریتان لێ بکەین ئەدی کێ دەبێ پشتیوانتان لێبکات؟

من ترسی گەمە گڵاوە نێودەوڵەتیەکانم هەیە، کە دەبێ لەبەرچاو بگیرێت: کۆماری کوردستان کرایە قوربانی بەرژەوەندی تەسکی زلهێزەکان. لەپڕ رێگەی گەمارۆدانی کۆمارە ساواکەکان دراو خەڵتانی خوێن کرا. ئایا مەترسی دووبارەبوونەوەی ئەزموونی کۆماری کوردستان شایانی لەبەرچاوگرتن نییە؟"

د. قاسملۆ گوتی: "جیاوازییەکی زۆر لە نێوان کوردستانی ساڵی ١٩٤٦و ساڵی ١٩٨٠ هەیە! سوپای عێراق هەنگاوێکی تر بەرەو پێشەوە بڕوات، دەوڵەتی ئێران لەبەر یەک هەڵدەوشێتەوەو دارو پەردووی بەسەریەکەوە نامێنێت. گەلانی ئێران یەک لە دوای یەک سەربەخۆیی خۆیان رادەگەیەنن. ئێمە ناکرێت دوور بە دوور تەماشاکەر بین: سەیری سوپای ئەم دەوڵەت و ئەو دەوڵەت بکەین، ولاتەکەمان بۆ مەیدانی جەنگ بگۆڕن! دەبێ خۆمان ئامادە بکەین و نابێ ئەم هەلەمان لە دەست دەربچێت."!

من گوتم: "لای ئێمە بەرژەوەندی نەتەوەیی، سەرووی بەرژەوەندیەکانی ترە. هەر بەشێکی کوردستان، لە سۆنگەی وەرچەرخانێکی مێژوویی کت و پڕدا، بتوانێت لە دۆخی ژێردەستەیی و داگیرکراوی دەرباز بێت و تاجی سەرکەوتن لەسەر بنێت، ئەوە دەبێت یارمەتیدەری بزافی ئازادی بەشەکانی تر. ئێمە ئەگەر دڵنیابین، لەلایەن ئێوەوە سەربەخۆیی رادەگەیەنرێت، ئامادەین قورسایی سیاسی خۆمان لەمەودوا بهاوێینە سەر تێکۆشانی ئێوە بۆ وەدەستهێنانی سەربەخۆیی."..

پاش دوو سێ رۆژ رادیۆی: دەنگی ئەمەریکا، مۆنتیکارلۆ، بی بی سی.. ئاگادارکردنەوەیەکی توندی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکای بلاوکردەوە، کە ئەوان: بە توندی دژی پارچە پارچەکردنی خاکی ئێرانن و رێگەی دەستێوەردان بەمەبەستی گۆڕاندنی نەخشەی ئێران نادەن. هەر بزاڤێکی (جیاخوازی) و (جیابوونەوە) ئەمەریکا بەتوندی دژی دەوەستێتەوە!

ئەمریکا دەرزیەکی بە میزەڵدانی زەردو سووری خەونەکانی ناسۆنالیزمی کوردیدا کرد. لایەنەکان جارێکی دی کوردیان وەکو سووتەمەنی بەکارهێنا و کوردیش دەست لە گونان درێژتر لێی هاتە دەرەوە..

# تییمت*

## ( ١ )

کوڕێکی لاوی خانەخوێکەمان، گوتی: "تێیهاڵابوو!"

جەمالی عەلی باپیر بەسەرسوورمانەوە پرسی: "چۆن تێیهاڵابوو؟"

کوڕە لاوەکە، بەپەشۆکاوییەوە: "کاک جەمال! بەخودای پیس تێیهاڵابوو!"

جەمالی عەلی باپیر لە وشەی: "تێیهاڵابوو" تێنەگەیشت: "تێنەگەیشتم! چۆن چۆنی پیس تێیهاڵابوو؟"

کوڕە لاوە خانەخوێکەمان گوتی: "خولەی دراوسێمان خوشکەکەمی بۆ ناو کادێنەکە برد. ئەمنیش بەسەریاندا چووم. هچیان دەبەر نەبوو. رووتو قووت! پیس تێیهاڵابوو!"

ئینجا هەموومان تێگەیشتین پیس "تێیهاڵاوە" چییەو ئەو کوڕە قۆزە بۆ هێدمە گرتبووی؟ ئەو شەوە تا بەرەبەیان بە زاراوەی "پیس تێیهاڵابوو" پێدەکەنین. شێخ ئەحمەدی سەرگەڵوو، کە پیاوێکی قسەخۆشو زمانپاراو بوو، بە ترشو خوێوە بەسەرهاتەکەی دەگێڕایەوە. کوڕی خانەخوێکەمان سەرەتا وەکو ئەکتەرێکی کارامە هاتەبەرچاو. یەکسەر باسی تێیهاڵاوەو تێنەهاڵاوەی نەکرد. ویستی ئێمە بەلاڕێدا بەرێت. هەروەکو چۆن هەندێک سەرکردەی بیژی خەڵک بەلاڕێدا دەبەن. ئەو کوڕە لاوە

---

* دێی تییەت، دەکەوێتە سەر چۆمی تییەت (زێی گچکە) و ئەم گوندە یەکێکە یەکێکە لە گوندەکانی ئالانی ئەودیو.

بێئەزموونەش ویستی ئێمە بەلاڕێدا بەرێت! ئەو بەپەشۆکاویو پەلەپەل خۆی بە دیوەخانەکەدا کردەوەو هاواری کرد: "کاک جەمال! فریاکەوە! کابرایەک هاتووەو خۆی لای کادێنەکە مت کردووەو دەیەوێت بتکوژێت! زوو فریاکەوە تا هەڵنەهاتووە!".

جەمال عەلی باپیرو شێخ ئەحمەدی سەرگەڵوو لەگەڵ چوار پێنج پێشمەرگە بە چاوتروکاندنێک لە دیوەخان بۆی دەرپەڕین. پاش نیو سەعات بەپێکەنینو  رووی گەشەوە گەڕانەوە. جەمال بە کوڕە شپرزەو شڵەژاوەکە پێدەکەنیو لە چوارلاوە پرسیار باران کرا!

"چەکی پێبوو؟"

کوڕە لاوە، خوشک لە کادان ماچکراوەکە گوتی: "بەخودای چەکم پێی نەبینی!"

جەمال: "چەکی پێنەبوو، ئەی چۆنو بە چی دەیویست بمکوژێت؟".

کوڕە لاوە، خوشک عاشقەکە گوتی: "بەخودای لە کادێنی بوو. گوتم: نەوەکو لەناو کادا چەکی شاردبێتەوەو خوێنێک بڕێژێتو ئەمن حەیای هەزار ساڵەم بچێت!".

بەرە بەرە چمکی کەوای راستی لەناو کا و گزرەو پووشو پەڵاشی کادێندا دەرکەوت! ئەو کوڕە نەیتوانی لەژێری بداتو داماوە ناچاربوو دانی پێدا بنێت! مەسەلەکە هەوڵی تیرۆرو فیشەک تەقاندن نەبوو. (خولەو فاتێ) وەکو (شیرینو فەرهاد) عاشقو ماشق بوون. ئەوان لە بێستوون قوڵنگیان لەسەر شان داناوە، ئەمانیش لە کادێن وانەکیان لەسەر شان بووە!

دێی تیپەت دەکەوێتە سەر چۆمی تیپەت (زێی گچکە) و ئەم گوندە یەکێکە لە گوندەکانی ئالانی ئەودیو. پێشتر چووینە بێتووش: گوندێکی دڵگیرو ئاوەدانو سەوز. کەم دێم بینیوە وەکو بێتووش باخو رەزی زۆر بێت. زانای گەورە مەلا عەبدوڵڵای بێتووشی خەڵکی ئەم گوندەیە. لە بەسرەو ئەحسا ناوبانگی دەرکردووە. هەموو ژیانی بۆ رێزمانی عەرەبیو شیعر و فیقهە تەرخان کردووە:

فأن تجد شيئا خلاف الادب

الطبع كردي و هذا عربي

ئەم زانایە لەزمانی عەرەبیدا دەریا بووە، بەلام لەبەرئەوەی لەناخەوە خۆی بەکورد زانیوە، نەیتوانیوە لەرووی رۆحیەوە خۆی بسرێتەوەو ناسنامەیەکی رۆحی نوێ بەخۆی بدات. بۆ یەک شەو لای دایە بێژوێ رێی وێلمان. حەمەی مەلا عەلیمان لەنزیکەوە دەناسی. پیاوێکی هۆشیار، کوردپەروەر، میوان نەوازو زۆر بەرێز. جوانی حەمەی مەلا عەلی وای لێکردبووین هەست بکەین، گوندی بێژویش گوندێکی سەوزو جوانو رێکو پێکە! یەکەمین جار بوو مرەبای کولەکەو گوڵ ببینم. ئەم یەکێک بووە لە هاورێی نزیکەکانی (مەلا ئاوارە)و (ئیسماعیل شەریفزادە). دەرگای ماڵەکەی بۆ میوان هەمیشە لەسەر پشت بوو. کەسانی لیقەوماو، ئەوانەی تووشی کەتنو سەرئێشە دەبوون، بەهۆی خزمی لارو لەوێرەوە، دەستیان بگەیشتایەتە بەردەرگای حەمەی مەلا عەلی، کێشەکەی بۆ چارەسەر دەکردن. قسەی ئەو لای (م.س)ی یەکێتی بەرەو دواوەکردنی نەبوو.

کەس لەو مەقــامەدا نەبــوو بــۆ هەر داوایەک بێــت، دەســت بەڕوویەوە بنێت!

بەلای دێی مەزناوێ (مەزناوا)ی ئالاندا تێپەڕین. شێخ رەزا و مەلا مەحمودی مەزناوام بیرکەوتەوە:

کێ دیویەتی ئەی (شێخ عەلی) مالّی خەزور بۆ زاوا
تۆ لەکوێ تەکیە لەکوێ بزنە گەڕی مەزناوا

شێخ عەلی برا گەورەی شێخ رەزا بووە. مەلا مەحمودی مەزنــاواش یەکێک لە زاواکانی شێخ عەلی بووە. بەگوێرەی گێڕانەوەی تالّەبانیەکان: شێخ عەلی داوای لە شێخ رەزای برای کردووە بۆ بەغدا بچێتو لەوێ ئەو لەسەر تەکیەی تالّەبانی* بێت. شێخ رەزا سەرەتا منجەمنجی کردووەو نەچووە. مەلا مەحمودی مەزناوێ وتویەتی: من دەچم! شێخ رەزا بەم (فەرد)ە هەجوەی مەلا مەحمودی کردووە. ئیتر نەیهێشتووە مەلا مەحمود بۆ تەکیەی تالّەبانی بچێت.

---

* تەکیەی تالّەبانی لە مەیدانی بەرامبەر وەزارەتی (دیفاع) بووە. شێخ رەزا زۆرجار وتویە من ئێستا لە مەیدانمو شێری مەیدانم! دیارە شێخ زانیویەتی مەیدان بە چی ناسراوە، بۆیە ئەم قسەیەی کردووە!

# دەستپێکی گەشت
## ( ٢ )

سەرەتای نۆڤەمبەری ١٩٨٠ پەنجا رۆژێک بەسەر شەڕی عێراقو ئێران تێپەڕیبوو. رژێمی بەغدا قورسایی خۆی خستبووە سەر بەهێزکردنی بەرەکانی شەڕ. سوپای عێراق نەیدەتوانی بە چڕوپڕی جاران لەکوردستاندا بمێنێتەوە. ژمارەی پێشمەرگە پەرەی سەند. سوپای عێراق لەڕووی تەکنۆلۆژیای سەربازییەوە لەچاو ئێران باڵادەستتر بُوو. بەشێک لە دەوڵەتە عەرەبەکانو بەتایبەتی دەوڵەتانی کەنداو بەگەرمیی پشتیوانییان لێدەکرد. عێراق کەواسووری بەر لەشکریان بوو. سوپای ئێران، بەهۆی رووخانی شاوە درز و کەلێنی تێکەوتبوو. بە ژمارە زۆر و لەڕووی تەکنۆلۆژیای عەسکەرییەوە تاڕادەیەک بەجێ مابوو.

خولیای گەشتی قەرەداغو گەرمیان کەوتبووە مێشکمەوە. جەمالی عەلی باپیر بۆ راوێژ و پرسو را و سەردانی مناڵەکانی هاتبوو. ئەویش ئەسپی گەڕانەوەی زین کردبوو. سالار عەزیز بۆ گەشتی شارباژێرو بینینی مەلا بەختیار لەسەر پێ بوو. مەلا پاش جیابوونەوەی حەمەی حاجی مەحمودی هاروونی سەرپەرشتی هەرێمی یەکی دەکرد. ژمارەیەک پێشمەرگەی گەرمیانی کاروباریان تەواوکردبوو (قاسمی فەقێ عەلی، سالار چاوشینو مستەفای ئامۆزای قاسمو..) ئەوانیش بوونە هاوڕێمان. پێنج پێشمەرگەی مەکتەبی راگەیاندن (شالاو-

مستەفا خەراجیانی- بەهادین عەبدوڵلا، حەمەی ئیعلام، چالاک- حەمەئەمین ئابڵاخی، نەبەرد کەلاری) سەریان بۆ ناو ئاگری شەڕ دەخورا.

هەموومان پێکەوە ملی ڕێگای بێورانمان گرت. سالار چاوشینو قاسمی فەقێ عەلی شارەزای ڕێگاکان بوون. دێ بە دێ بەرەو ئالان ڕۆیشتین. بە ڕۆژ دەڕۆیشتینو بەشەو لە دێهاتەکاندا دەماینەوە.

# پەڕینەوە

## ( ٣ )

چۆمی تییەت (زێی گچکە) سنووری عێراق‌و ئێرانە. دێهاتی ئەمبەرو ئەوبەری ئالانن‌و خزم‌و کەس‌و کاری یەکترن! دیارە وشەی (زێ) وشەیەکی ئاریایی کۆنە. لە زمانی ئەڵمانیدا بۆ نمونە: (زێ-See) بۆ دەریاچەو دەریا بەکاردێت: Nordsee دەریای باکور، Wannsee دەریاچەی ڤانی بەرلین.. لەزمانی کوردیدا واتای زۆرە: لەبری ناوی رووبار وەکو زێی گەورەو زێی گچکە. دەریاچەو بەنداو زێی دووکان.. شێخ رەزا فەردێکی بۆ خزمانی کۆیە نووسیوە:

**چاوی عیبرەت هەڵبڕن هەر لە سوورقاوشانەوە**
**ئاوی سووری ئێمەیەو دەڕژێتە ناو زێتانەوە**

ئەو بە تیرێک دوو نیشانی شکاندووە. شیعرەکە مانای ژێرەوەشی هەیە!دێی هەرزنە دەکەوێتە سەر زێی گچکە. گوندێکی جوان‌و دڵگیرو سەوزە. لەوێ "سیم" بۆ پەڕینەوە دانرابوو. خاوەن سیمەکە گیانی یارمەتیدانیان ئەوەندە زۆر بوو، هەر رێبوارێک ویستبێتی بپەڕێتەوە، ئەوان بەبێ بەرامبەر ئەو ئەرکەیان راپەڕاندوە.

دۆڵی سەفرەو زەروون: سەفرەو زەروون دوو گوندن لەناوەڕاستی شاخەکە هەڵتۆقیون. بەناوی ئەم دوو گوندەوە ئەم دۆڵە ناونراوە. رووبارۆکەیەک بەناو دڵی دۆڵە کپ‌و مۆنەکەدا دەکشێت. پێشمەرگەیەک رۆژێکیان ئەوەی ژماردبوو، ماوەی ئەو شەش حەوت سەعاتەی بڕینی دۆڵەکە، لەمسەرەوە بۆ ئەوسەر، سەدوشەست‌وچوار جار لە رووبارۆکەکە پەڕیوەتەوە.

وەرزی سەرماو سۆڵەو بەفربارین، بڕستی لەبەر ئەو پێشمەرگانە دەبڕی، کە درەنگ دەکەوتنەڕێ. هەر دەستەیەک

شـەویان بەسـەردا بهاتـایە، ئیتـر دەرچوونیـان زەحـمەت بـوو. خەڵکـی گەلاڵە بـۆ یـارمەتی پێشـمەرگەو لێقەومـاوان هەمیشـە لەسـەرپێ بـوون. جارێـک بیسـتبوویان دەسـتەیەک پێشـمەرگە خەریکە رەقدەبنەوە، بەپەلەپەل دەیان کەس بە هێسترو بەتانیو نانو خورماو... بەپیریانەوە چووبوونو رزگاریان کردبوون!

لە ولاخلـوو زۆر نەمـاینەوە. چـۆنیو چـاکیو زانیـاری کـۆکردنەوەو جموجـوڵی هێـزی چەکـداری رژێـمو ئاکـاری ناسروشـتی دەوروبەر! رووەو مـالومە کەوتیـنەرێ. شـاخی ژیلـوانو ئاسـنگەران باوەشـیان بـۆ ئاسـمان کـردۆتەوە. بـاری ژیاری دێهاتی وەکو مـالومەو چالاوە باش نییە. دێهاتیش هەیە هەر لەکۆنەوە ناوەندی بزاڤی رۆشنبیریو ئاینیی گرنگ بووە. سـەرگەڵوو، شـەدەڵەو سـووررداش سـەردەمانێک چەقـی جولانەوەی کۆمەلایەتیو فەرهەنگیو سیاسیی کاریگەر بوون.

سەید ئەحمەدی سەردار لایەنگری شێخ مارفی نۆدێ بوو، داوای لیکرابـوو، مەولانـا خالیـدی نەقشـبەندی تیـرۆر بکـات. لەکاتێکدا دەیەوێت ئەو کارە ئەنجام بدات، هێدمە دەیگرێت. بڕوا بە کەراماتی مەولانا خالید دەکات. لەوانەشە کاریزمای مەولانا کاریگەریی قورسی خۆی گێڕابێت.

شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە (١٨٨٧-١٩٤١) سەدەیەک پاش سـەید ئەحـمەدی سـەردار دەردەکەوێـت. بزاڤێکـی کـۆمەلایەتی، ئاینیو فەرهەنگیی رادیکاڵی دروستکرد: هەر بۆ نمـونە: نـوێژو رۆژووی لەسەر شانی هەقەکان هەڵگرت: (واعبدوا ربکم حتی یأتیـک الیقـین)و پەیوەنـدی نێـوان ژنو پیـاو، چوارچێـوەیەکی کرانەوەو هاوڕێیەتی وەرگرت! حزبی کوردی سوپەر مۆدێرنو سۆسـیال-دیمـوکرات سـاڵی ٢٠٢٠ یەک لەسـەدی هەقەو شـێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە بوێریی نییە!

## ملمان له چەقۆی کول دەسوی

## ( ٤ )

رژێم لەزۆربەی شوێنە ستراتیژیە بنچینەییەکاندا، سەربازگەو رەبایەی قایمی دانابوو. بەرۆژ ئاسمان‌و رێسمان بەدەست ئەوانەوە بوو. پێشمەرگە، یان هەر جوڵانەوەیەکی ناسروشتییان بەدیبکردبا، ئەوە هاوەنبارانی دەوروبەری خۆیان دەکرد. بۆیە پیشمەرگە زۆر چالاکی‌و هاتووچۆی بەشەو دەکرد. تۆڕی هەواڵگری، ژمارەی خۆفرۆش‌و بەکرێگیراو، مەفرەزەی جاش، گەورەترین لەمپەر بوون لەبەردەم گەشەکردنی شۆڕش. هەمیشە وردترین زانیارییان دەگەیاندە دەزگای (موخابەرات)، ئیدی جاش‌و سوپاو هەلیکۆپتەر، رێک لەسەرپێشمەرگەکان ئامادە دەبوون. زۆربەی ناوی دێهاتی ئەم دەڤەرە لەسەردەمی مەغۆل‌و دەوڵەتی عوسمانییەوە بۆمان ماوەتەوە ناوە کوردییەکەیان سڕاوەتەوە: (قزلەر، چۆخماخ، یاغسەمەر، دابان، کۆتەڵ.. تاد). گوندی کچان کراوەتە قزلەر. لەسەردەمی تەیمورلەنگ لای (بوخارا) دێی (کۆتەڵ)و شاخی دابان هەبووە. چۆخماخ لە تورکی عوسمانییەوە وەرگیراوە (چوقماق). چۆقماقی عوسمانی لە (چماق)ی فارسی وەرگیراوە. بەکوردی دەبێتە کوتەک، تێلا، گاڕان.. شەوێ لە (قزلەر) ماینەوە، پیش نوێژی شێوان لە (قولەرەیسی) بووین. قولەرەیسی چل ساڵ لەمەوپێش گوند بوو، ئێستا گەڕەکێکە لە گەڕەکەکانی سەرچنار. ئەو شەوە

بەسەر عەواڵو جێشانەدا تێپەڕینو بەرچاییمان لە سەرزەل کردەوە.

لەوسەرەوە، کە هاتینەوە، (حەمە رەش)ی شێخ کەریمو سەلامی فەقێ عەلی هاوسەفەرمان بوون. لە شەڕەکەی خاوێ رۆژی (١٩٨٠/١٢/٨) سەلامی فەقێ عەلی چاوێکی لەدەستدا. پیاوێکی بە ورەو ئازاو خۆڕاگر. بەو برینە سەختەوە، ئەو ڕێگا دوورەی لەگەڵماندا بڕی.

# کانی مۆتان

## ( ٥ )

لە تەنگیسەر لەگەڵ سامان گەرمیانی بەیەک گەیشتینەوە. سامان ئەوکاتە سەرکەوتووترین فەرماندەی سەربازیی گەرمیان بوو. لەماوەیەکی کورتدا توانیی هێزێکی باش پێکەوە بنێت. شەڕەکانی پێشمەرگەی گەرمیان دەنگی دایەوە. لەتەنگیسەرەوە پێکەوە دێ بە دێ بەرەو گەرمیان ڕۆیشتین. شەوێ لە کۆشک ماینەوە. لەترسی گەمارۆدان و پالاماری لەناکاو، شەوەکی کۆشکمان جێهێشت و بە قۆپیدا سەرکەوتین. لە ڕێگا شوانێکمان بینی دوو مەڕمان لێ کڕی. گەرمیانییەکان لەسەر کانی (مۆتان) بە چاوترووکاندنێک حەیوانەکەیان سەربڕی، گروین و لەت لەتکردن یەکێک بوو. شوڵی هەناریان هێناو گۆشت برژاندن و چا لێنان دەستی پێکرد. زمەی کلاشینکۆف زۆرجار لەبری شیشی گۆشت برژاندن بەکاردەهات. شوڵی هەنار، پلی گەورەتری پێوەدەکرا.

لەسەر کانی مۆتان حەوزێکی کۆنکرێتی گەورە دروستکرابوو. دەیانگوت: کاتی خۆی مەلیک فەیسەڵ ویستویەتی ئەم سەر شاخە بکاتە سەیرانگە. ئەم شوێنە چڕترین پاژی قۆپیە. مرۆڤ بەئاسانی ناتوانێت بەناو ئەم دارستانەدا تێپەڕێت.

سەیرترین ڕووداو لە گەشتی گەرمیاندا بیستبێتم، پێشمەرگەیەکی قسەخۆش بێ چەک دەبێت. چەند جارێک داوا دەکات چەکی بۆ پەیدا بکەن، بەو دەستەو دەمە چەک پەیدا نابێت. بە ڕێکەوت هێزێکی ڕژێم پەلاماریان دەدات. مام ساڵحی

سەید موورادی زەنگنە، سەربازێک دەبینێت، چۆتە سەنگەرەوەو قەناسێکی پێیە. مام ساڵح بە بەردێکەوە پەلاماری سەربازەکە دەداتو بەسەریا دەنەڕێنێت: "ئەگەر ئەو چەکەم نەدەیتێ سەرت پان دەکەمەوە". سەربازەکە لەترسا زوو چەکەکەی بۆ فڕێدەداتو ڕۆحی خۆی ڕزگار دەکات!

# گفتوگۆی منو سەدام حسێن

## ( ٦ )

ئێمە لە چرچەقەڵا بووین. شێخ عەبدولعەزیزی داربەڕوو* دەرکەوت. ئەو پەیامێکی بەپەلەی شێخ محەمەدی کربچنەی پێبوو، گوتی: "شێخ محەمەدی شێخ عەبدولکەریمی کربچنەم بینیوە، ڕێز و سڵاوی هەیەو دەیەوێت بەزووترین کات بتانبینێت. حکومەت زانیویە جەنابت لێرەیت. پەیوەندیان بەشێخەوە کردووە. خۆت لەم ناوە دوامەخە: کارەکە، زۆر زۆر گرنگە. شێخت بینی، ئەو بە وردیی هەڵوێستی حکومەتت بۆ باس دەکات. من بەپەلە بۆ داربەڕوو دەگەڕێمەوە! سبەی نیوەڕۆ لای من بن. شێخ لە کربچنە چاوەڕوانمان دەکات..".

کربچنەو داربەڕوو دراوسێ دێنو دوو سەعاتو نیو بەپێ لەیەکترەوە دوورن، هەردووکیان دێهاتی بناری سەگرمەن. ڕەباتو ژاڵە لەنێوان ئەم دوو دێیەدا گیرساونەتەوە. کربچنە ئەوکاتە گوندێکی سەد ماڵی بوو: ئاوەدان، دڵگیر، خانوی

---

* نەوشیروان مستەفا، بەهەڵە ڕووداوەکەی نووسیوە: ئەو پێیوابووە: شێخ عەبدولعەزیزی داربەڕوو، کۆتایی ئەیلوول ١٩٨٠ نامەی شێخ محەمەدی کربچنەی بۆ ئەو هێناوە. من حوزەیرانی ١٩٨١ شێخ عەبدولعەزیزم لە تووژەڵە بینیوە. سەردانی ماڵی ئێمەی کردبوو، هەندێ دیاریو دەنگوباسی بۆ هێنام. شێخ عەبدولعەزیز مەبەستی لە سەردانو یەکتری بینین، بەرەو پێشەوەبردنی شۆڕش بوو. ئەو خۆی بە خاوەنی شۆڕش دادەنا. داڕشتنەکەی نەوشیروان کەمو کوڕی زۆرە: بڕوانە: نەوشیروان مستەفا ئەمین، پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن. ل١٧١.

ڕێکوپێک، ئاو و کارەبای هەبوو. شەقامو کۆڵانەکانی ڕووناک بوون. ساڵی ۱۹۳۰ یەکەمین خوێندنگەی ئاینی لێرە کراوەتەوە، مامۆستایەکی دەرچووی ئەزهەر وانەی بە خوێندکاران وتوە. شێخانی کربچنە لە کەسنەزانەوە هاتوون. کەسنەزانو کربچنە ئەمدیو و ئەودیوی سەگرمەن. کەسنەزان دەکەوێتە بەری قەرەداخەوەو کربچنەش گەرمیانە. شێخ عەبدولکەریمی گەورە (۱۸۱۹-۱۸۹۹)، ساڵی (۱۸۳٥) لەتەمەنی (۱٦) ساڵیدا، ماوەی ساڵێک خۆی بزر دەکات.

لە ئەشکەوتێکی بچووکی سەری سەگرمە دەچێتە خەڵوەتەوە، چەند کەسێکی کربچنەیی، چاویان بە شێخ عەبدولکەریمی کەسنەزان دەکەوێت. داوای لێدەکەن: لەو ئەشکەوتە بۆ ناو ئەوان دابەزێتو شێخایەتیان بکات. ئەویش قسەیان ناشکێنێت..

کربچنە ئەو ئێوارەیە وەکو شارێکی خنجیلانە هاتە بەرچاوم: مزگەوت بە منارە و گومبەزو گڵۆپو چراخانەوە، سەرنجی ڕێبواری ڕادەکێشاو دەسەلاتی شێخانی دەنواند.

شێخ عەبدولعەزیزی داربەڕوو، وێڕای ژمارەیەک کەسایەتی ئەو دەڤەرە، لای تەکیەی شێخ پێشوازییان لێکردین. منو سامانو خالید گەرمیانی بۆ دیوەخان چووین. پێشمەرگەکان لەناو ئاوایی دابەشبوون. شێخ محەمەد لە دیوەخان چاوەڕوان بوو. بەگەرمیی بەخێرهاتنی کردین.

ئەو پیاوێکی بەهەیبەتی قایمو قۆڵ، دامەزراو، باڵا مامناوەند، تەمەنی (٤۲) ساڵ دەبوو. جلوبەرگ: پاکوخاوێن، پۆشتەو پەرداخ، ڕیش پاک تاشراو بوو. من خۆمم ئامادە کردبوو: بەزمانی شێخو مشایخو مەلا و پیاوانی ئایینی بدوێم. یەکسەر

بۆم دەرکەوت ئەو لەگەڵ ئێمەدا زمانی هاوبەشی هەیە، وشەی (تاکتیک)و (ستراتیژ)و (داهاتووی گەلەکەمان)ی بەکاردەهێنا. ئایەتی قورئانو فەرموودەی بەسەر زماندا نەدەهات، ناوە ناوە نوکتە و قسەی خۆشی بۆ دەگێڕاینەوە.

ئەو گوتی: "قاید فیرقەیەک جارێکیان لێی پرسیم: خورمای کوردکوژە چییەو لەکوێ دەستدەکەوێت؟ ئەگەر ئەوە راست بێت ئێمە بۆ شەڕی کورد بکەین با لەمەودوا بە خورمای کوردکوژە لەناویان بەرین.."!

شێخ گوتی: "سەیرە ئەم عەرەبانە چۆن بیردەکەنەوە؟ بەبەردەوامی بیر لەوە دەکەنەوە: چۆن ئامرازێکی نوێ بدۆزنەوە کوردی پێ لەناوبەرن..".

ئەو ساڵی ١٩٦١ دەچێتە ریزی شۆڕشی ئەیلوولەوە. بەشداری لە چەندین شەڕ دەکات. ماوەیەک فەرماندەی هێز بووە. دیارە پاش شەڕی ناوخۆ، دەست لە پێشمەرگایەتی هەڵدەگرێت.

کورد نەیتوانی سوود لەم کەسایەتیە وەربگرێت. رژێم پشتی پشتی زۆری بۆ کرد. ئەو دەیزانی چۆن سوود لە دەسەڵاتی ئایینی ئەم پیاوە وەربگرێت. من ئەوکاتە بەبەردەوامی دەمویست بۆ سەر رێبازی کوردایەتی رایبکێشمەوە. هانی کادرە سیاسیو عەسکەرییەکانم دەدا، لە بەلاش ئەم پیاوە نەوروژێنن. لەسۆنگەی هەڵەیەکی نەخوازراوەوە، لایەنگرانی رێبازی کەسنەزانی بۆ بەرەی دوژمنانی شۆڕش پاڵبنێن.

ئێوارەخوانێکی شاهانە رازێنرابووەوە (قەل، پلاو، شلەی جیاجیا، زەلات... تاد) دیمەنی سفرەو خوان، هەستێکی سەیری

پێدەبەخشیت: جیاوازی گەورەی نێوان کولتووری سفرەو خوانی جووتیارانی رەباتو ئۆرستۆکراتی ئاییی. جووتیارانی گەرمیان ئێواران نانو چایان پێشکەش دەکردیت، دوو سێ سەلک دۆینە، ئاوی گەرمی پیا دەکرا. لەسەر تەپاڵەو پشقل، چا لێدەنرا. تا خەومان لێدەکەوت هەر دۆینەو چامان دەخوارد.

شێخ گوتی: "سەدام وەزیری کشتوکاڵو چەند بەرپرسێکی گەورەی بۆ لام ناردووە. ئەو دەیەوێت جەنابت سەفەرێکی گفتوگۆ بۆ بەغدا بکەیت. حکومەتی عێراق ئێستا دژی ئێران کەوتۆتە شەڕێکی قورسەوە. لەملاشەوە، سوپای عێراق لەحاڵەتی شەڕە دژی گەلی کورد. واتە: سەدام ناتوانێت سوپا لەکوردستان بکێشێتەوەو رەوانەی بەرەکانی شەڕی ئێرانی بکات. سەدام پێیباشە لەگەڵ کورد رێکبکەوێتو پشتیوانیی کورد وەدەستبهێنێت. سەدام پێیباشە جەنابت بۆ بەغدا بچیت. گرنگ ئەوەیە چارەسەرێک بۆ کێشەی کورد بدۆزرێتەوە. ئەمرۆ بێت، یان سبەی هەردوولا، دەبێ بەرامبەر یەکتری دابنیشنو گفتوگۆ بکەن. دووربەدوور ناگەنە ئەنجام. چاوتان بەیەکتری کەوت، لەیەکتری تێگەیشتن دروست دەبێت!".

سامان گەرمیانی گوتی: "یا شێخ! حکومەت هیچ جیدی نەبووە. قەت هەوڵی نەداوە یەک هەنگاو بێتەپێشەوە. ئێمە نازانین نیازیان چارەسەرکردنی کێشەی گەلی کوردە، یان مەبەستیان ئەوەیە بۆ ناو هەڵدێرمان بەرن؟".

شێخ محەمەد گوتی: "سەدام ئەمرۆ دوو شەڕی قورسی تووش بووە. شەڕکردن لەسەر دوو بەرە بۆ کەس ئاسان نییە. ئەو ئەگەر کورد ئاشتبکاتەوە، قازانجی خۆیەتی. دەتوانێت

هەرچی هێزی هەیە رەوانەی بەرەکانی شەڕی ئێرانی بکات. کوردیش پێویستی بە پشووە، ماوەیەک نێو ماڵی وێرانی خۆی چاکبکاتەوە. ئێمە دەبێ ستراتیجێکی نوێ بگرینەبەر: خۆمان لە شەڕ لابدەین! ئەم وڵاتە جوانەمان بەم شەڕو شۆڕە وێران بووە. کورد لەساڵی (١٩٦١)ەوە شۆڕشی هەڵگیرساندووە. زیانی مادیو مەعنەوی زۆری بەرکەوتووە. راگرتنی شەڕ بۆ ماوەیەکی کاتییش بێت، گەورەترین سەرکەوتنەو دەتوانین بەشێک لە برینەکانمان سارێژ بکەین..".

خالید گەرمیانی پرسیارێکی لە شێخ کرد: "جەنابت نوێنەرەکانی سەدامت بینیوەو وەزیری کشتوکاڵ سەردانی کردویت: چی لێیان تێگەیشتیت؟ بڕوایان بەوە هێناوە، کە دەبێ مافی کورد بدەن، یان لەبەر خاتری جەنابت ویستویانە دوو قسەی باش بکەن؟".

شێخ محەمەدی گوتی: "وەزیری کشتوکاڵو بەرپرسە باڵاکانی رژێم، پەیامی سەدامیان پێبوو. لەعێراق کەس ناتوانێت لەخۆیەوە بەناوی سەدامەوە قسە بکات. کەسێکی وەکو وەزیری کشتوکاڵ رێگای پێدراوە پەیام بگەیەنێت، بەڵام ئەو ناتوانێت لەسەر گفتوگۆی شەڕو ئاشتی بڕیار بدات. لەوێ بڕیاری مەرکەزیی لای خۆیەتیو کەسەکانی تر تەنیا جێبەجێکردنیان لەسەرە. من ماوەیەک لەمەوپێش بینیومە. دیارە قەناعەتی تەواوی بەوە کردووە، کێشەی گەلی کورد زۆر درێژەدەکێشێتو چارەسەرکردنی ئێستا، لەوە چاکترە بۆ نەوەکانی داهاتوو دوابخرێت. ئەوان هەنگاوێک هاتوونەتە پێشەوە. با ئێمەیش هەنگاوێک بچینە پێشەوە. مامۆستا جەعفەر

لێرەیە دەتوانێت پەیامێک بۆ ئەوان بنێرێت، یان سەردانێکی بەغدا بکات. پێویستە رووبەڕوو سەدام حسێن ببینێت. گفتوگۆو یەکتری بینین، هەردوولا لەیەکتری نزیک دەکاتەوە.. تا یەکتری نەبینن‌و راستەوخۆ لەگەڵ یەکتردا قسە نەکەن، ناتوانرێت چارەسەری گونجاو بدۆزرێتەوە!".

خالید گەرمیانی پرسیارێکی تری کرد: "چۆن مامۆستا جەعفەر هەروا بەبێ زەمانەت بۆ بەغدا بڕوات؟".

شێخ محەمەد گوتی: "سەدام وتوویەتی، ئەگەر مامۆستا جەعفەر بۆ بەغدا بێت، ژیانی سەد لەسەد پارێزراوە. ئامادەم هەر زەماناتێک ئەو دەیەوێت بۆی دەستەبەر بکەم. ئێمە ئامادەین نیوەی وەزیرەکانی بەغدا، بە بارمتە بۆ لاتان بنێرم. بەمەرجێک مامۆستا جەعفەر بۆ بەغدا بێت‌و چاومان پێبکەوێت.. بەڵێن دەدەم بەسەلامەتی دەگاتە لامان‌و بەسەلامەتی دەگەڕێتەوە..".

سامان گەرمیانی گوتی: "چۆن مامۆستا هەروا بەئاسانی بۆ بەغدا بچێت؟ ئێمە پێمانباشە گفتوگۆ بکرێت‌و چارەسەر بدۆزرێتەوە بۆ کێشەی گەلی کورد، بەڵام گفتوگۆ بەبێ ئامادەکاری زۆر باش، سەرکەوتوو نابێت.. تاد".

من زۆر بەوردیی گوێم بۆ شێخ محەمەد رادێرا. دەمویست، دیوی ئەودیوی قسەکانی بخوێنمەوە. لەپڕ ئەو هەموو هێرشەم بیرکەوتەوە، کە هەلیکۆپتەرو سوپا، پێش (١٩٨٠/١٢/٧) کردیانە سەر گەرمیان. رژێم زانیویەتی من لێرەم. چەند جارێک هێرش دەکات‌و هەوڵی کوشتنم دەدات. پەیامێک لەرێگەی شێخ محەمەدەوە یان هەر کەسایەتیەکی تری گەرمیان رەوانە ناکات.

عیماد ئەحمەد پاش ئازادکردنی لە زیندان، نامەیەکی بۆ ڕەوانەکردم. ئەو نامەیەم بیرکەوتەوە: "پیاوەکانی ڕژێم سوێندیان خواردووە، بەس تۆیان دەست بکەوێت پارچە پارچەت دەکەن! ئاگات لەخۆت بێت بەزیندوویەتی دەستیان نەکەویت. هەرچی لێرە ڕوویداوە هەمووی خراوەتە ئەستۆی تۆ..".

ویستم ئەوپەڕی ڕێز بۆ داواکەی شێخ دابنێمو لەهەمانکاتیشدا خۆم لەو ئەرکە بدزمەوە، گوتم: "زۆر سوپاسی دڵسۆزیو پیاوەتیو گەورەییتان دەکەم. جەنابت ئەو ڕاستییە دەزانیت ئێمە گفتوگۆو چارەسەری ئاشتییانە بە هەنگاوێکی باش دەزانین. هەوڵو تەقەلای بەڕێزتان جێگای ڕێزو تەقدیرە. مەسەلەی گفتوگۆ دەبێ لەڕێگەی (م.س)ەوە بکرێت. من بۆ سەردانی گەرمیانو قەرەداغو کەسوکارو خزمان لێرەم. من بەتەنیا دەتوانم دەستخۆشیتان لێبکەمو سوپاستان بکەم. دەتوانم بەڵێنیشتان بدەمێ: من بەزووترین کات پەیامەکەی ئێوە دەگەیەنمە (م.س)و (سەرکردایەتی) بەزووترین کاتیش وەڵامی دەستپێشخەری ئێوە دەدەینەوە..".

ئەو حەزی دەکرد، من هەر یەکسەر بۆ بەغدا بڕۆم. من هەزارو یەک بیانووم بۆ هێنایەوە، کە ئەوە کاری (م.س)ە و ئەوان دەبێ داواکاری بەناوی یەکێتییەوە بنووسن.

بەگەرمیی ماڵئاواییمان لە شێخ محەمەدی کربچنە کرد. دڵنیاشمان کرد ئەو ڕێزی تایبەتی لامان هەیەو لەپەیوەندی بەردەوامدا دەبین!

# کەسنەزان

## (٧)

سەعات (١١)ی شەو ماڵئاوایمان لە شێخ محەمەد کرد. سامان ڕێگای بناری سەگرمەی گرت. خالید گەرمیانیو دەستەکەیو بەندە ڕێگای کەسنەزانمان گرتەبەر. شەوێکی تاریکو ڕێگا بەردەڵان، هەنگاوێکمان دەناو بەردێک خۆی بە نوکە پەنجەماندا دەکێشا. ڕێگای سەعاتێکمان بە سێ سەعات بڕی. کاتی دابەشبوونو پەیداکردنی لێفەو بەتانی نەبوو. مزگەوتەکە گەرمو خۆش بوو. ئەگەر برسیت بوو، پێخۆرت بۆچییەو ئەگەر خەوت هات سەرینت بۆچییە؟ پەرلە دانراو ناوی پاسەوانانی شەو دانرا. زۆر بەقوولیی نووستین. پاسەوانی دووەم خەوی لێکەوتبوو.. شالاو و چالاک بەئاگایان هێنامەوە: "دەزانیست دووەم پاسەوان نووستوەو کەسی بەئاگا نەهێناوەتەوە. بەدرێژایی شەویش لەزۆربەی دێهاتەکان، لە یەک کاتدا، سەگوەڕێکی زۆر بووە!".

من بایی ئەوە ئەزموونم هەبوو، شەوان لە هەرکوێ سەگوەڕی زۆر بوو، دیارە کەسانی نامۆ، سوپا، دز و شەوکوت، لەگوندەکە نێزک کەوتونەتەوە. من گوتم:

"دڵنیابن سوپای حکومەت گەمارۆی هەموو دێهاتەکانی داوە. ڕەنگە ئێرەش گەمارۆ درابێت. زوو هەموو پێشمەرگەکان لەخەو هەڵسێنن..".

به خالید گەرمیانیم گوت: "ئەمشەو تا بەرەبەیان سەگوەڕێکی زۆر لەدێهاتەکاندا هەبووە. کەسیش حەرەسیاتی نەگرتووە. با زوو سەیرێکی دەوروبەر بکەین. من دڵم باش لێنادات!".

خالید لە قاقای پێکەنینی دا و گوتی: "مامۆستا ئێرە ناوچەی ئازادکراوەو خۆمان حکومەتین! با لەماڵێک بەئاسوودەیی بەرچایی خۆمان بکەین. سوپای عێراق خوێنی ملی دەفرێت، نانی شوانی خواردووە، کاری بە گەرمیانو قەرەداغ چییە؟".

پێکەوە لە ماڵێک بەرچاییمان کرد. من لە خانەخوێکەم پرسی: "ئەمشەو سەگوەڕێکی زۆر بوو، هیچت نەبیستووە، چی روویداوە؟".

خانەخوێکەمان گوتی: "من یەک دوو جار بەئاگا هاتمەوە، گوێم لە سەگوەڕ بوو، بەرەبەیانیش مەڕەکانم کردە ناو ران، تا دەرەوەی ئاواییش چووم شتێکی سەرنجڕاکێش بەرچاوم نەکەوت!".

خالید گەرمیانی گوتی: "قسەکەی من دەرچو. ئەمسەرو ئەوسەری قەرەداغ بگەڕێ، تەنیا چاوت بە پێشمەرگە دەکەوێت، یەک سەرباز نابینیت".

من گوتم: "جارێ بەیانی زووەو هیچمان لێ روون نەبۆتەوە! من پێمباشە: بۆ ناو ئەو شاخو کێو و دارستانە بچین، بەوردیی، بە دووربین سەیری دێهاتەکان بکەین.. ئەم سەگوەڕە بۆ من زەنگێکی ترسناکە! سەگ لەخۆیەوە ناوەڕێت!".

خالید لەقاقای پێکەنینی دا، بەپشتا کەوت!: "مامۆستا تۆ وا دەزانی ئێستا ساڵی ١٩٧٦ و ١٩٧٧ە، ئێرە ناوچەی رزگارکراوە. سەعاتێکیتر بە هاوڕێیانی هەرێمی پێنج دەگەین!".

ملی ڕێگای قازانقایەمان گرت. ئەو ڕۆژگارە تا بەردەم خاوێ تەختاییو ڕووتەن بوو. بەردەم خاوێ دارستانو شاخو لاپاڵی سەختو چڕوپڕ بوو. خاوێ یەکێکە لە گوندە سەختەکان، پشتی دێکە شاخێکی بازنەیی دیوار ئاسایە، لەنزیکیشەوە نەبێ گوندەکە لەناو دارستانو ڕەزو باخ نابینرێت.

خالید گەرمیانی گوتی: "من حەزم لە کچێکی جوان کردووەو یەکترمان زۆر خۆشدەوێت. من حەزدەکەم ئەو کچە بهێنم، بەڵام دڵنیام پێش ئەوەی بەیەک شادبینەوە، من دەکوژرێم..".

من گوتم: "کاک خالید! ڕەشبین مەبە! تۆ پیاوێکی گەشبینیت بۆ ئێستا ڕەشبینیت؟".

خالید: "دڵنیام منو دەزگیرانەکەم بەیەک ناگەین!".

من ویستم بابەتەکە بگۆڕم. سەگوەڕەکەم بیرکەوتەوە: "سەگوەڕەکەی ئەمشەو ئاسایی نەبوو. هیچ زیانێک ناکەین، ئەگەر لەشوێنێکی قایم دوو سێ سەعات بمێنینەوە..".

دیسانەوە لەقاقای پێکەنینی دا: "مامۆستا تۆ وادەزانی ئێستا زەمانی سەرەتای شۆڕشە! لەوەتەی شەڕی عێراق- ئێران هەڵگیرساوە، سوپای عێراق ناتوانێ وەکو جاران پەلامار بداتو هێرش بهێنێت. ئێمە بە ڕۆژی نیوەڕۆ لەناو دێهاتدا دەمێنینەوە! سوپای ڕژێم ناوێرێت نزیکمان ببێتەوە..".

من زۆر لەسەری نەڕۆیشتم، لەترسی ئەوەی ئەوان بەهەڵە لێمتێنەگەن، من بەردێکم لەسەر دانا. خالید نوکتەی بۆ دەگێڕامەوە. پێشمەرگەکان لەپێشمانەوە، یەک لەدوای یەک دەڕۆیشتن، ئێمەیش دووقۆڵی لەسەر دەرهاویشتەو کاردانەوەکانی شەڕی عێراقو ئێران دەدوایینو ئەگەری هەرەسی ڕژێمی عێراق..

# خالید گەرمیانی
## (٨)

شاخی خاوێ، دیوارێکی سروشتی نیمچە بازنەییە، بەرەو ئاسمانی بەرین هەڵکشاوە. دیاری کانیاوی سازگار هۆکارێکی سەرەکی، دروستبوونی ئەم گوندە بوون. پێشمەرگەکان لێرەش بەئاسوودەیی نەیاندەتوانی پشتی لێبکەنەوە. چڕیی دارستان‌و رەزو باخ، پیشمەرگەی لە هەلیکۆپتەر دەپاراست. کەسنەزان، خاوێ، مێوڵی‌و دیلێژە خۆیان بەشاخەوە نووساندووە. ئەم چوار دێیە دەکەوێتە نێوان (دەربەند باسەرە)و (قۆپی باخومەر). دێهاتی هەڵەدەرە، مریەم بەگ، چەولک‌و قازانقایە، لەگەڵ دێهاتی بناری شاخ هاوتەریبین، ئەوان بەرزترو ئەمان نەویترن. لە کەسنەزانەوە بەرەو قازانقایە دەرچوویت، خاوێ دەکەوێتە دەستی چەپو (هەڵەدەرە)و (مریەم بەگ)و (چەولک) دەکەونە دەستی راستەوە. دێبەرەکانی سێکوچکەی (مریەم بەگو هەڵەدەرەو چەولک) لەچاو خاوێ‌و کەسنەزان‌و مێوڵی پێدەشت‌و تەختاییی‌و هامارە.

شەوەکی (١٩٨٠/١٢/٨) پێشمەرکەکانی هەرێمی (٥) لە قازانقایەوە بۆ خاوێ چووبوون. بە کاوەخۆ بەرچایی کرابوو. سوپای عێراق چەند دەقیقەیەک درەنگتر، لەناو دارستان‌و بەردەلانی سەرە رێگای خوار ئاوایی، بۆسەیەکی چڕوپڕو تۆکمەیان دانابوو. سوپای عێراق دەنگوباسی وردی پێگەیشتبوو،

هێزی پێشمەرگە لە قازانقایەوە بۆ خاوێ دەچن. ئەو رۆژە (مستەفا چاو رەش، شێخ جەعفەر، رۆستەم کەرکوکی، حەمە رەش،* سەلامی فەقێ عەلی،**...)وێڕای ژمارەیەک پێشمەرگە لەناو دێی خاوێ بوون.

رۆستەم کەرکوکی رۆژێ دوای شەڕەکە بۆی گێڕامەوە:

"لای مزگەوتەکەی خاویو مەرقەدی (شێخ عەبدولکەریم)***و (حەمە هەتیو)****بووین. لەگەڵ خەڵکی ناو دێ دەمەتەقەمان دەکرد. لەئاست هەڵەدەرەوە تەقە دامەزرا. دەڕوانم گەلەجاشێک، بەمەبەستی ئەوەی پشتمان لێبگرنو دەستمان لێبوەشێنن. بە شاخی (دۆڵەکان)دا دادەگەڕێن. چەند سەد مەترێک لێمانەوە دوور بوون..".

ئێمە نە ئاگامان لە پێشمەرگەکانی خاوێو نە بۆسەنانەوەی سوپاو جاش بوو. ئاش لە خەیاڵێکو ئاشەوان لە خەیاڵێک. دونیا

---

* حەمە رەش شێخ کەریم ساڵی ١٩٩١ شەهید بوو.

** سەلامی فەقێ عەلی: دوو برای پێشمەرگە بوون (قاسمو ئازاد)و دوو ئامۆزای (حەمیدو حەمەساڵح) شەهید کران.

*** شێخ عەبدولکەریمی خاوێ، باوکی باپیرەی شێخ عەبدولکەریمی کەسنەزانە. شێخ عەبدولکەریم (١٧١٧-١٨٠٢) گوندی خاوێی ئاوەدان کردۆتەوە، کوڕی شێخ ئیسماعیلی ولیانی یە (١٦٧٠-١٧٤٥) کە یەکەم کەس بووە ڕێبازی قادریی لەکوردستاندا بڵاوکردۆتەوە. پێش شێخ سمایلی ولیانی بەرزنجەییەکان بۆ ماوەی (٢٥٠) ساڵ نوربەخشی بوون.

**** حەمە هەتیو، هاوڕێی شێخ عەبدولکەریمی خاوێ بووەو خۆی وەسیەتی کردووە: هەرکەسێک ویستی زیارەتی مەرقەدەکەم بکات، دەبێ پێشتر سەردانی مەرقەدەکەی حەمە هەتیو بکات.

کش‌و مات، ئاسمان ساماڵ، تینی هەتاو گەرمی دەکردینەوە.
خالید نوکتەی دەگێڕایەوەو باسی دەزگیرانەکەی بۆ دەکردم.
پێشمەرگەکان لەپێشمانەوە بە لۆژە لۆژ دەڕۆیشتن. ئێمەش بەئەوپەڕی بێباکیەوە باسی گەرمیان‌و کوێستانمان دەکرد. خالید گەرمیانی گوتی: "هەر ئێستا هاوڕێیان لەخاوێوە، یان لە قازانقایەوە دەمانبینن‌و فیشەکێک دەتەقێنن‌و ئێمە دەتوانین بۆ لایان بڕۆین..".

لەنێوان خاوێ‌و هەڵەدەرەدا بووین، لەپڕ فیشەکێک تەقێنرا. خالید لەقاقای پیکەنینی دا و گوتی:

"چیم پێ گوتی مامۆستا! ئەوە هاوڕێیانی خۆمانن، دڵنیام ئەوان ئێمە دەبینن. ئێمە ئەوان نابینین.. ئەوە ئەوان لەکوێن؟".ئەو میلی هێنایەوەو گوللەیەکی بەرەو ئاسمان، روو لە خاوێ تەقاند..ئەو فیشەکەی ئەو، بزیزکێک بوو، بەر بەرمیلێک باروت کەوت. لەسەرەوە دایانگرتین. ئاگرباران‌و گرمەو ناڵە لەسەرەوە دەهات. ئەوان لەناو دارستان بەردەلان‌و دارو دەوەن بوون. ئێمەش لە دەشتایی‌و شەڕگەیەکی رووتەن‌و کراوەین. گرمە و ناڵە و تەقەیەکی خەست. دەیان سەرباز بە چەکی جیاجیا تەقەیان لێدەکرین. خالید نە پەشۆکاو نە تێکچوو. بەقەڵەمبازێک خۆی دەپشت بەردێک هاویشت. منیش خۆم دەپاڵ بەردێک هاویشت. هەشت مەترێک لەیەکەوە دوور بووین. بەگوێرەی رێژنەی گوللەبارین، سەربازەکان لەئێمەوە دوور نەبوون! پێشمەرگەکان جۆگایەکی قووڵی کۆنیان کردبووە سەنگەر. خالید بیست گوللەیەکی پێوەنان. رووی لە من کردو گوتی: "نابێ

فیشــەکی زۆر بتەقێنــین.. دەبــێ دەســتی پێــوە بگــرین.. هێــزەکە زۆرە.. هەر ئێستا هەلیکۆپتەر پەیدا دەبێت..". گولله وەکو تەرزە بەســەر بەردەکەی بەردەممــدا دەبــاری. خالیــد گــوتی: "هێــزەکە زۆرەو دەبــێ بەزووتــرین کــات لەم بۆســەیەدا خۆمــان دەربــاز بکەین..".

خالیــد هەســتا و ویســتی بەرەو لای پێشــمەرگەکان بــڕوات. حەوت هەشــــت هەنگاوێــــک لە بەردەکە دوورکەوتەوە. لەپــــڕ هاواری کرد: "ئای دایە مردم!" بەسەر دەمدا کەوت. جوڵە، نوزە، هەناسەی لێبڕا. بەلامەوە سەیر بوو: گوللەیەک کۆتایی بەم کێوە مەزنە بهێنێــت. چەنــد جارێــک بــانگم کــرد، وەلامــی نەدایەوە. ڕێژنەی گولله بە بن گوێماندا گیزەی دەهــات. ســێ پێشــمەرگە بە ڕاکــردن لاشــەی خالیــدیان هەڵگــرت. بە چاوترووکانــدنێک لەنــاو دارو دەوەنو پووش و گەڵا شاردیانەوە.

جێگــرەکەی خالیــد گەرمیــانی، کــوڕێکی زۆر بەڕێــز بــوو، بە شەهیدبوونی خالید گەرمیانی زۆر شڵەژابوو. ناچار بووم پێیان* بڵێم: " لە ســێ لاوە گەمــارۆ دراویــن ناچــارین بەرەو ئاڕاســتەی ڕۆژاوی گونــدی گەڕەزیــل بــڕۆین. خالیــد گەرمیــانی قــاڵبووی شــەڕی پــارتیزانیو تۆپۆگرافیــای نــاوچەکە بــوو. دەســتەکەمان لەڕووی عەسکەرییەوە بێ ســەر مــایەوە. بواری بیرکردنەوەمــان نەبوو. ناچار بووم هانیان بدەمو ورەیان بەرز بکەمەوەو هەوڵــی

---

* لوقمــان حەیــدەر، بەهــائەدین عەبــدوڵڵا، شــالاو، حەمەی ئیعلام... بەوردیــی چرکەکانی شەهیدبوونی خالید گەرمیانییان بیر ماوە.

دەربازبوون بدەین. پێشمەرگەکان ویستیان بەرەو قازانقایە بڕۆن، دایانگرتنەوە. چەند پێشمەرگەیەک بەناو دارەکاندا لە مریەم بەگو هەڵەدەرە نزیک بوونەوە. هێزێکی سەربازی لەناو گوندەکە بوون. پێشمەرگەیەک گوتی: "بەرەو تەنگیسەرو چەمی تلێ بڕۆین!" پێشمەرگەیەک (بەهائەدین عەبدوڵلا) گوتی: "ئەو قەڵەبالغییە بەو شاخەوە چییە؟". سەیری شاخی (کەڵوێ)م کرد، کە لەدوورەوە لەپشتی حوشتر دەچێت، سەرباز وەکو مێرووڵە، بەتەنیشت یەکترەوە، ڕیچکەیان بەستووە، نزیکەی نیو کیلۆمەترێک داکشاین. تەقە لەسەرەوە گەرمترو لەسەر ئێمە کزتر بوو.

ئێمە بۆ هەرکوێ دەچووین، سەربازمان بەدی دەکرد. لەئەنجامدا شوێنێکی قایممان دۆزیەوە. دابەشبووین‌و بڕیارمان دا تا ئێوارە لەوێ بمێنینەوە. ئەگەر هاتنە سەرمان، ئەوە لەو شوێنە دەتوانین داکۆکی لەخۆمان بکەین. ئێوارە، مستەفا چاوڕەش، شێخ جەعفەر، ڕۆستەم کەرکوکی، حەمە ڕەش، سەلامی فەقێ عەلی..تاد. هەریەکە ڕووداوەکەی لە گۆشەنیگای خۆیەوە دەگێڕایەوە. ڕۆستەم گوتی:

"من‌و شێخ جەعفەر لای مزگەوتەکە بووین، گوێمان لە تەقە بوو. نەمانزانی چەند سەد مەترێک لەدووریی ئێمەوە، ئێوە کەوتونەتە بۆسەوە. هێزێکی جاش لە کەسنەزانەوە، بە شاخی (دۆڵەکان)دا هەڵدەگەڕا من (ئارپ بی جی)یەکم بە گا بەردێکەوە نا، کە لەناوەڕاستیاندا بوو. هەریەکەیان بەلایەکدا قووچاندیان. لەسەر شاخیشەوە، ڕەوە جاشێک داگەڕا. بە بڕنەو تێیان

کەوتین. نەمانهێشت پشتمان لێبگرن". هەلیکۆپتەر پەیدا بوو. رۆستەم هەلیکۆپتەرێکی بەر (ئارپ بی جی) دا. تەپو تۆز و دوکەڵی لێهەڵساند. جووتیارەکان گوتیان: ئەو هەلیکۆپتەرە پێکراوەو بەدیوی چەمچەماڵدا بەربۆتەوە. شەڕ لە سەعات هەشتەوە تا چواری پاش نیوەڕۆ بەردەوام بوو.

سەلام فەقێ عەلی چاوی چەپی لەدەست دا، حەمە رەش قاچی بریندار بوو.

# کۆتایی گەشت
## (٩)

ئێوارەی هەمان رۆژ، مستەفا چاورەش‌و شێخ جەعفەرو رۆستەم، لە برایماوا، لەرێگەی رێکخستنەوە ئێمەیان دۆزییەوە. شەهیدبوونی خالید گەرمیانی بۆ ئەوانیش کۆستکەوتن‌و جەرگبڕ بوو. لەتەنیشت شاسوار جەلال (ئارام) بە خاکمان سپارد، ساتێکی بێدەنگیی توورە و پڕ ئازار: لەناو دڵ‌و دەروونندا کۆڕی شینگێڕان‌و چەمەری‌و لاوانەوەمان گێڕا.

هەمان شەو خۆمان گەیاندە دێلێژە. بەسەر ماڵاندا دابەش کراین. خانەخوێکەمان زۆر بەڕێز بوو. حەمامیان گەرم کردبوو. دەستێ جلی پاکی بۆ هێنام‌و بەزۆر رەوانەی حەمامی کردم. بەراستی جووتیاری کورد، قورسایی شۆڕشیان دەستۆ گرتبوو، لە دابەشکردنی کێکی سەرکەوتن، دژە شۆڕشەکان لە دروێنە و خەرمان هەڵگرتندا، پشکی شێریان بەرکەوت.

رۆژی (١٩٨٠/١٢/٩) بە رێگای بنار شاخدا بۆ مێولی چووین. گوێم لە تەقە بوو. لە کادرە سیاسی‌و عەسکەریەکانم پرسی: "ئەم تەق‌و تۆقە چی بوو؟ گوتیان: بەکرێگیراوێکی پیس، لەناو شار گیراوەو بڕیاری کوشتنی دراوە! لێرە بڕیارەکە جێبەجێ کراوە". من پرسیاری ئەوەم کرد: "ئایا ئەو کەسە دادگایی کراوە؟" ئەوان گوتیان: "ئەمانە بە بنەماڵە جاسوس‌و خۆفرۆشن‌و دادگاییکردنی ئەم جۆرە کەسە پێویست نییە!". من پێمگوتن: "ئێوە مافی کوشتنی هیچ کەسێکتان نییە. کەسانی تاوانبارکراو

دەبێ ڕەوانەی سەرەوە بکرێن. لەوێ دادگای حاکمی شۆڕش هەیە. زۆرجار لەسەر بنەمای گومان، کەسانی بێتاوان خوێنیان ڕژێنراوە. بڕیاری ئیعدامکردنی خەڵک دادگا دەیداتو سکرتێری گشتیو (م.س) لە کۆبوونەوەی (م.س) بڕیاری دادگا پەسەند دەکەن، یان تانەی لێدەدەن!".

پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ، لە قازانقایەوە سەرمان دەکرد. زۆربەی کادرە سیاسیو عەسکەریەکان بۆ نانی ئێوارە لە دیوەخانی شێخ محەمەد یەکمانگرتەوە. نانخواردنو کۆبوونەوەی سیاسیو باسی داهاتووی بارودۆخی وڵات تێکەڵاو کران. دلاوەری ئەحمەد مەجید، کە پیاوێکی قسەخۆشو قسە لەڕووە، دەوری هەبوو لەوەی خەڵک فێری کاسەر و جەلی خواردن ببێت. ئەو ئێوارەیە لەوێ نەبوو. بەڵام کولتوورەکەی لەوێ بوو. کاسەرو جەلیمان دەخوارد. یەکێک لە هاوڕێ بەرپرسەکان پێیگوتم:

"تۆ لەگەڵ ڕێکخستنی ناو شاردا مەوعیدی یەکتربینینتان داناوە؟"

من گوتم: "من پەیوەندیم بە ڕێکخستنەوە نییە!"

ئەو گوتی: "سێ کیژی خوێندکاری زانکۆ لێرەنو دەیانەوێت بتبینن!"

من گوتم: "ئاگادار نیمو پەیوەندیم لەگەڵ ڕێکخستندا نییە!"

ئەو گوتی: "من پێمباشە بیانبینیت!"

من گوتم: "من پێمباشە نەیانبینم!"

ئەو گوتی: "پێویستە!"

من گوتم: "نا! پێویست نییە!"

ئەو گوتی: "لەشارەوە هاتوون‌و لەم ماڵەن. هیچ نەبێ بۆ ماوەی ١٠ دەقیقە یەکێکیان ببینە، نەوەک کارەکەیان پێویست بێت.."

من گوتم: "بەمەرجێک تۆش تا دوا چرکە لە دانیشتنەکەدا بەشدار بیت!"

دوای چەند دەقیقەیەک یەکێک لە سێ خوێندکارەکە هاتەژوورەوە. من ناسیمەوە. براکەی یەکێک لە هاوڕێ نێزیکەکانم بوو. هاوڕێ بەرپرسەکە بیانوویەکی دۆزیەوەو هەردووکمانی بەتەنیا جێهێشت. زانیم ئەو کیژە بۆ کاری سیاسی‌و ڕێکخستن نەهاتووە. بە ڕاستەوخۆ تێمگەیاند من وەکو خوشکێک سەیری ئەوم کردووە. ئەو بە زمان، چاو، برۆ و نیگای سیحراوی، تۆڕی سەوزو سووری بۆ گۆمێکی سەهۆڵاویی بەستوو هەڵدەدا. زرمەی لە شەختە هەڵدەساندو نەدەپرینگایەوە. من بۆ بن گۆمەکە شۆڕتر دەبوومەوە، تۆڕەکەی ئەویش وردە سەهۆڵی سەر شەختەکەی رادەماڵی. ڕۆژێک پێشتر، بە ڕێکەوت نەکوژرام. سبەی‌و دوو سبەیش نازانم لەکوێ بۆسەی تر نراوەتەوە، یان هەلیکۆپتەرێک دامانده‌بێژێت؟

(١٩٨٠/١٢/١١) ماڵئاواییمان لە پێشمەرگەکانی هەرێمی (٥) کرد. بە سێ ڕۆژ، وێڕای حەمە ڕەش‌و سەلامی فەقێ عەلی خۆمان گەیاندەوە مەملەکەتی خڕی نێوزەنگ. ڕۆژانە، یان شەوانە پانزە سەعاتێک دەڕۆیشتین: ڕۆژی یەکەم: پاش نیوەڕۆ لە گەڕەزیل دەرچووین. بەسەر سەرزەل، جێشانە، عەواڵ، قولەرەیسی تێپەڕین. سەعات ٧ی بەیانی لە قزلەر بەرچاییمان کرد. واتە: بەناچاریی ١٧ سەعات ڕۆیشتوین. ڕێگاکەمان لای

بەکرەجۆ بەناو کارگەیەکدا تێدەپەڕی. ئەمە ڕێگای سەلامەت بوو. پاسەوانێک بە سەربانی ژوورێکی کارگەکەوە پاسەوانی دەگرت. تەنیا (٣٠) مەترێک لە دەرگاکەوە دوور بوو. کاتێک بۆ لای دیوارەکە دەهاتەوە، کەمتر لە دە مەتر لە دیوارەکەوە دوور بوو، کە ئێمە بە نرکە نرک بە بنیدا تێدەپەڕین. من بە حەمەڕەش و سەلامم گوت: "دەبێ بە بن ئەم بلاجەکتۆرانەدا بڕۆین. پاسەوانەکەش هەر (٣٠) مەترێک لیمانەوە دوورە؟ ئەوان بە سوعبەتەوە گوتیان: هیچ خەمت نەبێت! ئێمە ڕێکەوتنمان لەگەڵیاندا ئیمزا کردووە. ئەگەر ئەو جولایەوە، پێش ئەوەی دەستبکاتەوە، تەپڵی سەری بەئاسمانا دەبەین.. تا ئەمڕۆش ئەم مەتەڵەم بۆ هەڵناهێنرێت: چۆن دە دوانزە پێشمەرگەیەک بەو هەموو چەکو تاقمەوە، بە بن بلاجەکتۆرو لوولەی تفەنگی پاسەوانەکاندا تێپەڕین. دیارە پاسەوانەکە حەزی کردووە خۆی بکاتە خەفتگ، هەروەکو سنەییەکان دەڵێن!

# نامەیەک بۆ بەغدا
# (١٠)

لەسـەر پێشـنیاری بەنـدە رۆژی (١٩٨٠/١/١٥) دەربـارەی گفتوگۆ لەگەڵ میریی، مەکتەبی سیاسـی کۆبـوونەوەیەکی کـرد. من پەیامی دەسـەڵاتدارانی بەغدام وەکو خۆی پێشـکەش کردن. بە تێروتەسـەلی شـیکاریو گفتوگۆی لەسـەر کـرا. ئامـادەبووان، بەگشـتی پەیامەکەیـان بەئەرێنـی هەڵسـەنگاند. مـام جەلال* لەوێ بـوایە، بە عەرەبییەکـی جـوانو دیپلۆماسـیانە بەرسـیڤی رژێمـی دەدایەوە، بەهەمـوو رێکەوتنێـک رازی دەبـوو. گرنـگ ئەوەبـوو، لەسەر خاکی کوردستان شەڕراگرتن بەفەرمـی دانی پێدا بنرایە! ئەوکـاتە تەرازووی هێزی عەسـکەری بەقـازانجی عێـراق نەبـوو.

---

* سـالی ١٩٩٨ رۆژنامەنووسـێکی ناسـراوی لوبنـانی (غسـان شـربل) گفتوگۆیەکی مـام جەلال لە گۆڤـاری (الوسـط) بلاودەکاتەوە (جـلال طالبـانی يتذكر) ئاماژە بەم گفتوگۆیە دەکات:

-ماذا عن موقفكم من الحرب العراقيه- الايرانيه فى ١٩٨٠؟

-كان موقفنا هو عدم الموافقه وإدانه الحرب علانيه بأعتبارها تضر بمصالح الشعبين. لكننا قررنا عدم مقاتله الجيش العراقى وهو يقاتل جيشا أخر، لاننا نحسب حسابا لمشاعر المواطن العربى فى العراق ومشاعر الجيش العراقى. أوفدنا الاستاذ فاضل كريم، عضو المكتب السياسى فى الاتحاد الوطني، طالبين من الحكومه العراقيه إيقاف اطلاق النار حتى تنتهى الحرب وحتى لا نتهم بأننا نقاتل الجيش العراقى، لكن الرئيس صدام رفض العرض.

غسان شربل: جلال الطالباني يتذكر، في مجلة الوسط، العدد ٣٥٦ تأريخ ١٩٩٨/١/٢٣.

دیالۆگ لەگەڵ بەغدا رەنگە بۆ ماوەیەکی کاتی بەرهەمی خۆی هەبوایە.

کەچی نەوشیروان هەڵوێستێکی پارادۆکسی* هەبوو:

لەلایەکەوە گفتوگۆی لەگەڵ رژێمی بەغدادا پەسەند کرد و شەڕ راگرتنی بە باش زانیو ئامادەبوو، نامەیەک بۆ سەرۆک کۆمار بنووسێتو نامەیەک بۆ شێخ محەمەدی کربچنە رەوانە بکاتو پێشنیازی فەرەیدوونی کرد، بەرەو بەغدا بکەوێتەڕێ. لەلایەکی ترەوە نامەکەی بەتاڵ بوو، لە رێسا و ئەتەکێتی دیپلۆماسی، تژی بوو لە سوکایەتیو تانە و تەشەر بۆ کاربەدەستانی بەغدا. سەرکردەی سیاسی دەبێ پێشنیاز و پەیامی بەرامبەر، هەرکەسێک بێت بەئەوپەڕی رێز و چوارچێوەی قانونی وەڵامبداتەوە، یان بەجوانی پێشوازی لە پەیامی بەرامبەر بکرێتو ئامادەی دۆزینەوەی چارەسەر بێت.

ئەو لە یادەوەرییەکانیدا لەپشت تەمومژ و دوکەڵەوە، ئاماژەیەکی شێواوی هەڵبزرکاوی بۆ رووداوەکان کردووە. راستو رەوان دانی بە هەڵەکانی خۆیدا ناوە، کە نامەکەی نامەیەکی نەشیاو بووە. سەرکردەیەک، چارەنووسی گەلێکی دەستو گرتبێت، دەبێ بەئەوپەڕی گیانی بەرپرسیارێتییەوە هەڵسوکەوت بکاتو نامە بۆ لایەنەکانی تر بنووسێت با ئەو لایەنە سەرسەخترین دوژمنیش بێت!

ئەو راستەوخۆ نامەکەی بۆ سەرۆک کۆماری عێراق رەوانە کرد. ئەوەی بیرم مابێت داڕشتنەکەی بەمشێوەیە بوو:

---

* پارادۆکس: Paradox

"ماوەیەکە سوپای عێراق‌و ئێران دژی یەکتر بەشەڕهاتوون. ئەم دوو سوپایە لەوەتەی دامەزراون، هەر کوردیان کوشتووەو کوردستانیان وێران کردووە. ئێمە زۆرمان پێخۆشە ئەم دوو سوپایە یەکتری وردوخاش بکەن‌و یەکتری لەناوبەرن‌و هیچیان نەمێنێتەوە.."*

لەکۆتاییدا نوسیبووی فەرەیدوون عەبدولقادر نوێنەری ئێمەیەو هاتووە بۆ ئەوەی دانوستاندنتان لەگەڵدا بکات!"**

من ناڵێم رژێمی بەعس فاشی نەبووە! ناشڵێم ئەوان نیازیان باش بووە، دەمەوێ راشکاوانە ئەوە بنووسم ئەقڵی سیاسی ئێمە لە کام ئاستدا بووە؟***

---

* نەوشیروان لە بیرەوەریەکانیدا، رووداوەکەی بەمشێوەیە گێڕاوەتەوە: "لە نامەکەمدا بۆ شێخ محەمەدم نوسی: ئەم دوو حکومەتە: عێراق‌و ئێران، ئەوەندەیان زوڵم لەکورد کردو، کورد خۆیشی نەیتوانی هەقی خۆیان لێ بسێنێ، وا خوا هەقیان لێئەسێنێ‌و، بەم شەڕە بەر غەزەبی خوا کەوتون. ئێمە پشتیوانی لە هیچکامیان ناکەین، بەڵکو داوا لەخوا ئەکەین وەکو سەگەکانی رەزا بەگیان لێبێ. لەگەڵ ئەوەیشدا ئێمە هەرگیز دەرگای گفتوگۆمان دانەخستووە، ئەگەر عێراق بەراستیی بێتەپێشەوە، بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد، ئێمەش ئامادەین بۆ گفتوگۆ" پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن ل١٧٢.

** ئەو لەکاتی نوسینی بیرەوەریەکانیدا زوخاوی پەشیمانیی هەڵڕشتووە، پاش چی؟ (شێخ محەمەد نامەکەی پیشانی کاربەدەستان دابوو. زۆر زیاتر لەجاران رقیان لێهەڵگرتم. ئێستا کە بیری لێئەکەمەوە ئەبو بە زمانێکی ئەدەبیتر نامەکەم بنوسیایە..) پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن، ل١٧٢.

*** رۆژێک دێ نامەکانی نەوشیروان بۆ سەدام بڵاودەکرێنەوە، کە ساڵی ١٩٨٩ بۆ سەدامی نوسیووە. من دەقەکەم لەبەرە، بەڵام هیوادارم کەسێکی دی بڵاویان بکاتەوە..

کارو ململانێی سیاسی لە گەمەی شەترەنج دەچێت: تۆ دەبێ بەرامــبەر دوژمنەکانــت جۆرێــک لە جۆرەکــانی هاوســەنگیی دروستبکەیتو بە پلانی تۆکمە و بەرچاوڕوونییەوە کار بکەیت..

# له خڕی نێوزەنکەوە
# بۆ ئەشکەوتەکانی سوورێن

## بەرەو شارەزوور

فەرەیدون لە گفتوگۆی بەغدا، بە دەستبەتاڵی گەڕایەوە. ئێمە پێشبینی کاردانەوەی رژێممان کردبوو، (وإن جنحوا للسلم فاجنح لها) ئەو داوای ئاشتی کردبوو. تۆ نابێ بە جوێن‌و قسەی بەرزونزم دایانگریتەوە. دەتوانرێ بە هەزارو یەک شێوە وەڵامی رژێم بدرێتەوە. کرماشانیەکان دەڵێن: (مەلویچک خۆت چەیدو شۆرباگەد چەس)* سەرکردە مەزنەکانی مێژوو بەگوێرەی بەڕە قاچیان راکێشاوە. تۆ هیچت بەدەستەوە نەبوو، چۆن گرەو لەسەر ئەوە دەکەیت، ملی رژێم بابدەیت؟

نەوشیروان هەستی کرد، ناوەڕۆکی نامەکەی باش نەبوو. شپرزەیی پێوە دیار بوو. کەڵکەڵەی ئەوە کەوتە مێشکیەوە بۆ ڤییەننا بچێت، کەچی بڕیاری دا بنێرێ لە شارەوە دایک‌و کەس‌وکاری بێن و بیانبینێت..

ئێمە وامانزانی: دەستەیەک پێشمەرگەی هەڵبژاردەی دیاریکردووەو بە پلان‌و حیساب‌و کیتاب دەڕوات. دواتر زانیمان، دەیەوێت بە دوو کەسەوە گەشتێکی بێوێنە بکات. ڤییەنا شارێکی زۆر خۆشە، بەتایبەتی شلۆس بیلڤیدەری‌و باخچەی بیلڤیدەری. پیاسەی سەر چۆمی (دۆناو)** لەگەڵ پیاسەی چۆمی (گەلاڵ) زۆر جیاوازە. کیژانی ڤییەنا زۆر جوان‌و شۆخ‌وشەنگن. لە چۆمی گەلاڵ مەفرەزەکانی خولەی حەمە تاتە، کەریمی دادە مەنە، رەشەی کەچە، مام ئاراس‌و رەئوفی خەلیفە سەعید،*** بەقسەی

---

* چۆلەکە خۆت چیت و گۆشتاوەکەت چییە؟

** روباری دۆناو: روبارێکی مەزنە ئەڵەمانەکان پێی دەڵێن (دۆناو) نازانم کورد بۆ دەنووسێ (دانوب!) من پێموایە (دۆناو) لە (دۆن)و (ئاو)ەوە هاتووە!

*** رەئوفی خەلیفە سەعید، ئامۆزای محەمەدی حاجی مەحمود بوو.

نەوشیروان: (بەخوێنی تینوون!) مرۆڤ نابێ (شوێنبرونن)و (ڤالتەر شتراسە)و (ئۆپەرگاسە)ی لەگەڵ پەرخو بیوەکو هۆزی خواجە و کوڕی گەپلە لێتێکبچێت!

ئێمە بەلامانەوە سەیر بوو، سکرتێری ڕێکخراوێکو کەسایەتی دووەمی حزبێک، بەئەوپەڕی کەمتەرخەمیەوە، پڕ مەترسیترین شوێن بۆ بینینی خوشکو دایکو کەسوکار هەڵبژێرێت، مولازم عومەرو منو هەڤاڵانی تریش تکای خوێنێکمان لێکرد، بەوشێوەیە نەچێت. هەرچی وزەو توانامان هەبوو خستمانەگەڕ پەژیوانی بکەینەوە، هیچ سوودێکی نەبوو! مولازم عومەر گوتی: "چۆن بە دوو پێشمەرگەوە بۆ شارەزوور دەڕۆیت؟ دەبێ هێزێکی تۆکمەو شارەزا پارێزگاریت لێ بکەنو ئاگایان لێت بێت!".

زمانمان مووی لێهات، ئەو لە کەلی شەیتان نەهاتەخوارێ. لەسەر سەفەرە ئەفسوناوییەکەی سوورتر بوو. ئەو دەیگوت: "هێزم لەگەڵدا بێت ئاشکرا دەبمو کێشەم بۆ دروست دەبێت. بەنهێنی دەڕۆمو بەنهێنی دەگەڕێمەوەو خۆم لە کەس ئاشکرا ناکەم. کارێکی وا دەکەم، ئەوەی بشمبینێت بڕوا نەکات من نەوشیروانم. کەس ناتوانێت پارێزگاری لە من بکات. من تەنیا خۆم دەتوانم پارێزگاری لەخۆم بکەم..".

مولازم عومەر پێیگوت: "سەرانسەری ناوچەکە جەنجاڵو شەڕو شۆڕو ئاگربارانە: ئێرانو عێراق لە ئەرزو ئاسمان، چنگیان لەگەرووی یەکتری گیرکردووە، بەهەموو چەکێک لەیەکتری دەدەن. کۆمەڵەو دیموکرات، بەدرێژایی ڕێگای سەردەشت- بانە دژی سوپای ئێران دەجەنگن. نێوان ئێمەو حسک، پریشکو باروتی ڕەشە، یەکتری چەککردنو

پەلاماردانو راوەدوونانی یەکترییە! چۆن بە سێقۆڵی بەناو ئەم هەموو مینو تەڵەو جۆگای خوێنەدا دەڕۆن؟".

نەوشیروان قسەی کەس بەگوێیدا نەدەچوو. زۆر بڕوای بە هێزو توانای خۆی هەبوو. پێیوابوو بە دوو پێشمەرگەوە، دەتوانێت پڕ مەترسیترین گەشتی هاتوونەهات ئەنجام بدات..

کامەران عارف پێنجوێنیو شیهابە سوور،* بوونە هاوڕێو هاوسەفەری ڕێگای خڕی نێوزەنگ- دۆڵی گەلاڵ. کامەرانو شیهابیش بەروونی پێیان گوتووە: "کاک نەوشیروان! دەمانەوێت پێشەکی بەڕاشکاوانە ئەو ڕاستییە بخەینە بەرچاوت، ڕێگاکە پڕ مەترسییەو بمانەوێتو نەمانەوێت، تووشی بۆسەو شەڕو هەرا دەبینو سێ کەس هیچمان پێ ناکرێت..".

نەوشیروان لەبری پێداچوونەوە بە بڕیارە نائەقڵانیە بێتامەکەی خۆی، لەهەردووکیان توورە دەبێت: "دیارە ئێوە ترسنۆکنو ناوێرن بێن. باشە بڕۆن، مەیەن، من دوانیتر لەگەڵ خۆمدا دەبەم..".

ئەوان دەڵێن: "ئێمە خەمی تۆمانەو با بڕۆینو ئێمە لە هیچ ناترسین.." نەوشیروان ناوی خۆی دەنێت: (مستەفا ئەحمەد)و داوایان لێدەکات ناوی ئەو لای هیچ کەسێک نەدرکێنن!

هاوڕێیەکی شاسوار جەلال (ئارام) سەربردەیەکی ئەوی گێڕایەوە، هەرچەند بەراوردو بەراوردکاری ڕەوا نییە، زەمانو زەمینەکەش زۆر جیاوازن.. من هەروەکو سەربردەیەکی خۆش ڕووداوەکە دەنووسمەوە:

---

* شەهاب فەتاح باپیر: خەڵکی گەڕەدێی شارباژێڕ بوو، بەر شاڵاوی ئەنفال کەوت.

کاتی خۆی عەلی عەسکەری لە سووورەبان، بە هێزێکی سەدوپەنجا پێشمەرگەوە، چاوی بە ئارام دەکەوێت. ئەو تەنیا دوو پێشمەرگەی لەگەڵ دەبێت: (دەرسیم* و دکتۆر چالاک**). عەلی عەسکەری سەری سوڕمابوو لە شێوەی خۆپاراستنی سەرکردەیەکی سیاسی گەورە. ئەو بە ڕامانەوە ڕوودەکاتە ئارامو دەڵێت: "کاک ئارام تۆ چۆن بە دوو پێشمەرگەوە دەسووڕێیتەوە؟ ئێمە تەنیا عێراق دوژمنمانە، یەک دەوڵەت شەڕمان دەکات، تۆ دوو دەوڵەت؛ عێراقو ئێران بەخوێنی سەرت تینوون. دوو دەوڵەت دەیانەوێت لەناوت بەرن. ڕۆژنامەکانی ئێران لەسەرت دەنووسن: وەکو سەرکردەیەکی کۆمۆنیست لەسەرت دەنووسن. تۆش بێباکانە بە دوو پێشمەرگەوە بەدێهاتەکاندا دەسووڕێیتەوە!"

ئارام زۆر حەزی لە سوعبەتو قسەی خۆش بوو، دەیتوانی گونجاوترین وەڵام پێشکەش بکات:

"دەرسیمم بۆ ئێران داناوەو دکتۆر چالاکیش بۆ عێراق!".

نەوشیروان سەرکردەیەکی سەربازی نەبوو، ئەو هیچی لە شەڕی پارتیزانیش نەدەزانی، بۆیە بەقسەی کەسی نەدەکرد. دەیان کەس نارەزایی خۆیان خستەڕوو، ئەو لەسەر یەک هەڵوێستی هەڵە هەڵچەقی. ئەوەی لەمێشکی خۆی گەڵاڵەی کردبوو، هەر ئەوەبوو: بەتۆپ لەسەر پشتی ئەسپی تۆپیوی هەڵە، دانەبەزیو جڵەوی بۆ ئەسپی گەشتێکی پڕمەترسی شلکردەوە..

---

* دەرسیم: غەفور حەسەن.

** دکتۆر چالاک: کەریمی دادە مەنە.

ئەوان ملیان نا و ڕۆیشتن. سەرەتا بۆ بێژوێ، ئینجا بۆ بلەکێ، لەوێشەوە بۆ چاڵەخەزێنە. لە چاڵە خەزێنە بڕیاردەدەن بمێننەوە. کوڕی کوێخای دێکە بەپیریانەوە دێت. لەگەڵیاندا تا بەردەم ماڵێک پێشیان دەکەوێت. لەبەردەم دەرگای ماڵەکە پێیان دەڵێت: "ئێوە بۆ ئەم ماڵە بڕۆن! من ناتوانم ئێوە بە ماڵەکە بناسێنم. چونکە نێوانمان زۆر ناخۆشەو ماوەیەک پێش ئێستا قڕەقڕمان بووە..". نەوشیروان خراپ لە کابرا تووڕە بووە. لای ماڵەکەوە خیشی کردووەو بەرەو مزگەوت گەڕاوەتەوە..".

لەگوندی دۆسەیەرە (دۆستەدەرە) نامەیەک بۆ حەمەی حاجی سابیر دەنووسێت، کە کادرێکی سیاسی ئەو ناوچەیەو دۆڵی گەلاڵ بوو: ئێستا ئەو گەیشتۆتە دۆسەیەرەو دەیەوێت بەزووترین کات ببینێت. ناوی لەخۆی ناوە (مستەفا ئەحمەد)و نایەوێت کەس پێیبزانێتو کەسیش ببینێت. بۆ کارێکی تایبەت هاتووەو زۆر لەناوچەکە نامێنێتەوە..

### پەرخ‌و بیوەك

دۆڵی گەلاڵ، بەهاوین دۆڵێکی وشک‌و برینگ‌و کرێن‌و کەم ئاوە. زستانیش بەشێک لە لاپاڵەکانی شیندەبنەوەو تەنیا لەکاتی باراندا چەمە زستانە پەیدا دەبێت. دارستانی شاش‌و واشە. کولتووری ڕەزو باخ نامۆیە. پەڵەی بچوک بچوک گەنم‌و جۆ دادەچێنرێت. ژیواری ئەم دێهاتە لەسەر شابوری ئاژەڵداری هەڵچنراوە. "پەرخ"و "بیوەک" دراوسێ دێن، نیو سەعاتێک بەپێیان لەیەکتریەوە دوورن. هەر دێیەک لەم دوو دێیە (٢٠-٢٥) ماڵێکی تێدا نیشتەجێبوون. بێئاویو ڕژدیو سەختی لاپاڵەکان، کە

هەمـووی لەسـەرەوە لەقەڵای سروشـتی دەچـن، کاریگەرییـان لەسەر شێوەی ژیان‌و خانووبەرەیان داناوە. ماڵەکانیان لەڕووی بیناسـازی (ئەرشـتێکت)و ئەرشـتێکت‌و ئەنـدازیاری‌و ژیـارییەوە لەگەڵ دێهـاتی ئـالان‌و سـیوەیل‌و بازیـان‌و هەورامـان بەراورد ناکرێت.

دوو سـەربردەی سـەردەمی پێشـمەرگایەتی هەر بـۆ خۆشـی دەنووسمەوە:

## یەکەم:

شاسـوار جەلال (ئـارام)و کـادرێکی سـەربازی لەنـاو ماڵێکدا دەبن، چـاوەڕوانی بەرچایی دەکەن. لەپڕ ئاگـادار دەکرێنەوە، کە سـەرباز گەمـارۆی گونـدی پەرخـی داوەو بـواری دەربـازبوون نەماوە. پێشبینی شەڕی دەستەویەخەی نێو مـاڵان دەکرا. ئەمـان بەناچـاری لەجـێگەی خۆیـان دادەنیشـن‌و پەنجەیـان لەسـەر پەلەپیـتکەی کلاشـینکۆفەکانیان دەبێـت. ژنەکە لەسـەر سـینیەکی چڵکنـی ژەنگـاوی تێکقوپـاو، نـان‌و چایـان بـۆ دادەنێـت. کـادرە عەسـکەرییەکە سـرنجی دەچێـتە سـەر پیـاڵە خۆڵەمێشـاوی‌و پیسەکان، بەڕێزەوە بە ژنەکە دەڵێت: "دادە گیان زەحمەتی نەبێت ئاوێکی گەرم بە پیاڵەکاندا بکە!". ژنە پنجلەکە بێڕێزیی دەنوێنێت. کادرەکە تووڕە دەبێت‌و دەڵێت: "بڕۆ مێردەکەت بانگ بکە با دوو قسـەی لەگەڵـدا بـکەم..". ئـارام زۆر پێـدەکەنێت‌و دەڵێـت: "ئەمە یەکەمـین جـارە رووداوی وا ببیـنم، چواردەورمـان بە هێـزی سـەربازی دوژمـن تەنـراوە. لەسـەر پاک‌وخـاوێنی، میـوان خانەخوێ لەماڵ دەربکات!".

دووەم:

ئومێدی سەعید گەوهەر بۆی گێڕامەوە:

"لە بیوەک بوین. دوو سێ ژنی سەرەو یەکێکی زۆر گەنج بەسەر منداڵێکی ساوادا بەکوڵ دەگریان. منداڵەکە، تای بەرز، پەلوپۆی شکاندبوو. دەیانویست یەک دوو هێستر پەیدا بکەن و فریای دکتۆرێکی ناوشاری بخەن. منیش گوتم: ئێوە بەختتان هەیە: دکتۆر هەژار لەو ماڵەیە ئێستا بانگی دەکەین، ئەو دەتوانێت چارەسەری بۆ بدۆزێتەوە..

- یەکێک لە پیاوە بەتەمەنەکان گوتی: بۆ ئەمانیش دکتۆریان وا تیا؟

- جووتیارێک قومێکی لە دارجگەرەکەی دا و گوتی: بێ قەزا بیت ئەمانیش پیاوی ئاقڵیان وا تیا!".

ئەم ناوە هەر لەکۆنەوە ناوەندی ئاوەدانی بووە: بەرزنجەو کاژاو پێش هەشتسەد ساڵ دوو چرای رووناکی ئەم دەڤەرە بوون. ئەبولوەفای تاج ئەلعارفین لەتەمەنی ٨١ ساڵیدا (١١٠٧ز) کۆچی دوایی کردووە، کاژاوی بووە. عیساو موسای باوەگەورەی بەرزنجەییەکان پێش هەشت سەدەیەک بەرزنجەیان ئاوەدانترکردۆتەوە، قەڵای سرۆچک* بەلایەنی کەمەوە شەش

* مەئمون بەگی کوڕی بێگەبەگ لە بیرەوەریەکانیدا ساڵی (١٥٧٤ز) باسی میرو لیوای سرۆچکی کردووە. قەڵاکە قەڵایەکی زۆر سەختە، شوورەکانی بەرزو قایمن (٨) قولەی پاسەوانی هەیەو شوێنەواری نزیکەی (٦٠) ژوور دەبینرێت. قەڵاکە گۆڕستانێکی هەیەو کێلی (٦٠٠) گۆڕ بەرچاودەکەوێت و چاکی (دایە کوردە)و (باوەکوردە) لەقەڵاکەوە نزیکە. کێوی (بابل) لەقەڵاکەوە دوور نییە. ئەشکەوتی (رۆمی) لەبن شاخی سرۆچکەو سەرووی دێی قەویلەیە.

سەدە پێش ئێستا ناوەندی دەسەڵات بووە. گوندی قەویلە* و مۆریاس** زۆر کۆنن.

ژمارەیەک پێشمەرگەو کادر، لەترسی گرتنو راوەدونانی ماڵو منداڵیان،*** بۆ ماوەیەکی کاتی لەم دوو گوندە دوورەدەستەدا، جێگەی پەنابەریتیان پێدرابوو.. ئەم ماڵانە لە پەرخ بوون: کەمال شاکر، حەمەی حاجی تۆفیق، عومەری قالە گوڵباخو عەلی دەلێنی.

ئەم ماڵانەش لە بیوەک بوون: مەحمود گەرمیانيو حەمەی حاجی سابیر.

کەمال شاکر بۆی گێرامەوە:

"حەمەی حاجی سابیر، سەرەتای مانگی (کانونی دووەمی ١٩٨١) بۆ لام هاتو گوتی: دەبێ هەر ئێستا بۆ پەرخ بڕۆین. لەرێگا ئەو رازەی درکاند: کاک نەوشیروان لەگوندی

---

* قەویلە: پێشتر ناوی: سەربۆرە بووە. قەویلە ناوی عەشیرەتەکەیە، کە بەشێکیان لەوێ نیشتەجێ بوون. سەدوپەنجا ساڵ پێش ئێستا ناوی دێی (سەربۆرە) گۆڕدراوە. سەیرە ئەم دێیە (١١) گۆرستانی جیاجیای هەیە. دەبێ گۆرستانی ئەوانە بێت لەشەڕوشۆڕی قەڵای سرۆچک کوژرابن، یان قەویلە هەر لەکۆنەوە ئاوەدان بووە.

** مۆریاس: وشەیەکی یۆنانییەو ناوی شارێکی یۆنانی کۆنە و... دەبێ ناوی دێی مۆریاسی خۆشمان وەکو: ئاسۆس، ماکۆس، رانییە، مالیمۆس... لەزمانی یۆنانییەوە بۆ ئێمە جێمابێت..

*** هیچ وێنایەکی ژیانو گوزەرانی ئەو کادرانەم لەبەرچاو نەبوو لە کەمال شاکرم پرسی. ئەو گوتی: "دوکانێکی کۆنی چۆڵم دۆزیەوە. بەکوێنی دەرگاکەم گرت. بە بێژنگ خۆڵم بێژا، منداڵەکانم بۆ ماوەی شەش مانگ لەسەر ئەو گڵە دەنوستن. هەموو خەونەکەیان ئەوەبوو: شەوێک بەتانی بەخۆیاندا بدەنو خەونی زەردو سوور ببینن..".

دۆسـەیەرەیە. دەبـێ هەر ئێسـتا بـۆ ئەوێ بـڕۆین. نـابێ دەنگوباسی هاتنی ئەو کەس پێیبزانێت. ئەو ناوی لەخۆی ناوە (مستەفا ئەحمەد)و ئێمەش دەبێ هەر بەم ناوە بانگی بکەینو لێمان تێکنەچێت. ئەو رۆژە نزیکەی نیو مەتر بەفر کەوتبوو..".

فەرەیدون حەمەسالح پێنجوێنی، کوڕێکی ئازاو گورجوگۆڵ بوو، ئەوکاتە فەرماندەی (کەرتی ١-هەرێمی٣) بوو، وێڕای جەلال کولکنیو دە دوانزە پێشمەرگەیەک، لە بیوەک تووشی حەوت پێشمەرگەی حسیک دەبن، هەموویان چەک دەکەن. ئەم کردەوەیە، کە شـەوی (١٩٨١/١/٣) روویداوە، گریکوێرەی ناکۆکیو گرژییەکان پتر دەتەقێنێتەوە..

نەوشیروان ئەم دەنگوباسە دەبیستێت. لەبری ئەوەی خۆی لەناوچەکە دووربخاتەوە، یان سەردانی سالار عەزیز و مەلا بەختیار بکات، کە هێزێکی (٢٠٠) پێشمەرگەیی لەدەوروبەریان دەبێتو ئەو ئێوارەیە لە مۆریاس دەبن. ئەو سەعاتێک لەو هێزەوە دوور دەبێت. ئێوارەی ئەو رۆژە (١٩٨١/١/٤) لە میرمام دەمێنێتەوە، کە شوێنێکی زۆر سەختە. ژمارەیەک پێشمەرگەو کادر لەوێ کۆدەبنەوە (حەمەی حاجی سابیر، کەمال شاکر، کامەران عارف، شەهابە سوور، مامۆستا سەیفەدین هاواری، مامە عومەر، مامە حەمە..).

شەوێ لە میرمام دەمێننەوە، بەرچایی دەکەنو تا سەعات (٩)ی پێش نیوەڕۆ، لەبری ئەوەی زوو دەربچنو لەشوێنێکی قایم بمێننەوە، کات بەفیڕۆ دەدەن. کەسێک لە شاخی داربەڕوولە دەردەکەوێتو یەک فیشەک دەتەقێنێت. سێ چوار چەکداری تر قووت دەبنەوە. کامەرانو دوو پێشمەرگەی تر، بە شاخەکەدا هەڵدەگەڕێن، دەیانەوێت بزانن ئەوانە کێنو چییان دەوێت؟

گونـدی داربەڕووله دەکەوێـتە سـەر شـاخێکو ئەو شـاخە بەسـەر دێـی (میرمـام)دا دەڕوانێت. لە شـاخەکەوە چەکدارەکان، سـێ پێشـمەرگەکە دادەگـرنەوە. ئەمـان بەخەیـاڵی خۆیـان دەیانەوێت دڵنیابن چەکدارەکان حسیکن، یان هێزێکی ترن. ئەگەر حسـیکن ئەو پەیامەیـان پێڕابگەیەنن: ئەمـانە نایانەوێـت شـەڕی حسیک بکەن!

کامەران ناگاتە پەڕی ئاوایی، فیشـەکێک بەر سـەری ئەژنۆی دەکەوێـت. پێشـمەرگەکان کـامەران بەکـۆڵەوە دەگـرن، بـۆ نـاو گەورێـک دەیبەنو برینەکەی دەپێچنەوە. کـامەران بەهاوڕێکانی دەڵێت: "ئێوە من لێرە جێبهێڵنو بڕۆن. چەند دەقیقەیەکی تـر دێنە سەرمان".

پێشمەرگەکانی حسیک سـەر شـاخی دابەڕووله دەگرنو بەرە بەرە دادەگەڕێـن. کەمـال شـاکر بەهاوڕێکـای دەڵێت: "سـەرەوە هەمـووی گیـراوە، هێـزەکەی حسـیکیش زۆرە. ئێمە دەبـێ بـۆ ئەوبەر، بەری شاخی سرۆچک بڕۆین. فریای سرۆچک نەکەویـن هەموومان دەکوژرێین!".

پێشـمەرگەکانی یەکێتـی (نەوشـیروان، کەمـال شـاکر، حەمەی حاجی سابیر،...) بەدۆڵی (پیرئـازیز)دا بەرەو هەوراز هەڵدەکشێن. پێشـمەرگەکانی حسـیک بەردەم ئەشـکەوتی (چـل کـوژە) دەگـرن. پێشـمەرگەکانی یەکێتـی دادەگـرنەوە بە فیشـەک، نـاهێڵن بسـتێک بەرەو سـەرەوە بڕۆن. لە بن بەردێکی زلی نـاو دۆڵی پیرئـازیز گیردەخـۆن. حسـیک لەسـەرەوەوە بۆیـان دێـن. لە جەنـگەی ئاگربارانـدا، نەوشیروان بە کەمال شاکر دەڵێت:

"نامەیەک بۆ کاک تایەری عەلی والی دەنووسـم. تۆ هەوڵبدە نامەکە بگەیەنە ئەو. بەخوا ئەگەر ئەو دەزانێت من لێرەم سـەری

لووتی خۆی رەش دەکات. ئەو هەر زۆر هاوڕێمەو نازانێت من لێرەم..".

کەمال شاکر: "ئێمە لەبن ئەم گابەردەدا ناتوانین سەر دەربکەین. نامەی چی دەنووسیت؟ نامە نووسین ئێستا باش نییە!".

نەوشیروان: "بۆ؟".

کەمال شاکر: "لەبەر دە بۆ!".

نەوشیروان: "یەکێکیان بڵێ..".

کەمال شاکر: "١-ئێستا لەهەموولایەکەوە ئاگرباران و شەڕە. هەرکەسێک سەر بەرزبکاتەوە تەپڵی سەری بەئاسمانا دەچێت. ٢- فەرەیدون حەمەساڵح دوێنێ حەوتی لەوان چەک کردووەو ئەوان بەدوای تۆڵەدا دەگەڕێن. ٣- ئێمە کەمو ئەوان زۆر. ٤- ئەوان بەرزاییان گرتووە، ئێمە لەبەردەستی ئەواندایین.. تاد".

لەم کاتەدا فەرەیدون حەمەساڵح و جەلال کوڵکنی و کەرتەکەیان وەکو بەور خۆیان گەیاندە شاخی توێ (شاخی سرۆچک)و بەرزاییەکانیان گرت و بە بڕنەو دایانگرتنەوە. ئەوان نەبونایە ئەو رۆژە هەمووومان دەگیراین یان دەکوژراین.

### هاوڕێ کامەران

هاوڕێ کامەران ئەوکاتە تەمەنی (١٩) ساڵ بوو. پاش برینداربوونی بەماوەیەکی کورت، پێشمەرگەکانی حسێک دەیدۆزنەوە. یەکەم دەستەی ئەوان رەئوفی خەلیفە سەعید دەبێت. کامەران دەناسێتەوە. پرسیاری لێدەکات: "تۆ پێشمەرگەی سەرکردایەتیت لەم ناوچەیە چی دەکەیت؟ لەگەڵ کێدا بۆ ئێرە هاتووی؟".

کامەران دەڵێت: "من نامەی مەکتەبی سیاسیم بۆ کاک بەکر هێناوەو بەتەنیا هاتووم".

یەکێکی تر دەڵێت: "ئەمانە جەلالین، رۆژێک پیاوی ئیتلاعاتو رۆژێک پیاوی میتن‌و..".

کامەران دەڵێت: "ئێوە جاشن‌و جاسوسن‌و پیاوی ئیتلاعاتو ئێرانن..".

تایەری عەلی والی دەردەکەوێت‌و کامەران دەناسێتەوە:

"ئەمە کامەرانە. کوڕە شەهیدە. لەساڵی ١٩٧٧ هاتۆتە ریزی شۆڕشەوە، پێشمەرگەیەکی دڵسۆزە. کوڕێکی ئازا و بەجەرگە، حەیفە دوای ئەمانە کەوتووە..".

کامەران بەرپەرچی هەر هەموویان دەداتەوە. ئەوان دەڵێن: "ئەمە زۆر زمان درێژەو دەمی ئەمە بە ئێمە ناگیرێت".

سواری کەرێکی دەکەن‌و دەڵێن: "لەم ناوە مەبە! بۆ کوێ دەڕۆی بڕۆ!".

## نامەیەك هەموو هێلکەکان پیس دەکات

نەوشیروان لەبری ئەوەی شانبەشانی فەرەیدوونی حەمەساڵح بۆ لای هێزەکانی (ی.ن.ک) بڕواتە (مۆریاس)، لەوێوە نامەی ئاشتەوایی بۆ تایەری عەلی والی بنووسێت. بەرەو قەویلە بە چوار کەسەوە دەڕوات. میرمام بۆ قەویلە بە پێ نیو سەعات نابێت. ئایا ئەمە مەعقولە لەبەیانی تا ئێوارە لەشوێنێک شەڕ روویدابێت تۆ تەنیا (٢ کم) لەو شوێنە دووربکەویتەوە؟

ئەو لەبری ئەوەی بۆ ناو پێشمەرگەکان بچێت‌و داوایان لێبکات رەوانەی سەرەوەی بکەن، هەست بە مەترسییەکان ناکات، نازانێت بەپێی خۆی بۆ ناو تەپکەی حسیک مل دەنێت!

قەدیمان فەرموویانە: هەموو مەڵێک بە پێ پێوە دەبێت. مەلی ئاقڵ بە دەنووک پێوە دەبێت.

ئێوارە، رووودەکەنە ماڵی حاجی عەلی لە دێی قەویلە. ئەو لەبەرئەوەی سادەترین شارەزایی لە کاری عەسکەری نەبووە، نەیتوانیوە ئەو چرکەیە تێڕوانینێکی روونی بۆ بارودۆخی ناوچەکە هەبێت! لە بیرەوەریەکانیدا دانی بە هەندێ هەڵەدا ناوە. شەوێ نامەیەک بۆ تایەری عەلی والی دەنووسێت. داوا لە کەمال شاکر دەکات بەو شەوە نامەکە بۆ هۆزی خواجە* بەرێت. کەمال شاکر پێشنیارەکە بە راست دانانێت.

نەوشیروان دەڵێت: "منو کاک تایەر بەیەکەوە دابنیشین، دەتوانین گرژیو ئاڵۆزییەکان بەئاسانی چارەسەر بکەین!".

درەنگانێ کەمال شاکر بەو سەرماو سۆڵەو تاریکیە، نامە دە بەر باخەڵان دەنێتو رووودەکاتە ئەشکەوتان** و لەوێوە بۆ هۆزی خواجە. سەعات سێی شەوێ، لەنزیک هۆزی خواجە بە بۆسەی رەئوفی خەلیفە سەعیددا دەتەقێتەوە. لەدوورەوە خۆی پێیان دەناسێنێت. ئەو دەڵێت: "نامەیەکی گرنگم پێیە بۆ کاک تایەر!".

تایەری عەلی والی، حەمەی حاجی مەحمود، قادر جەباریو مام ئاراس، هەموویان لە دیوەخانی ماڵێک دەنوون. پێشمەرگەکان لەخەویان هەڵدەستێنن.

---

* من لە دە کەسم پرسیوەو بەتایبەتی خەڵکی هۆزی خواجە: هۆز خواجە راستە یان هۆزی خواجە؟ یەک وەڵامم دەستکەوتووەو ناوی ئەو دێیە هۆزی خواجەیە.

** دەوروبەری ئەم دێیە هەمووی ئەشکەوتە.

قادر جەباری، جوێنێکی زۆر بە مام جەلال دەداتو دەڵێت: "ئەم کابرایە! رۆژێک ساواکە، رۆژێک میتە، هەر رۆژە جاشی دەوڵەتێکە..".

کەمال شاکر دەڵێت: "شەڕ شەڕو ئاشتیش ئاشتی! من نامەم بۆ کاک تایەر هێناوە، بۆ شەڕ نەهاتووم. ئێوە ئەم جوێنانە بە من دەدەن، نەک بە مام جەلال. چونکە ئەو بەرامبەرتان دانەنیشتووەو من بۆ لای ئێوە هاتووم.. هەمووتان دەمناسن، نە لە شەڕ دەترسمو نە لە مردن! چوومە دەرەوە مننەتتان نەبێت، چیتان لەدەست دێت بیکەن!".

حەمەی حاجی مەحموود لە کەمال شاکر دەپرسێت: "کاک نەوشیروانیش لەمۆریاسە!"

کەمال شاکر لەوەڵامدانەوەدا بە (ئیتر!) خۆی دەدزێتەوە..

مام ئاراس دەڵێت: "من شەڕی جەلالی راناگرم!".

تایەری عەلی والی بەگ وەڵامی نامەکەی نەوشیروان دەنووسێتەوە. شەوەکی زوو کەمال شاکر ماڵئاوایی لە هۆزی خواجە دەکات. هەر بۆ شەڕەگومکێ، رێگای مۆریاس دەگرێتە بەر، بەرەو قەویلە ناچێت. پێشبینی ئەوە دەکات: پێشمەرگەو چاوەکانی حسک دوورونزیک چاودێری ئەو بکەن. لەنزیک چاکی (دایەکوردە)و (باوەکوردە) رانەمەڕێک دەبینێت، شوانەکەیان کوڕێکی مێردمناڵی حاجی عەلی قەویلە دەبێت. ئەو بە مناڵەکە دەڵێت: "دوو پێشمەرگە میوانی ئێوەن، یەکێکیان ناوی مستەفایە. ئەم نامەیە لەبەر باخەڵت قایم بکە و رادەستی مستەفای بکە. تا تۆ دەگەڕێیتەوە من شوانی مەڕەکانت دەبم..".

کەمال شاکر لە بەرزایی لای گۆڕستانەکەی قەڵای سرۆچک، چاکی (دایەکوردە)و (باوەکوردە) سەیری گەڕانەوەی شوانەکە دەکات. تا دەگاتە ناو ماڵی خۆیان..

سیروانی سەعە جووقلی،* یەکێکە لەو کەسانەی نەوشیروان لە بیرەوەریەکانیدا ناوی هێناون، کە دەوری لە گرتنی ئەودا هەبووە.** من سیروانم بینی‌و داوام لێکرد، باسی چۆنێتی گرتنی نەوشیروانم بۆ بکات، ئەو گوتی: "ئێمە لەگەڵ دەستەکەی مەحموود گەرمیانی تووشی شەڕو پێکدادان هاتین. ئەوان هەڵهاتن. ئێمە بە شاخی (سرۆچک)ەوە بوین، بەردەم ئەشکەوتی رۆمی! لەناو ماڵی حاجی عەلی، لەدوورەوە دوو سێ پێشمەرگەمان بینی. یەکسەر روومانکردە ماڵی حاجی عەلی. داوامان لە پێشمەرگەکان کرد بێنەدەرەوە، سەرەتا نەهاتنە دەرەوە. زانیمان ئەوان لە کادێنەکە خۆیان حەشارداوە! بەدەنگی بەرز هاوارمان لێکردن. ئەگەر نەیەنەدەرەوە، کادێنەکە دەسووتێنین. نەوشیروان هاتەدەرەوە. وتی: مەمانکوژن ئێمە خۆمان بەدەستەوە دەدەین. هەردوو دەستی بەرزکردەوە. دەمانچەیەکی (سمس)***ی پێبوو. ویستی دەمانچەکە لەپشتی بکاتەوە. ئێمە نەمانهێشت‌و گوتمان با پێت بێت. تۆ رێزی زۆرت

---

* ناوی تەواوی: سیروان حاجی مەحمود ئەحمەد ئیسماعیل ئەمینە. سەعە جووقلی باپیریەتی لەدایکەوە، کەچی بۆتە نازناوی هەمو بنەماڵەکەیان.

** نزیکەی (١٥) پێشمەرگە بەشداری دەکەن لە ئۆپەراسیۆنی گرتنی نەوشیروان: مام ئاراس، سیروانی سەعە جووقلی، عەلە قەڵەو، ئەمانە هەرسێکیان فەرماندەی کەرت بوون. نوری زەڕنگەرو سەرداری سەعە جووقلیش لەوێ بوون.

*** سمس Smith.

لامان هەیە. ئێمە لەگەڵ تۆ هیچ کێشەیەکمان نییە. فەرمووو با بۆ لای سەرکردەکان بڕۆین. سەرکردەکان لەناوخۆتاندا کێشەتان هەیەو ئێمە حەزدەکەین وەکو برا کێشەکانتان چارەسەر بکەن..."*

نەوشیروان، یەک هەڵە و دوو هەڵەی نەکردووە: زنجیرەیەک هەڵەی کوشندە، ئەوی گەیاندۆتە ناو کادێنی ماڵێک! تا ئەوکاتەی پێشمەرگەکانی حسیک بەردەم دەرگای کادێنەکەی لێدەگرن.

لەکاتی شەڕو شۆڕدا: پەلامارو پاشەکشە، براوەو دۆڕاو هەیە. نامەنووسینو دانیشتنو گفتوگۆ، جوگرافیاو کەشوهەوای جیاوازی پێویستە. لایەنی سێیەم دەبێ نێوەندگیری بکات. دەستەبەری سەلامەتی شاندی هەردوولا بە میکانیزمی تایبەت بکات. تۆ بە تاقی تەنیا، لەناو گەرمەی ئاگربارانـدا، داوای دانیشتن دەکەیت، لایەنی دووەم خوێندنەوەی خۆی بۆ سەرکردەیەکی تاقو تەنیا هەیە.

گریمان نەوشیروان ویستویەتی بارودۆخی ناوچەکە هێوربکاتەوە. دەبوایە سەرکردەو کادرە سیاسیو عەسکەرییەکانی ببینێتو کۆبونەوەیان لەگەڵدا بکات. شاندی هەردوولا لەشوێنێکی بێلایەن دابنیشن!

## رۆژژمێری پێشمەرگەیەک

من دەیان جار حیکایەتی گرتنەکەی نەوشیروانم لە پێشمەرگەکانی کۆمەڵەو حسکو خەڵکی تر بیستووە، محەمەدی حاجی مەحمودیش چەند لاپەڕەیەکی بەرگی یەکەمی کتێبی

---

* دانیشتنێک لەگەڵ سیروانی حاجی مەحمود ئەحمەد رۆژی (٢٠٢٠/١/٢).

(رۆژژمێری پێشمەرگەیەک)ی* بۆ ئەم رووداوە تەرخان کردووە. کردووە. چەند کۆپلەیەک وەکو خۆی دادەنێمەوە:

- "..من لە نامەکەمدا تەئکیدم کردبوو کە بیگرن نەک بیکوژن بۆیە برادەرانی ئێمە وتبویان وایانزانیبوو کاک نەوشیروان تا ئاخر فیشەک لە ژوورەکە شەڕ دەکات، ئاخر فیشەکیش خۆی پێ دەکوژێت..". ل٤٠٢

- "..کاک تاهیر وتی کاک نەوشیروان ئەو شەڕە بۆ دەکەن‌و بۆ رای ناگرن‌و بۆ وا دەکەن وتی کاک تاهیر من ئێستا سجنم دەسەڵاتم نییە، من بۆ شەڕ نەهاتووم بەناخێری گیانم بۆ لای دایکم هاتووم‌و ژن بهێنم ئێستە ئێوە بەرم بدەن وەعد بێت لەکوردستان دانەنیشم‌و دەچمە دەرەوە دڵی پڕ ببوو هەر ئەوە مابوو لەپرمەی گریان بدات‌و کاک تاهیر رەحمی جووڵابوو وتی با بەری بدەین گوناحە،...". ل٤٠٣

- ".. کاک نەوشیروان دەترسا لێمان بکوژرێت‌و ئێمەش ئەو بکوژین کاک نەوشیروان حەزی دەکرد هەموو هێزەکەی یەکێتی بکوژرێت بەڵام یەکێ لە ئێمە نەکوژرێت. کاک حەمەی حاجی سابیر وتی: هەی تەواومان کرد خۆ ئەوانە پاڵەوانەکانی یەکێتی بوون..". ل٤٠٧

## هەڵاتن یان بەرەڵلاکردن؟

راگەیاندنی یەکێتی، بەرەڵلاکردنی نەوشیروانی بە هەڵاتن‌و سجن شکاندن راگەیاند. ئەو رۆژە لە سەرانسەری

---

* محمد حاجی محمود: رۆژژمێری پێشمەرگەیەک. بەرگی یەکەم ١٩٧٦-١٩٨١، چاپخانەی بێسارانی- سلێمانی ١٩٩٩، ل(٤٠٠-٤١٠).

سەرکردایەتی‌و هەرێمەکان بووە شایی‌و تەقەی خۆشی‌و باسی ئەفسانەی هەڵاتن‌و زیندان بەزاندن. ئەوەی راستی بێت، ئەو بەئەمانەت لای کاوەی حەفید دانراوە. سەرکردایەتی حسێک نە ویستویانە بیکوژن‌و نە ویستویانە لەزینداندا بیهێڵنەوە. بڕیارەکەی تایەری عەلی والی‌و محەمەدی حاجی مەحمود راست بووە. بەڵام وردە لێپرسراوەکان قسەو هەڵسوکەوتیان منداڵانەو نابەرپرسیارانە بووە. لەئەنجامدا زیانی گەورەیان بەخۆیان‌و کولتوری سیاسی ئەم وڵاتە گەیاند.

بڵاوبوونەوەی دەنگوباسی گرتنی نەوشیروان و سوکایەتی پێکردنی، شەپۆلێک شپرزەیی و پشێوی و دڵەڕاوکێ و تووڕەیی لەناو ریزەکانی کۆمەڵەو یەکێتیدا دروستبوو، هەموو ئەندامێکی کۆمەڵە هەستی بە لووت شکاندن و کەرامەت ڕوشاندن دەکرد. زۆربەی سەرکردەو کادرو ئەندامان و پێشمەرگەکان، رووداوەکەیان پێناخۆش بوو، تاک و تەرا، بەشێوەیەکی جیاواز بیریان دەکردەوە.

بەدرێژایی ئەو ماوەیە، سالار عەزیز و مەلا بەختیار لە دەوروبەری مۆریاس و چۆمی گەلاڵ هێزێکی گەورەیان کۆکردبووەوە، بە بەردەوامی گوشاریان بۆ سەر هێزەکانی حسک دروست کردبوو، مەلا بەختیار بۆ یەکە بەیەکەیان نامەی هەڕەشەی رەوانە کردبوو: پەنجەیەکی نەوشیروان خوێنی لێبێت، ئەوە بەڕەگ و ریشەتاندا دەچینە خوارێ.

من لەبەردەم بارەگای پێشووی (مەکتەبی راگەیاندن) وەستابووم. دەیان کادری کۆمەڵە وەکو مێش هەنگ دەهاتن و دەچوون و سەریان بەیەکەوە نابوو. تووڕەبوون، نەفرەتیان لە دارو بەرد دەکرد: داوایان دەکرد دەستەوەستان دانەنیشین و جوڵانەوەیەک بکەین. دوو پێشمەرگەی گەرمیان بۆ لام هاتن و پلانیان دانابوو. یەکێک لە سەرکردەکانی حسک بە بارمتە بگرن. ئێمە بە بەردەوامی لە پەیوەندی بووین، هێزە سیاسیەکان، کەسایەتیەکان، گوشار بۆ سەر سەرکردایەتی حسک دروست بکەن و هەڵە نەکەن.

سەرەتای کانوونی دووهەمی (١٩٨١) بوو، فەرەیدوون عەبدولقادر دەرکەوت، گوتی: "با پیاسەیەک بکەین!" هەرچەندە

سەرەتای زستان بوو، ناو دۆڵی کپ و هەتاو، هەستت دەکرد سەرەتای بەهارە.

فەرەیدوون لەبەر خۆیەوە ئەم بڕگەیەی گۆرانیەکی دیلانی دووبارە دەکردەوە، "وتی پەژمووردەیە ئەم لالەزارە....".

لە دڵی خۆمدا گوتم: فەرەیدوون دەیەوێت لەسەر پێشهاتە سیاسیەکان بدوێت، یان دەیەوێت بەهرەی ئاوازو مۆسیقا بەگوێماندا بدات.

فەرەیدوون گوتی: "دەنگوباس چییەو لە کۆبونەوەی (م. س) چیتان کردووە؟" منیش گوتم: "پەیوەندیمان بە هەموو لایەنە سیاسییەکانەوە کردووەو هەرچیمان لەدەست بێت دەیکەین بۆ ئازادکردنی کاک نەوشیروان!".

پاش تۆزێک فەرەیدوون گووتی: "هیوادارم بەم زووانە ئازاد بکرێت و بۆ ناومان بەسەلامەتی بگەڕێتەوە..".

منیش گوتم: "هەرچی ئەندامی کۆمەڵە هەیە، لە ناخی دڵەوە ئەم ڕووداوەی پێ ناخۆشە هەست دەکەن هەموو کۆمەڵە زیندانی کراوە..".

فەرەیدوون گوتی: "ئێمە زۆر موبالەغە دەکەین و هیچ شتێک (حجم)ی خۆی پێنادرێت! ئەمە زۆر خراپە.. بڕوات هەبێت من کاک نەوشیروانم زۆر خۆشدەوێت پیاوێکە خەباتی کردووەو خۆی ماندوو کردووە، نووسەرە، خاوەن قەڵەمێکی دیارە.؟ بەڵام بۆ لە کۆنفرانس، یان کۆنگرەی کۆمەڵەدا لە هەڵبژاردندا، سەد لە سەدی دەنگەکان بۆ ئەو بچێت، یان ئەو نەوەد لەسەدی دەنگەکان وەدەستبهێنێت؟ با شەست لە سەدی دەنگەکان بۆ ئەو بێت! با حەفتا لەسەدی دەنگەکان بۆ ئەو بڕوات! بەڵام سەد لە سەدی دەنگەکان یان نەوەد لە سەدی دەنگەکان بۆ کەسێک بێت، دیاردەیەکی نادیموکراتی خراپە! ڕەنگە ڕۆژێک لە ڕۆژان خەڵک

له خۆی بپرسێت: ئایا سەرکردەکانی ترو ئەندامانی ناوەندی – کۆمەڵە، هیچیان نەکردووەو بۆخۆیان لە ماڵەوە دانیشتوون و هیچ سودێکیان بە کۆمەڵە نەگەیاندووە؟

هەق نییە ئێمە، کادرو ئەندامانی خۆمان بەم شێوەیە پەروەردە بکەین، هەر کەسێک چەند خەباتی کردووە، ئەوەندەی بدرێتی.. بۆ تەنیا یەک کەس ئەوەندە زل بکەین، ئەمە کانیتر لە هیچ کوێوە دیار نەبن؟

من پاش چەند هەفتەیەک چاوم بە ئازاد هەورامی کەوت: پاژێک لە بیرو بۆچوونی فەرەیدوونم بۆ گێڕایەوە، بە مەبەستی ئەوەی بزانێت بێزاری و هەستی لووتشکاندن و بریندار بوون چەند لەناو کادرو پێشمەرگەکاندا قووڵە. دەبێ چارەسەرێک بۆ کێشەکە بدۆزرێتەوە ئەو مەترسیە لە بەرچاو گیرا، کەسێک، بەبێ ئاگاداری سەرکردایەتی، کارێکی هەڵە بکات، پاشان بەکەس چارەسەر نەکرێت.

ئازاد گوتی: "کاک فەرەیدوون، هەرچەند بەڕاستەوخۆ ئەوە دەرنابڕێت، بەڵام گرێیەکی دەروونی قووڵی بەرامبەر نەوشیروان و کۆمیتەی هەرێمەکان هەیە! پاش شەهید شیهاب ئەو خۆی بە میراتگرو خاوەن هەق دەزانێت، گوایە: ئەم دەبوایە کەسایەتی ژمارە یەکی ناو کۆمەڵە بوایە! ئیدی ئێستا ئەو لە دڵی خۆیەوە کەس بە هاوشانی خۆی نازانێت و لە ناخەوە نە نەوشیروان و نە ئێمەو نە کەس بەشایانی سەرکردایەتی کۆمەڵە نازانێت، چاوەڕوانی هەل دەکات، کەسێک تۆزێک باری لار بێت. لای ئەو کات لە ١ی/ ئەیلولی ١٩٧٥ * لە جێگەی خۆی وەستاوەو یەک چرکەش پاش و پێش ناکات.

---

* رۆژی ١/ی ئەیلولی ١٩٧٥ ئەو رۆژەیە ئەنوەر زۆراب دەستگیر کراو سەرکردایەتی ئەوکاتەی کۆمەڵە، پاش هەفتەیەک بەرەو ئێران رۆیشتن.

ژمارەیەک سەرکردەو کادری پێشکەوتووی کۆمەڵە، دوو کۆبوونەوەی دووروودرێژیان لە (زەڵێ) کرد. ئاراستەی کۆبونەوەکە لە پڕ لە بابەتی ڕۆژەوە بۆ بابەتێکی ستراتیژی گەشەی کرد، زۆرینەی ڕەها لایەنگری گۆڕانکاری بوون: شێوەو ناوەڕۆکی کۆمەڵە، بەرنامەو جیهانبینی وەکو خۆی نەمێنێتەوە...

لە کۆبوونەوەکاندا، بەچڕی فۆکوس لەسەر مەسەلەی (سەربەخۆیی) و جیابوونەوەی کۆمەڵە بوو. کۆمەڵە وەکو خۆی، بەبێ گۆڕانکاری و دەستکاری لە ناو چوارچێوەی (ی.ن.ک) بمێنێتەوە، یان رایەڵ و پەیوەندی و جیهانبینی و تێڕوانینی کۆمەڵە جیاواز بێت؟ کۆمەڵە لەناو یەکێتیدا بمێنێتەوە پتر گەشە دەکات، یان شێوەو ناوەڕۆکی پەیوەندییەکان دەبێ بگۆڕدرێت؟

ئاراستەی گشتی ناو کۆبونەوەکە لە قازانجی مانەوە لەناو چوار دیواری یەکێتیدا نەبوو، زۆرایەتی پێداگرییان لەسەر ئەوە دەکرد، بە زووترین کات بڕیاری جیابوونەوەو ماڵئاوایی لەگەڵ یەکێتیدا بدرێت. بیروڕای مامناوەندو سازشکاری و بڕیار دواخستن، بە توندی دژایەتی دەکرا. سەیر ئەوەیە لە کۆی (٥٧) کادری پێشکەوتوو، تەنیا سێ کادر بۆ مانەوەی کۆمەڵە، وەکو جاران، لەناو یەکێتیدا، بە بێ دەستکاری، دەستیان بەرزکردەوە، بۆ ئاراستەو پرۆژەی (سەربەخۆیی تەواو) و (جیابونەوە)ی دەستبەجێ (٥٣) کادری پێشکەوتوو دەنگیان دا! لە نێوان ئەم دوو بلۆکەدا من هەڵوێست و تێگەیشتنم جیاوازبوو. من لەگەڵ هیچ لایەکدا نەبووم، پاشتر زۆربەی کادرەکان بیروڕای منیان پێ باشتر بوو.

ئەوەی ڕاستی بێت، هەستم کرد، کاسەکە بێ ژێر کاسە نییە، ئەمە ڕێکەوت نییە! لە ئەنجامی کۆبونەوە و لێکدانەوەو بیروڕای

کتوپڕ، ئەم هەموو دەستە بۆ جیابوونەوە بەرز ناکرێتەوە. ئەو چرکەیە، گیانی بەرپرسیارێتی سیاسی و ئەخلاقی هانیدام، بەرامبەر مەترسیە زۆرەکان، ئەگەرە بینراوو نەبینراوەکانی جیابوونەوە، کە نە ئامادەکاری بۆ کرابوو، نە هیچ زەمینەیەکی سیاسی و فیکری بۆ خۆشکرابوو، نە دامەزراوەی تایبەتی دارایی و عەسکەریی و ڕێکخراوەیی هەبوو، هەر یەکسەر جیابوونەوە! هەروا بە بڕیارێکی سەرپێی (جیابوونەوە)ی کۆمەڵە ڕابگەیەنرێت. ئەم بۆچوونەم بە کرچ و کاڵ و باش شەن و کەو نەکراو، پڕ مەترسی، هاتە بەرچاو. دەمزانی تەقینەوەی دووبەرەکی و شەڕی براکوژی، بەدرێژایی مێژوو چەند زیانی گەیاندووە، ئەم هەنگاوەش ئەوەندە کاردانەوەو زەبروزەنگی لێدەکەوێتەوە.

من بە بەڵگەی مەنتیقی و تۆکمە، بنەمای سەر لە بەری پەڵپ و بیانووی جیابوونەوەی خێراو پەلە پەل هەڵوەشاندنەوە، پڕۆژەکەم بە هەڵەیەکی کوشندە دانا. ئەمەش پاژێکە لە بەڵگەکان:

أ-ئەم کۆبوونەوەیە، دانیشتنێکی کتوپڕو نائاساییە بۆ لێکتێگەیشتن و بیروڕاگۆڕینەوەو زانیاری ئاڵوگۆڕکردن کراوە. ئەم کۆبونەوەیە، نە کۆنگرەیە، نە پلینۆمە، نە جێگای کۆنگرەو پلینۆم دەگرێتەوە، چونکە کۆنگرەو کۆنفرانس دەسەڵاتی بڕیاری چارەنووسسازی هەیە. بەگوێرەی کام پەیڕەوی ناوخۆ ئەم دانیشتنەی ئێمە دەتوانێت ئەم جۆرە بڕیارە بدات؟

ب-ئێمە پاژێکی کەمین لە سەرکردەو کادرە پێشکەوتووەکانی کۆمەڵە. کەواتە: ئێمە ناتوانین ئەو مافە بەخۆمان بدەین، کە نوێنەرایەتی هەموو کۆمەڵە دەکەین و شەرعیەتی ئەوەمان نییە،

بەناوی کۆمەڵەوە بڕیار بدەین. هەر لەم کۆبونەوەیەدا چەندین ئەندامی ناوەندی و سەرکردایەتی ئامادە نین وەکو (نەوشیروان، سالار عەزیز، ئازاد هەورامی، مەلا بەختیار..تاد) دڵنیابن ئەوان لێرە بوونایە، بۆچوون و سەرنج و تێبینی خۆیان دەبوو. ناکرێت لە پشت هەموو ئەو سەرکردەو کادرانەی لێرە نین، ئەمجۆرە بڕیارە بدەین!

پ-بڕیاری جیابوونەوە لە یەکێتی، ناتوانێت هەر یەکسەرو بەهەڵپە هەڵپ و پەلە پەل بدرێت. دەبێ پێشەکی لێکۆڵینەوەی قووڵ و فراوانی بۆ بکرێت و زەمینەی بۆخۆش بکرێت. ئەو بڕیارەش دەبێ لەناو کۆنگرەدا بدرێت، نەک لە دەرەوەی دیوارەکانی کۆنگرە. ئەندامانی کۆنگرە بە زۆرایەتی پەسەندی بکەن.

لەناو گەلە گورگ وا باوە، ئەگەر گورگێک یەک دڵۆپە خوێنی پێوە بێت، هەموو گورگەکانی تر، دەکەونە گیانی، لە دە لاوە پەلاماری دەدەن و لەت و پەتی دەکەن. من چاوەڕوانی خەڵات و بەرات و پێزانین نەبووم. هەستی بەرپرسیارێتی پاڵیپێوەنام، بە چوار رستە، بورکانی تووڕەیی بەشداربووانی کۆبونەوەی زەڵێ دابمرکێنمەوە: بڕیاری جیابوونەوە نەدەن و هەرچییان هەیە بۆ کۆنگرە هەڵیبگرن. هەندێک لە سەرکردەکان، لە بری ئەوەی رێز لە بۆچوون و هەڵوێستی خۆیان بگرن، لەماوەی بیست و چوار سەعاتدا، بەدیوەکەی تردا بایان دایەوە.

پێشینان چاکیان فەرمووە: کورد بە بادانەوە ماوە. کەواسوورانی بەر لەشکری سەربەخۆیی و جیابوونەوە، خۆیان لە ئاوی زەمزەمی پەشیمانی هەڵکێشاو شوێنەواری رەخنەو تەپ و تۆزی نارەزاییان پێوە نەما.

زۆر كەس، كە بەناو سەركردەی كوردن، ئەوەندەی حەزیان لە درۆو دەلەسەو قسەی بێسەرو بەربوو، نیو ئەوەندەش حەزیان لە بیستنی راستی نەبوو، "بۆیە وەزعمان تا ئەمڕۆش ئەوەندە جوانە"، بە چوار قسەی ساف و لووس و بەڵێنی دەستە مۆبوون، بڕوانامەی ئەستۆپاكیان پێبەخشرا.

كادرەكانی كۆبونەوەی زەڵێ لەبری ئەوەی پەشیمان ببنەوە، پاشەكشە بكەن، دەبوایە بەیەكگرتووی بمێننەوە: ئەم پرسیارانەیان لە نەوشیروان بكردایە:

١-رۆیشتنت بە دوو (پ.م) بۆ شارەزوور هەڵە نەبوو؟

٢-لە گوندێك دانیشتوویت و نامە بۆ تایەری عەلی والی دەنووسیت، مانای ئەوە نییە: وەرن بمگرن؟

٣-بۆ بە دوو (پ.م)ەوە دەسووڕێیتەوە و ناچی بۆ ناو هێزەكانی یەكێتی؟

٤-لە دەوروبەری (قەویلە) تەقە بووە، دەبوایە خۆت لە شوێنێك بشاریتەوە یان زوو لە گوندەكە دەربچیت؟

٥-لای حسك بۆ هەڵوێستی جوامێرانەو بەهێزت نەنواند؟

لەماوەی بیست و چوار سەعاتدا، رەش بووە سپی و، سپیش رەش كرا، تا خاوەن ماڵ دزی گرت، دز خاوەن ماڵی گرت. دوو جەمسەری دژو ناكۆك، دوو لای بەحیساب تا دوێنێ، لەسەر هەڵوێستی سیاسی، شیرو تیریان لەیەك دەسوو. دەستیان خستە ناو دەستی یەكتری، هەر دوولا بەم تەكتیكە وەكو بەرزەكی بانان بۆی دەرچوون. كاسەكەش بەسەر خەڵكی تردا شكایەوە. هەڵوەشاندنەوەی كۆمەڵە گرنگ نەبوو. بیروباوەڕیش لای ئەوان خرایە بن پێوە.

من بە ڕاشكاوانە دژی هەڵوەشاندنەوەی كۆمەڵە بووم. بەڵام جیابوونەوەی كت و پڕم لە یەكێتی بەسەرەڕۆیی ژمارد.

سەرکردە "ئۆپۆزسیۆنەکان" قەناعەتیان بەخۆیان کردبوو: "بۆچوونەکانی مامۆستا جەعفەر پڕ مەترسین" ئەم دەیەوێت لەناو کۆنگرەدا، لەسەر مەسەلەی (سەربەخۆیی) و (جیابوونەوە)ی کۆمەڵە بڕیار بدرێت! پێشنیازی کردووە لێکۆڵینەوەی قووڵ لەسەر مەسەلەی جیابوونەوەو سەربەخۆیی بکرێت کەواتە: ئەم پیاوە زۆر دوور دەڕوانێت و بیری زۆر وردو مەترسیدارە. ئەمەکانی تر، داوای جیابوونەوەی (فەوری)یان کردووە، ئەمە هیچ نییە، کەفوکوڵ و نیشانەی تووڕەیی و هەڵچوونەو زوو دادەمرکێتەوەو هیچ تر.

سالار عەزیز لەکاتی بەستنی کۆبونەوەکاندا لە شارەزوور بوو. هاتیشەوە بەستنی کۆبوونەوەکانی پێناخۆش بوو. ئەو لەو کاتەدا وەکو نوێنەری (م. س) و یەکێتی و مام جەلال دەدواو هیچ هەڵوێستی هاوبەشمان نەبوو. کەچی بە هەلیانزانی ئەویشیان تێوەگلاند. مەلا بەختیار گوشاری نەخستایەتە سەر حسک، هەر زۆر بە ئاسانی لەناویان دەبرد. ئەویش بەر نەفرەت کەوت: گوایە: بۆیە بە بەردەوامی گوشاری خستۆتە سەر حسک بۆ ئەوەی نەوشیروان لە پەناوە لەناو بەرن. ئەمەیە چاکەیش بکەیت هەر بەخراپە دادەنرێت..

زۆرینەی رەها لەسەر بابەتی ئەوەی کۆمەڵە وەکو خۆی لە چوارچێوەی (ی.ن.ک) بمێنێتەوە، یان یەکسەر سەربەخۆیی راگەینێت؟

من نۆ ساڵ لەمەوپێش، بەکورتی لەسەر کۆبونەوەی (زەڵێ) چەند دێرێکم نووسیوە ئێستا بەپێویستی نازانم سەرلەنوێ لەسەر هەمان خاڵ بنووسمەوە!

هەڵاتنی نەوشیروان بە یارمەتی هاوڕێ سامان زۆراب هەورامی و هاندان و چاوپۆشی (شێخ کاوەی حەفید) لە (گرتووخانە)ی سووریێنی حزبی سۆیالیست، خەرمانەیەک فروسمانی دروستکردو کۆمەڵەش هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا. شەپۆلێک لە سەربەزری و گەڕانەوەی کەرامەت بۆ ناو رۆحی ئەندامانی کۆمەڵە بە گشتی گەڕایەوە، پاش رۆژانی لێو بە باربوون و لووت لەئەرزخشاندن. ئیدی ئەو لەچاو خەڵکی سادە بووە ئەو کەسەی زیندانی (باستیل)* ی شکاندووەو هەڵاتووە و دەرباز بووەو لووتی حسکی شکاندووە!

هەرچی پێشتر شمشێری هەڵکێشابوو، بە چەپ و راستدا رەخنەی دەگرت، لە هۆکاری سەفەری دوور، بۆ سنووری شارەزوور. مانەوە بە دوو پێشمەرگەوە لە گوندی (قەویلە) بە ئەو پەڕی بێباکی، تا دەرکەوتنی مەفرەزەیەکی حسک لەبەردەم دەرگای ئەو ژوورەی لەوێ میوان بوون..تاد.

ژمارەیەک بەناو (سەرکردە) و (کادری پێشکەوتوو)، کە لە راستیدا دەروون بەتاڵ و موفلیسی سیاسی بوون، پێشتر هەزار هەزار ملیان دەپەڕاندو شاخ و کێویان تەخت دەکردو ئاڵا هەڵگری جیابوونەوەو سەربەخۆیی کۆمەڵە بوون، لەماوەی

---

* هەر کەسێک کتێبەکەی نەوشیروان بخوێنێتەوە، راستی لا ڕوون دەبێتەوە، کە هەلومەرجی زیندانەکە بەو شێوەیە نەبووەو ئەوان بەتەمای ئەوە بوون بەرەڵلای بکەن، بەڵام یەک دوو لێپرسراوی ناوچەکە (بەرەی حسک) ویستویانە هەندێ دەستکەوتیان دەست بکەوێت. نەوشیروان مستەفا ئەمین، پەنجەکان یەکتر ئەشکێنن، بەرلین ١٩٨٧، ل ١٨١ بەدواوە. هەروەها بڕوانە: محەمەدی حاجی مەحمود: رۆژژمێری پێشمەرگەیەک.

چەند سەعاتێكدا بوونە ئاردی ناو درك. پاكانە پێشكەشكراو هەر یەكسەریش ئامادەبوون بە ١٨٠ پلە ئاراستەی (هێرش) و (پەلامار) بگۆڕن!

## پێش كۆنفرانس

یەكەمین كۆنفرانسی كۆمەڵە، كە لەسۆنگەی پێشنیازێكی بەندەوە ناوی (كۆنفرانسی مالیمۆس)ی لێنرا. فرەی بەسەر كۆنفرانس و كۆنگرەوە نەبوو!.

سەرانی باڵی راستڕەو و (ئۆپۆرتۆنیست) دژی ئەو باڵەی دەیانویست كۆمەڵە بە (سەربەخۆیی) بمێنێتەوە، بەناوی كۆمەڵەوە، كودەتایەكی رەش، ئەنجامدرا. لەم رۆژەوە ئیدی خەونی نەزۆكی دەستەوتاقمێكی شكستخواردووی بێهەڵوێست و بێبیروباوەڕ، كە خۆیان پێشتر خزاندبووە ریزەكانی كۆمەڵەوە، تاڕادەیەك بەدیهات. هەرچی دووپشك و كولەوەیبابی جیهانی سیاسەت بوو، خۆیان لەو خەڵكە داماوە كردە پەپوولە.

بەناوی گەشەپێدانی كۆمەڵەو پتەوكردنی ریزەكانی كۆمەڵەو شۆڕش بەرەو پێشەوە بردن، مێخێكیتریان لەتابووتی كۆمەڵەدا. دروشمی سەرەكی كۆنفرانس (بەرەو پتەوكردنی ریزەكانی كۆمەڵەو راپەڕاندنی جەماوەری گەلەكەمان) بەڕێوەچوو. بەپێچەوانەوە ریزەكانی كۆمەڵە لەم كۆنفرانسەوە وا تێكدرا، كۆمەڵە بەسەر دووبەرەدا دابەش بوو. دروشم و ناوی كۆنفرانس بۆ پڕۆژەی هەڵتەكاندن و ژێرو ژووركردنی كۆمەڵە بەكارهێنرا. ئەم خڕكردنەوەیە لەماوەیەكی كورتدا ئەنجام درا. ئەگینا نەكات بۆ داڕشتنی ستراتیج و نە بۆ پلانی بەرەو پێشەوەبردنی كۆمەڵە دانرا بوو. ئامادەكاری تەنیا بۆ ملشكاندن و

یەکتری هاڕین و لێدانی باڵی (کۆمیتەی هەرێمەکان) کرابوو. ئەمەش پێویستی بەوروژاندن و پشێوی و ئاژاوە هەبوو. زمانی (گۆبلز)ەکان* لەیەک چرکەدا کرایەوە.

ئەوان، لە پشت دیوارەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵەوە، ئەرکێکی نا پیرۆزیان پێسپێردرابوو: هەنگاوێکیتر بۆ هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە دەبێ بنرێت. هەر بەڕاستیش وەکو بینیمان وا دەرچوو: ڕۆحی کۆمەڵە کێشراو پاشان بە بێدەنگی نێژرا. لەو ڕۆژەوە تێکۆشانی (٢٠) ساڵەی ڕێکخراوێک لەسەر ڕەفە تۆزلێنیشتووەکانی ی.ن.ک سەرەو نخوون دانرا.

پڕۆژەی هەوڵی لەناوبردنی کۆمەڵە، ڕۆژی ١٩٧٧/٧/٢٠ خرایەگەڕ.

بەردەوام داوا دەکرا، پلانی تۆکمەو گشتگیر بۆ شێواندن و بچووککردنەوەو لەناوبردنی کۆمەڵە دابنرێت. تا شاسوار جەلال (ئارام) مابوو، هەر زۆر حەکیمانەو بەئاسپایی ڕووبەڕوو بوونەوەو ململانێی سەخت دەکرا. پاش ١٩٧٨/١/٣١ سەنگەری لەناوبردنی کۆمەڵە بۆ ناو دڵی ئەم ڕێکخراوە گوازرایەوە.

ڕەنگە پرسیارێک بێتە پێشەوە: ئایا شاسوار جەلال (ئارام) و هاوڕێکانی پاژێک بوون لە (ئەسپی تەروادە) و ڕۆشنبیرو سیاسیە دڵسۆزەکان دوای کلکی ئەسپە بۆر کەوتبوون؟

دەبێ ڕاشکاوانە ئەو ڕاستییە بنووسم: لەناو ئەو گروپانەو لەدەرەوەی ئەو گروپانەدا ئاڕاستەی جیاجیاو ناکۆک هەبوون: خەونێک هەبووە. کەسانێکیش هەبوون، زیرەکانە کاریان

---

* یۆزیف گۆبلز: (1897-1945 Joseph Goebbels) وەزیری پڕۆپاگەندەی هیتلەر (نازیەکان) بوو. یەکێک لە قسەکانی ئەوەیە: درۆبکە، درۆبکە، تا باوەڕ بەدرۆکانت دەکەن.

کردووە، جۆگای ئاوەکەیان بۆ سەر (ئاش)ی لەکارکەوتووی خۆیان گواستۆتەوە!

ئاش لەخەیاڵێک و ئاشەوان لەخەیاڵێک. ئەو گروپانەی کۆمەڵەیان دامەزراند، لەسەر بەرنامەو هێڵێکی فیکری روون رێکنەکەوتبوون.

هەریەکە قسەی ناو دڵی خۆی بۆ ئەوەکانیتر نەدرکاندبوو: ئەو شەش سەرکردەیە، کەسیان ئاگای لەچۆلەکەی بەر باخەڵی ئەوەکانیتر نەبووە. گروپی سەرەکی لەناو تەنگژەیەکی سیاسی و شەخسی زۆر قووڵدا بوون: دامەزراندنی کۆمەڵە بە (ئەسپی تەروادە)* تێگەیشتبوون. دەیانەویست لەمبەر بۆ ئەوبەر بپەڕنەوەو هیچ ئامرازێکیان بەدەستەوە نەبوو: رێکخراوێک لەچرکەی دروستبووندا، گفتوگۆی لەسەر دەکراو ئامادەکاری بۆ دەکرا. ئەمە ئەو چڵە پووشە بوو، دەستیان پێوە گرت..

ئەوان نوێنەری ئەزموونێکی سیاسی، بێئەنجام، شکستخواردووی بێسەروبەر بوون. ئامانجی سەرەکی ئەوان ئەوە بوو: دەرگای قەڵای (ترۆیا)یان جارێکی دی بۆ بخرێتە

---

* ترۆیا: Troy تەروادە: Troade :Troya ناوی شوێنەواری شارێکی یۆنانی کۆنە. (ئەسپی تەروادە) چەمکێکی سیاسی باوە: ( Trojan Horse Story) شوێنەواری ئەم شارە کۆنە دەکەوێتە باشووری تەنگژەی دەردەنیلەوە (تورکیا) بەگوێرەی گێڕانەوەی (هۆمیرۆس) لەداستانی (ئۆدیسێ) سوپای یۆنانی بۆماوەی دە ساڵ ئەم قەڵایەی گەمارۆداوەو بۆیان داگیر نەکراوە. ئەسپێکی دارینی گەورە دروستکراوە. ژمارەیەک سەربازی مەشقپێکراو، لەناو ئەسپە دارینەکە خۆیان دەشارنەوە. دەرگای قەڵاکەیان بەبێ شەڕو شۆڕ بۆ دەخرێتە سەر پشت.

سەرپشت. گەڕێکی تری خۆکۆکردنەوەو دووبارەکردنەوەی ئەزمونێکی ژێرکەوتوو تاقیکەنەوە*..

دیارە مەبەستی بنچینەیی ئەمانە پێکهێنانی حزبێکی شۆڕشگێڕو پۆڵایین و نوێ نەبووە: بڕوایان بەتیۆریی مارکسی نەبووە. رقیان لەبیروباوەڕی چەپ، دیموکراسی و ئازایخواز بووە. ئەوانە هەر بیریان لای دووبارەکردنەوەی ئەزموونی پێشوویان بووەو هیچی تر. بەجلوبەرگی کۆنەوە، نەیاندەتوانی، یەک بست لەدەرگای "قەلا" کە نزیک بکەونەوە. ناچاربوون، بەدیوجامەو لەناو (ئەسپی تەروادە)دا خۆیان وەشێرن.

ئەم هاوکێشەیە تا ساڵی ١٩٨١ درێژەی کێشا. ساڵانی (٧٩-١٩٨١) ئەوان چوار کەسیان بەپاسەوانی سەر سەختی قەڵای کۆمەڵە دەزانی: (سالار عەزیز، ئازاد هەورامی، مەلا بەختیار، مامۆستا جەعفەر)، بۆیە رۆژانی پێش کۆنفرانس، دەنووکی شۆڕەسوارانی (کودەتا نهێنییە)کەی ئەوان لەسەر ئەم چوارە بوو. ئەوان ئەم چوارەیان بەمەترسیدار بۆ چارەنووسی کۆمەڵە دادەنا. پاش هەشت نۆ ساڵ، ئیدی پرسیاری هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە، بەخشکەیی خرایە سەر باس و خواس، زانرا، کۆنفرانسەکانی کۆمەڵە بۆ پرۆژەی لەناوبردنی بووە، نەک بوژاندنەوەو پەرەپێدان و یەکڕیزی..

---

* مام جەلال ئەندامی (م.س)ی پارتی بوو. لەکاتی دەنگدان بۆ هەڵوەشاندنەوەی باڵی (م.س) کە ناویان لێنابوو (پارتی شۆڕشگێرانی کوردستان) ئەو بەتوندی دژی هەڵوەشاندنەوەی ئەم "رێکخراوە!" بوو. هەڵوێستی ئەو، شایەنی لێکۆڵینەوە و وردبوونەوەو نامەو کاری زانستی بێ لایەنە!.

مەخابن زۆربەی سەردەستەی بیرەوەرینووسان، لەبن پەچەو تارای شەرمەوە، بەلەنجەولار، لاونیو لەسەر رووداوەکانیان نووسیوە! ئەوان خۆیان لەوێ بوون. بەچاوی خۆیان شانۆگەریی "مشت و مڕ" و "چەقبەردۆکێ" و "چەلەحانێی سەر تەنوور" ی ناو کۆنفرانسیان بینیوە. زانیاری وردو درشتیان لەسەر تان و پۆی زنجیرە درامای پیلانگێڕی پشت دەوەنەکان هەبووە.

خۆشیان تاڕادەیەک بەر نەفرەتی کودەتاچیان کەوتبوون. کەرکەدەن و مالۆسی تەکەتولات، هەڵیاندەتیزاند، شفرە تیژەکانیان بەبندەست ئەمانیشدا دەکرد، بۆشیان بلوایە بەرۆژی نیوەڕۆ دەیانپلیشاندنەوە. نازانم شەش و پێنج و سەر لێئاڵۆزکانەی ئەمان دەردی پیری و بەساڵاچوونە، یان (لغایة في نفس یعقوب قضاها) سەری لێشێواندوون و وایلێکردوون، راستی بەژێر لێوەوە بکەن؟

دیارە فێڵ لەمێژووکردن ئاسان نییە: رەش و سپی، درەنگ بێت یان زوو لەبەردەم حوکمی مێژوودا ئاشکرا دەبێت.

ئەمانە نووسیویانە، گوایە: ناکۆکی و ململانێی پێش کۆنفرانس و ناو کۆنفرانس بنەمای سیاسی و جیاوازی فیکری نەبووە. کێشەکان کێشەی شەخسی بوون و هەوڵدراوە بەرگی ئایدیۆلۆژی و فیکریان تێبگرن. ئەم لێکدانەوەیە زۆر لە راستییەوە دوورە. ساڵانی پاش (٢٠٠٤) چەندین جار نەوشیروان مستەفام بینیوەو باسی زۆربانبازی و ململانێی ناو سەرکردایەتی یەکێتی کردووە:

"کێشەی ئێستای ناو سەرکردایەتی ی.ن.ک لەسەر پارەو دەسەڵات و پشک پچڕاندنە. جاران کێشەکان لەسەر فکر بوون،

لەسەر هەڵوێستی سیاسی و بیروباوەڕ بوون. ئەم شەڕو شۆڕو ململانێیەی ئێستا هەمووی لەسەر دەسکەوت و دەسەلاتە.. تاد."

راستە جاران نەوشیروان مستەفاو شوێنکەوتووانی کێشە ئایدیۆلۆژی و رێکخراوەیی و سیاسییەکانیان دەخستە قاڵبی شەخسییەوە. راستییەکان رێک پێچەوانە بوون.

جگە لە نەوشیروان، خەڵکیتریش جەختیان لەسەر ئەوە کردووە، کە باڵی (کۆمیتەی هەرێمەکان) لەڕووی سیاسی و بیروباوەڕەوە زۆر جیاواز بوون. ئەوان بالاترین پلەو پۆستی یەکێتی و کۆمەڵەیان بەدەستەوە بوو، لەبەر ئەوەی بیروباوەڕی ئەوان لەگەڵ هەڵوێست و شێوەی چالاکی یەکێتی نەدەگونجا، هەمویان دەستبەرداری کارو پلەی حزبی خۆیان بوون. سەیر ئەوەیە: کەسانێک هاوسەنگەری (کۆمیتەی هەرێمەکان) بوون و لەماوەی چل ساڵی رابورروودا گۆڕان بەسەر جیهانبینی و تێڕوانی ئەواندا هاتووە، ئەمە لای من زۆر ئاساییە. دەستکاری رووداوەکانی دوێنێ بەتەرازووی تێگەیشتنی ئەمڕۆ، ئەوە مێژوو شێواندنە لەپێناوی "چاکە"یەک، کە بەناڕەوا کراوە..

من لەوانە دەپرسم: گوتاری (دژی ئۆپۆتۆنیزم) هەڵوێستی سیاسی بوو، یان کێشەی نێوان دوو سێ کەس؟ باشە بۆ ئەم گوتارە بەم شێوەیە دەنگی دایەوە، کە ماوەی هەشتا سەعاتی کۆنفرانس (٦٠) سەعاتی بۆ ئەم بابەتە تەرخان کرا؟ نازانم کێشەی سیاسی و کێشەی (شەخسی) بەچی تێگەیشتوون؟

هەر بۆ ئەوەی روونــاکبیرانی ئەم گەلە راستییەکان باشتر لەبەرچاوی خۆیان وێنا بکەن، هەندێک لایەنی تری رووداوەکانی پێش کۆنفرانس دەخەمە بەرچاو:

## شێوەی کاری ئەوان

کودەتاچییەکان وەکو شارە زەردەواڵە دەسووڕانەوە، درۆیان هەڵدەبەست و پڕۆپاگەندەی ژەهراویان بڵاودەکردەوە. لەچەندین شوێن، بەرێکوپێکی کۆڕیان دەبەست و قسەیان بۆ کادرەکان دەکرد*. هەر ئەوانیش ئەندامی کۆنفرانسیان دیاری دەکرد، بەم شێوەیەش دەرچوونی چوار کاندیدی خۆیان دەستەبەر کرد.

ئەو سەرکردەو کادرانەی لەناو باڵی (م.س) تەمەنێکیان بەسەربردبوو، لەهونەری دەستەگەری و تەکەتول و پاشقولگرتن و شەرم نەکردن لەبادانەوەو قسە هەڵبەستن، لەچاو نوێنەرانی (کۆمیتەی هەرێمەکان) دا کارامەترو بەرچاوو روونترو دەستوەشێنتر بوون.

---

* "..دوو رۆژ پێش کۆنفرانس، نەوشیروان جوابی بۆ ناردم پێویستی بەخۆونکردنێک هەبوو، کە دێتە لای ئێمە و هات لەژوورێکدا، کە جگە لەیەک پێشمەرگە دەیزانی خواردن و چای بۆ دەبرد، کەس نەیزانی کە لای ئێمەیە. ئەو دوو رۆژە خەریکی نوسینەوەی راپۆرتێک بوو، بۆ کۆنفرانس، ئاخر رۆژ بوو، نەوشیروان لێی پرسیم: تۆ بڵێی لەم کۆنفرانسە سەرکەوین؟ ئەو بەلایانەمان لەکۆڵ بێتەوە مەبەستی (سالار و جەعفەر و مەلا بەختیار) بوو، منیش پێم‌ووت: ئەگەر تۆ هەقت نەبێ و بەزۆر نەیان خەیتەوە سەرکردایەتی بەتایبەتی مام جەلالیش لێرە نیە دڵنەواییان با، ئەوا دڵنیابە، کە دەرناچن و لەکۆڵ کۆمەڵە دەبنەوە.

نەوشیروان وتی: من هەقم بەسەریانەوە نیەو لایەنگری هیچ لایەکیشیان ناکەم، کێ دەرچوو با دەرچێ، بەڵام ئەگەر ئەمانە دەرچنەوە من وازئەهێنم و بیر لە رێکخراوێکی تر دەکەمەوە دایبمەزرێنین لەگەڵمدای؟ بێ سێ و دووکردن وتم: لەگەڵتام".

برایم جەلال: چەپکێک لەمێژووی کۆمەڵە، چ٢، چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی ٢٠١١ ل ٣٤٤-٣٤٥.

نوێنەرانی (کۆمیتەی هەرێمەکان) سەرەتا زۆر بڕوایان بەخۆیان هەبوو، کە لەسەر ڕێگای ڕاست و هەقن و دەتوانن بەرپەرچی باڵی ئۆپۆرتۆنیست و راستڕەو بدەنەوە. هەر لەیەکەم ڕۆژی کۆنفرانسەوە، بڕیاریان دا بێدەنگی هەڵبژێرن.

ئەو سەرکردانە، زۆر بڕوایان بەکادرو ئەندامی کۆمەڵە هەبوو پێیانوابوو: گێژەڵووکەی مەکینەی پڕوپاگەندەی ئەوان کاریان تێناکات و نایانبزوێنێت. هێلانەی جاڵجاڵۆکەی پیلانگێڕی دەبینن و بەئاسانی تێناکەون.

پیلانەکەی ئەوان زۆر لەوە گەورەتر بوو، کە ئێمە لەمێشکی خۆماندا قەوارە، پانتایی و رووبەرەکەیمان بەڕەش و سپی وێناکردبوو. ئێمە لەناو کۆنفرانسیشدا ئەوەندە بەهێزبووین دەمانتوانی ئەمجارەشیان پیلانەکەیان هەڵتەکێنینەوە. هەڵەیەک ریسەکەی لێکردنیەوە بەخوری و ئەم لا گلۆڵەکەی کەوتە لێژی.

ئەوان هەر هەموویان، یەک دەست و یەک هەڵوێست بوون:

تۆپبارانی خەستی یەکەم سەنگەر (سالار عەزیزو مامۆستا جەعفەر) زۆر بەخەستی کرا. لێدانی سەنگەری دووەم و سێیەم بە "پاروو"یەکی ئاسان دانرابوون.

پاژێک لەهەڤاڵانی خۆشمان بڕوایان بەتیۆریی: (ئاگرە سوورە لەخۆم دوورە) بوو.

گوایە: دوو کەس دەبنە "قوربانی" و تەنگژە خنکێنەرەکانی کۆمەڵەو یەکێتی کۆتایی پێدێت. پێشتر مام جەلال چارەسەری باشتری دانابوو. ساڵی ١٩٧٩ بەخۆمی گوت: "پێمباشە پەیوەندی تۆو کاکە نەوە باشتر بێت. کاکە نەوە پیاوێکی خاکی و رۆشنبیرو تێکۆشەرو سادەیە! سالار عەزیز پیاوێکی بۆرجوازی، رۆح زل، لووتبەرزی خۆبەشت زان و ناموسەقەفە. تۆو کاکە نەوە پێکەوە

کاربکەن، یەکێتی و کۆمەڵە باشتر بەرەو پێشەوە دەڕۆن. تۆ پیاوێکی رۆشنبیرو فیداکاریت، براو کەس و کارت هەموویان دەناسم. قوربانییەکی زۆرتان داوە. بەموو لەخەبات و تێکۆشان لاتان نەداوە. تۆ لەسالار عەزیزەوە زۆر دووریت و لەکاکە نەوەوە نزیکتریت. تۆ نەبیت سالار عەزیز چییە؟".

من گوتم: "من رێزم بۆ تۆو کاک نەوشیروان هەیە. من هیچ کێشەیەکم لەگەڵ نەوشیروان نییەو ئێمە ئەومان وەکو برا گەورە داناوە. کێشەکان شەخسی نین. من هەست دەکەم ئەگەر بەم شێوەیە کار بکەین تووشی ململانێی سەخت و دووبەرەکی دەبین. کێشەی ئەمڕۆی گەلی کورد ئەم پارچە پارچەبوونەیە. دوولەتبوونێکیتریشی بێتە سەر، گەلی کورد ماڵوێران دەکەین. دڵنیابە من نەرقم لەکەسەو نەپشتیوانی لەکاری ناڕاست و خوارو خێچ دەکەم.." لەکۆبوونەوەیەکی هاوبەشی سەرکردایەتی کۆمەڵەو مام جەلال قسەکانی مام جەلال و خۆمم دووبارە کردەوە، ئەو گێڕانەوەکەی پشتڕاست کردەوە، هەرچەند هەڵوێستی منی بەدڵ نەبوو..

سوپایەکی کۆک و تەیارو بە بەرنامە، دەتوانێ باشتر شەڕ بکات. لەچاو سوپایەکی بەهێزی بێ بەرنامە، کە لەسەرکەوتنی خۆی دڵنیا بێت و بەتەواوی پشتی لێکردبێتەوە!

ئەوان بڕیاریان دابوو: شەڕی مان و نەمان بکەن. من ئێستا، کە رووداوەکانی ئەو رۆژگارە دێنمە بەرچاوی خۆم: شەڕەکەی (تاریق بن زیاد)م بیردەکەوێتەوە، پاش لە دەریا پەڕینەوە، بەسەربازەکانی گوتووە:

(البحر من ورائکم.. والعدو امامکم) هێزێکی سەربازی بکەوێتە نێوان دوو بەرداشەوە، سوور دەزانێت زۆرباش شەڕ نەکات تیا دەچێت.

ئێمە پێمانوابوو: ئەوان ئەو هێزە نین بتوانن هاوکێشەکانی ناو کۆمەڵە بگۆڕن. ئەوان چەند پڕوپاگەندەی ژەهراوی بڵاوبکەنەوە، ناتوانن شاخی زەردە بەدەرزی کون بکەن. لەناو کۆنفرانسدا، ئەوە رووناداات، کە ئەوان پێشبینی دەکەن!

کەس خەیاڵی بۆ (پرۆژەی کودەتایەکی نهێنی) نەدەچوو، کۆنفرانس، کۆنفرانس نەبوو: سەعاتی سفر (.) دەستپێکردنی کودەتاو پەلاماردان بوو. هەنگاوی یەکلاکەری نەخشەی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان بوو*.

## پێشبینی

تازە دەنگوباسی پێشنیازی کۆنفرانسی کۆمەڵە بڵاودەبوەوە. سالار، ئازاد هەورامی و مەلا بەختیار بۆ تووژەڵە هاتن و کەوتینە بیرورا گۆڕینەوە سەبارەت بە ئەگەری بەستنی کۆنفرانس و پێشبینیەکانی ئەندامان و کادرانی کۆمەڵە.

سالار گوتی: "دیارە هاوڕێیان سوورن لەسەر ئەوەی لەچەند هەفتەی داهاتوودا کۆنفرانس ببەسترێت، ئێمەیش دەچین و لەوێ قسەی خۆمان دەکەین!"

مەلا بەختیار هەر زۆر گەشبین بوو، بەشادیەوە گوتی:

"من دڵنیاتان دەکەمەوە، ئێمە هەر چوارمان دەردەچین، هیچ کێشەیەکمان نییە، چونکە کادرانی کۆمەڵە بەوەفاو دڵسۆزن و دەزانن ئێمە چەند خەباتمان کردووە؟ ئێمە بەسەرکەوتوویی

---

* نەوشیروان مستەفا پاش تێپەڕبوونی یەک چارەکە سەدە بەسەر هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەدا، ئینجا فرمێسکی پەشیمانی بەسەر گلکۆی کۆمەڵەدا هەڵدەوەرێنێت. بڕوانە: گۆڤاری گولان، دیمانەی تایبەت، ژمارە (٧٠٧) هەولێر ٢٠٠٨/١١/٣ ل ٣٣.

سەرکردایەتی کۆمەڵەمان کردووەو نەمانهێشتووە تووشی تێکشکان و پەرتەوازەیی و داڕووخان ببێت".

ئازاد گوتی: "من بۆنی جموجۆڵ و ئەمسەرو ئەوسەرێکی خراپ دەکەم، کاک نەوشیروان بەهەموو کەسێکی گوتووە لەم کۆنفرانسەدا یان من دەبم، یان کاک سالارو مامۆستا جەعفەر، کەواتە: کۆنفرانسەکە بۆ لێدان و دەپەڕاندنە، نەک بۆ بەهێزکردنی ریزەکانی کۆمەڵە".

من لەگەڵ ئازاد هاوڕابووم، بەڕاشکاوانە گوتم: "ئەوان ئامادەکارییەکی چڕوپڕیان کردوەو پڕوپاگەندەیەکی بەرفراوانیان کردووەو ژمارەیەکی زۆر خەڵکی گوێڕایەڵی خۆیان بانگ کردووەو ئێمە لەجێگەی خۆمان دانیشتووین‌و ئەستێران دەژمێرین.

بەم وەزعەوە کۆنفرانس بڕوات لەدە لاوە پەلامارمان دەدەن. ماوەیەک دوا بخرێت و بڕێک خۆمان ئامادەکاری بکەین، رەنگە تا ئەوکاتە بەشێک لەکێشەکان چارەسەر بکرێن!".

مەلا بەختیار گوتی: (هیچ روونادات و ئێمە نابێ لەبەستنی کۆنفرانس بترسین، دڵنیام ئەم چوارە دەردەچین، رەنگە مولازم عومەر تۆزێک جێگەی ترس بێت و بەزەحمەت دەربچێت، ئەویش چارەسەر دەکەین".

سالارگوتی: "ئەمەی ئێستا شەپۆلێکە، نەوشیروان سواری شەپۆلەکە بووەو بەئارەزووی خۆی قسە دەکات. ئەم شەپۆلە رەنگە تا ئەوکاتە بنیشێتەوە".

**مالیمۆس**

یەکەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان، لەئایاری ١٩٨١ لەگوندی کانی زەرد (سەردەشت) بەسترا. نێوی (کۆنفرانسی مالیمۆس)ی لێنراو بەپچڕ پچڕی نزیکەی دە رۆژی خایاند. بەسەریەکەوە (٨٠) سەعات لەسەر ئەرز بەچوار مشقی دانیشتین.

هەموو هەشتا سەعاتەکە لەیەک شوێندا نەبووین، سێ شوێنمان گۆڕی، کە ئەمانەی خوارەوە بوون:

١-مالیمۆس: مالیمۆس* ناوی فەیلەسووفێکی یۆنانییە. شوێنەکە لەبن لێرەوارێکی سەرەو لێژی تەختایی بوو، کە دەکەوێتە باکوری خۆرئاوای گوندی کانی زەردەوە. سەرەتا ئەندامانی کۆنفرانس رویانکردە کانیاوێک، کە دەکەوێتە دەستی چەپی دۆڵێکی کراوە، لەنزیک کانیەکە دابنیشن، جووتیارێکم بینی و گوتم: "ئەرێ برا ئەم کانییە چی پێدەڵێن؟"

ئەو گوتی: "کانی بۆقە!"

دەستم بۆ لای راست راکێشا: "ئەی ئەو تەختاییە نێوی چییە؟"

جوتیارەکە گوتی: "نێوی مالیمۆسە!"

من بەمولازم عومەر عەبدوڵلاو ئازاد هەورامیم گوت: "ئەم ناوە لەناوێکی ئۆروپی دەچێت، وەکو ناوی ئەو شوێنانەیە، کە سۆسیالیستەکانی ئۆروپای سەدەی (١٩) کۆنگرەیان تێدا

---

* هێگل لەمێژووی فەلسەفەی یۆنانیدا ناوی مالیمۆسی هێناوە. کادرێک نازانێت مالیمۆس چییەو چاوی بەکادرێک دەکەوێت، کە ناوی کەمال دەبێت. لێی دەپرسێت: "مالیمۆس چییە؟" ئەویش دەڵێت: "هەر شوێنێک کۆنفرانسی تێدا بەسترا ئیدی ناوی ئەو شوێنە دەنرێت مالیمۆس!" لەو رۆژەوە کاک کەمال بە (کەمال مالیمۆس) ناوی رۆیشت..

بەستووە وەکو (گۆتا) و (یەنا)! ئەوانیش گوتیان: "کۆنفرانسی مالیمۆس مۆسیقیترو ئەدەبیترە! کۆنفرانسی "کانی بۆقە" بۆ ئەدەبیات و کاری نووسین نەگونجاوە..

٢-لەبەر لێزمەو باران بۆ رۆژی دووەم، لەمزگەوتەکەی کانی زەرد دانیشتنەکان کران. زۆربەی بەشدارانی کۆنفرانس،، پێیانوابوو: هەر رووداوێک رووبدات (لێدانی فڕۆکە، کارێکی تیرۆریستی) زیانی لێدانەکە زۆر گەورە دەبێت.

٣-زینۆی سوور (خڕی ناوزەنگ) دوا رۆژەکانی کۆنفرانس، دیارە لەبەر کات و نانخواردن، لە (زینۆی سوور) لەسەری سەرەوەی بارەگاکانی (م.س) لەخڕی ناوزەنگ بەڕێوەچوو..

- ١٨٥ کادرو ئەندام بەشدارییان لەکۆبوونەوەکان کرد.

- لەڕووی تەمەنەوە:

+٤٩ ئەندام ٢٠-٢٤ ساڵ بوون.

+٧٤ ئەندام ٢٥-٣٠ ساڵ بوون.

+١١ ئەندام ٣١-٣٥ ساڵ بوون.

+٤١ ئەندام ٣٦-٤٠ ساڵ بوون.

+١٠ئەندام سەرووی چل ساڵ بوون.

- لەڕووی کار و پیشەوە:

+٤٤ ئەندام: کرێکار بوون

+١٧ ئەندام: پیشەگەر

+٦٥ ئەندام: موچەخۆری بچووک.

+٩ئەندام: پیشەگەری گەورە بوون*.

+٥٠ ئەندام: قوتابی و خوێندکاری زانکۆو پێشمەرگە بوون.

+٥ ئەندام: ژن بوون**.

کۆمەڵە خۆی بەرێکخراوێکی کرێکاری (م.ل) دادەنا. کرێکار رێــژەی (٢٥%)ی تێنەپەڕانــدووە. بەپــێچەوانەوە بۆرجــوازی بچووک: (مووچەخـۆری بچووک، خوێندکار، پیشـەگەر) رێژەی ٧٥%ی ئەنــدامانی کۆنفرانســەکە بــوون. رێــژەی ژن ٢،٥% ئەندامانی کۆنفرانسـەکە بوون. کۆمەڵە پاش (١١) سـاڵ تەنیا (٥) ژن مافی بەشداری کردنی کۆنفرانسیان هەبێت، بەڵگەی عەقڵیەتی باوکسالاری و نێرینەگەراییە، هەر لەسـەرەتاوە بالادەستی خۆی سەپاندووە. زۆربەی ژنەکان (ژنی ماڵ) بوون: لەئینتیمای حزبیدا رەدووی مێردەکانیان کەوتبوون.

دەربارەی رێژەی کرێکار: دەتوانم ئەوە بنووسم. پاژێک لەو هەڤاڵانە بەناو کرێکارو پرۆلیتار بوون، بەکـردەوە زۆر دژی کرێکارو چینەکەی خۆیان بوون. فەڕاشـی قوتابخانە بەکرێکار دانانرێت. کرێکاری ئێمە کرێکاری کارگەی گەورەو کۆمپانیـای پیشەسازی نەبوون. کرێکاری کاتی و کرێگرتەی کاری رۆژانەی ناوبازاڕ بوون.

---

* لام روون نییە مەبەستی نووسەری راگەیاندنی کۆتایی..) لە (پیشـەگەری گەورە) چییە؟ ئەگەر مەبەسـت خـاوەن کـارگەی بچووک و بەڵێندەر بێت، ئەوە من کەسی وام بیرناکەوێتەوە!.

** راگەیانــدنی کۆتــایی یەکەمــین کۆنفرانســی کــۆمەڵەی رەنجــدەرانی کوردستان. ئایاری ١٩٨١.

ژمارەیەک لەئەهلی هونەرو ئەتەکێت (وەکو ئازاد هەورامی) ئامادەکاری باشیان کردبوو بۆئەوەی بەسروودی (ئینتەرناسیۆنال) کۆنفرانسەکە دەست پێبکات. دیارە ئازاد بەو هەموو دڵ ناسکیەی خۆی گوێی لەهەندێ کۆمێتی ساردو سڕوترشاو بوو، پەژیوانی لەبری سروود هەڵبژارد.

لەو ڕۆژانەدا، نەوشیروان ئەوەندە دەسەڵاتی بەخۆی دابوو. خۆی بەتەنیا ڕاپۆرتی سیاسی بنووسێت و پیشانی کەسی نەدات، نەوەک قسەی کەسێک کاری تێبکات و هەندێ بڕگەو دێڕ بکوژێنێتەوە! ڕاپۆرتێکی نووسراوی سەروبۆر نەکراوی، بەپەلە پڕوزێ خوێندەوە. ئەو چەند خاڵێکی خستە بەرچاو: بەشێکی قسەی گشتی و بەشێکی بۆ وروژاندن و دنەدان و ئاورخۆشکردن بوو، نەک بەرنامەی سیاسی بێت. مام جەلال ڕاپۆرتی سیاسی خۆی هەمیشە بەچاپکراوی بڵاودەکردەوە، کەچی نەوشیروان یەک دێڕی ڕاپۆرتەکەی بڵاونەدەکردەوە و لەهیچ کوێش ئاماژەی بۆ نەکراوە! ئاسمانی ڕۆژی یەکەم، گرژی و مۆنی و پێشخواردنەوەی لێدەباری. هەر لەیەکەم چرکەوە، بەڕوونی هەست بەوە دەکرا: مەنجەڵی زنجیر لەملی شۆربای پیلانێکی قێزەون لەسەر ئاگر قوڵپەی دێت. پاژێک لەئامادەبوان، پێشتر تفیان کردبووە دەمی یەکترەوەو قسەیان کردبووە یەک! چەند کەسێک لە دەمڕاستەکانی گروپی زیندان، بەزەقی خۆیان کردبوە (کەوا سووری بەر لەشکر)و خەنجەری تۆڵەسەندنەوەیان لەکالان هەڵکێشابوو. بەتوندی هێرشەکە بۆ سەر (کۆمیتەی هەرێمەکان) بوو. پێیانوابوو: تێکشکانی سمبۆل و ئەفسانەی (کۆمیتەی هەرێمەکان) یەکسانە بەگەڕانەوەی ئەوان بۆ دەسەڵات

و ســـەرکردایەتی و (کــۆمیتەی هەرێمەکــان) لەســـەر ڕێگــای بەختەوەریی ئەواندا ئاستەنگێکی گەورەیە.

ڕێکاری کۆنفرانسەکە، لەگەڵ شێوەی بەڕێوەبردنی کۆنفرانس و کۆنگرەی هێـزە کوردسـتانیەکانیش جیـاواز بـوو. دانیشـتنەکان لەکۆبونەوەی سەردەمی شێخ مەحمود و قازی محەمەدو مەحمود پاشـای جـاف و بـابەکر ئاغـای پشـدەری دەچـوو، تـا کۆنفرانسـی هێزێکی سیاسی مۆدێرن.

کــارو ئەرکەکــانی کــۆنفرانس بەســـەر لیــژنەی سیاســـی، پێشـمەرگەیی، دارایـی، ڕێکخسـتن، سـکاڵا.. تـاد. دابەش نەکـرا. هەریەکە دەیویســت تــۆڵەی خــۆی بســێنێتەوە، هەر دەســتەو تـاقمێکیش هێرشـی دەکردە سـەر بەرەبـابەکەی تـر، ئەم خەرمـانی ئەوی دەســوتاند. ئەو کلکــی کەری ئەمــی دەقرتانــد. هەریەکە لەلایەکەوە گـوللەی بەتـاریکییەوە دەنـا! لەکوردەواریـدا ئەم جۆرە دانیشتن و کۆبوونەوەیە بەگەڕەلاوژە دادەنرێت. هەر جارە مینێک لەبـن پێـی یەکێـک دەتەقییەوەو هەرکەسـە لەشـوێنی خـۆیەوە لیســێکی پێـدا دەمــاڵی. لەنــاو قســەکاندا کەســێک کەلێنێکــی دەدۆزیەوەو بیناقاقـای کەسێکی دی دەگـرت. هەریەکە لەلایەکەوە بەبــێ لێکـدانەوەو شــیکاری پەلامــاری ئەو کەســەیان دەدا، کە گلۆڵەی تازە دەکەوێتە لێژیەوە.

ئێرە جێگەی ئەوە نییە، من قسەکانی نەوشیروان هەر هەمووی وەکو خۆی بنووسمەوە، کە پێچەوانەی ڕێبازی کۆمەڵە بوون و شێوازی بیری کاژێک و پاسۆکیشی تێپەڕاندبوو. هەر بۆنموونە جارێکیــان لەســـەر مەســەلەی (کرێکــارانی جیهــان یەکگــرتن) و

(هاوخەباتی کوردو عەرەب) هەر زۆر بەراشکاوانە گوتی: (عەرەب بەهەشتیشم بۆ دروست بکات، من نامەوێت).

سەبارەت بەپەیوەندی نێوان یەکێتی و کۆمەڵە بەم شێوەیە بیروڕای خۆی دارشت:

"ئێمە یەکێتیمان دروست کردووە. بەهێزبوونی یەکێتی بەهێزبوونی کۆمەڵەیە. بەرەوپێشەوەچوونی یەکێتی، بەرەوپێشەوەچوونی کۆمەڵەیە! هەرچی پێشمەرگەی یەکێتی هەیە، پێشمەرگەی کۆمەڵەن، بەپێچەوانەشەوە تێکشکانی یەکێتی، هەرەسهێنانی یەکێتی، دەبێتە هۆی تێکشکان و هەرەس و لەناوچوونی کۆمەڵە، کەواتە: ئێمە دەبێ بەهەموو تواناکانمانەوە یەکێتی بەهێز بکەین و گەشەی پێبدەین! یەکێتیمان بەهێز کرد، ئەوە کۆمەڵەمان بەهێز کردووە. من هیچ جیاوازییەک لەنێوان یەکێتی و کۆمەڵەدا نابینم. ئیتر ئێمە بۆ باسی سەربەخۆیی و جیابوونەوەی کۆمەڵە بکەین؟"

سەیر ئەوەیە ئەو (٥٣) سەرکردەو کادرەی کۆمەڵە، سێ چوار مانگ پێش کۆنفرانس هەر هەموویان دەنگیان بۆ (سەربەخۆیی) و (جیابوونەوە)ی کۆمەڵە دابوو، بەرامبەر تێزەکانی نەوشیروان، یەک وشە لەدەمیانەوە دەرنەچوو، بەپێچەوانەوە زۆربەیان پشتیوانیان لەتێزەکانی نەوشیروان کرد. بەڕێکەوت لەکاتی پشوودا، یەکێک لەو سەرکردانە بە بەردەم سمێڵمدا تێپەڕی. منیش یەکێک لەقسەکانی خۆی، کە چەند هەفتەیەک پێشتر کردبووی، بیر خستەوە: من گوتم: "فڵان ئەرێ جەنابت چەند هەفتەیەک لەمەوپێش بەباسی سەربەخۆیی و جیابوونەوە خەریک بوو ورگمانت دەدڕی، کەچی ئێستا بەدیوی ئەو دیودا باتداوەتەوە.."

ئەو گـوتی: "بـێ قەزا بیـت مامۆسـتا لێمـان گەڕێ، کارەکـانی خۆمان بکەین و وەزعەکەمان لێ تێک مەدە!"

## دژی ئۆپۆرتۆنیزم:

یەکێک لەو بابەتـانەی "گروپـی زینـدان" و "نەوشـیروان" وەکـو (بەڵـگەی تـاوان" بەدەسـتیانەوە گـرت و خەڵکیـان پـێ دەوروژانـد. گوتارێـک بـوو بەناونیشـانی (دژی ئۆپۆرتـۆنیزم) کە لەگۆڤـاری کـۆمەڵەی ژمـارە (٩) سـەرەتای (١٩٨١) بڵاوکـرایەوە. ئەمـیش (کراسـێکی تـری عوسـمان) بـوو، کە هەنـدێ خێرەومەنـدان خـوێنی نەوشـیروانیان پێدا هەڵپرژانـد. بەگـوێرەی شـیکاری و لێکدانەوەو (تفسـیرات)ی (مفسـرین) گوایە: ئەم گوتـارە دژی نەوشـیروانە ئەو خۆیشـی بەراشـکاوانە هەسـتایە سـەرپێ و گـوتی (مـن سـوورم لەسەر ئەوەی ئەم وتارە دژی من نووسراوە".

هەر هەمـوو برووبیـانوی ئەم کەسـانە ئەم بـڕگەیە بـوو: "هەمـوو تێکۆشـــەرێکی (م.ل) پێویســـتە ئەو راســـتیە بزانـــێ کە رادەی پەیـڕەوی کـردن و ئیتلیـزام کـردن بەبیروبـاوەڕی (م.ل) زاوەزاو و هەڵاوبگر نیە، زمـان درێـژی و وتـاری دوورودرێـژ نیـە، بۆچـوون و هەڵوێـست و پراکتیکە".

ئەمە ئەو بـڕگەیە بـوو کە گـڕی بەردایە پـووش و پـاوەنی کۆنفرانســەکە. مــن ئەوســا و ئێســتاش ئەوە دەڵـێم: مەبەسـتی بنچینەیــی گوتــارەکە (دیــاردە)یەک بــووە لەنــاو کــۆمەڵەدا. نەک کەســێک بەدیــاریکراوی. وێــڕای روونکــردنەوەو دڵنیــابوونی زۆربەی زۆری ئامـــادەبووان، کە گوتـــاری (دژی ئۆپۆتـــۆنیزم) نووسـینێکی ئاسـاییە بـۆ هۆشـیارکردنەوەی ئەنـدامانی کـۆمەڵە

نووســـراوه. نـــزیکەی ٧٥% کـــاتی کۆنفرانســـەکە بەگفتوگـــۆو قسەکردن لەسەر دژی ئۆپۆرتۆنیزم بەڕێکرا.. تاد.

**شاخێك ڕەشەبا نەیهەژاند:**

ئـازاد هەورامـی، مرۆڤێکـی بـوێرو سـەر ڕاسـت و هەڵوێسـت نەگـۆڕ بـــوو، بەشـــێک نەبـــوو لەدیـــاردەی دەســـتگەری و فراکسیۆنسـازی و ململانـێ و پاشـقولگرتن و قسـەهێنان و بـردن. ئەو هەر زۆر بەرز، هەر وەک هەڵۆ لەئاسمانەوە دەیڕوانی.

نەیدەویست خۆی بچوکبکاتەوە، بەسەر زەویدا بخشێ و خۆی لەو قەوزەو لیتەی زۆرانبازی و شـەڕە دەنووکی بێتام و منـاڵانە بئاڵێنێت. ئەوکاتە من و سالار عەزیزو چەند هـاوڕێیەکی تر، لەنـاو کۆبونەوەی ناوەندی کۆمەڵەو (م.س) و (سـەرکردایەتی) بۆچوون و هەڵوێسـتمان لەهەڵوەشـاندنەوەو پـارچە پـارچەکردنی کـۆمەڵە ڕوون و بێـپەروا بـوو. بەرامـبەر هەر بڕیـارێکی لارو لەوێـر، کە لەگەڵ بەرژەوەنـدییە باڵاکـانی گەلـی کوردسـتان نەدەگونجـا، بێدەنگیمان هەڵنەدەبژارد.

ئـازاد گـۆمێکی مەنـگ بـوو، بەئاســانی هیچـی نەدەدرکانـد، دەمزانـی ئەویـش وەکـو مـن بیردەکـاتەوە، بەڵام تێگەیشـتن و شـــیکاریەکانی ئەو ڕاســـتەوخۆ نەبـــوو*، یـــان بەســـەربردەیەک هەڵوێستی خۆی دەخستەڕوو.

---

* ڕۆستەم کەرکوکی لەناوەڕاستی کۆنفرانسـەکە ڕابوو، گوتی: ئەرێ ئەم (دژی ئۆپۆرتـۆنیزم)ە نەبڕایەوە، بەیـانی، نیـوەڕۆ، ئێـوارە، بـاس هەر باسـی (دژی ئۆپۆرتۆنیزم)ە، ئەم چوار پێنج ڕۆژە نەتوانرا قسە لەسەر هیچ شتێکی

بەدرێژایی رۆژانی کۆنفرانس، ئازادیش وەکو چەندین سەرکردەی تر. بەبێ ئەوەی هیچ شتێکی دژی لایەنێک کردبێت، یان زیانی بەناوی کەسێک گەیاندبێت، بەر لمۆزی رەخنەو غەزەبی تەکەتولات کەوت، لەمەسەلەی هەڵبژاردنی سەرکردایەتی نوێدا، لەپشتەوە پاڵێکیان پێوەنا.

**خەجێ یەشار:**

لەکۆنفرانسی "مالیمۆس" نەوشیروان پێشنیارێکی بۆ مادەیەکی پەیڕەوی ناوخۆ کرد، بەم شێوەیەی خوارەوە دەربارەی پێناسەی کۆمەڵەو سروشتی چینایەتی ئەم ڕێکخراوە:

"کۆمەڵە ڕێکخراوی کرێکاران، جووتیاران و ڕەنجدەرانی کوردستانە" بەرامبەر ئەم پێشنیارە، ئێمە ئەم داڕشتنەمان بەسەنگو تەرازووی تیۆریی مارکسیزم پێ هەڵە بوو، پێشنیازێکی جیاوازمان پێشکەش کرد:

"کۆمەڵە ڕێکخراوی چینی کرێکاری کوردستانە، ڕەنجدەران و ڕۆشنبیرانی شۆڕشگێڕیش لەژێر ئاڵای خۆیدا کۆدەکاتەوە".

دیارە لەڕووی تیۆرییەوە، جیاوازییەکی زۆر گەورە لەنێوان ئەم دوو داڕشتنەدا هەیە. ئەم دوو داڕشتنە، خرایە دەنگدانەوە لەکۆی نزیکەی ١٨٥ ئەندام، نزیکەی ١٧٠ کەس دەنگیان بۆ داڕشتنی یەکەم دا، داڕشتنی دووەم نزیکەی (١٠-١٢) کەسێک دەنگیان بۆدا، ئەوەی راستی بێت ئەمە ئاستی تیۆری و سیاسی

---

تر دوو قسەی بەسود بکرێت، بەخوا لەمەودوا یەک کەس باسی (دژی ئۆپۆرتونیزم) بکات، یەک سەلیەی پێوە دەنێم.. تاد.

ئەندامانی کۆنفرانسەکە بوو، کە تەنیا سەیری دەمی نەوشیروانیان دەکرد، ئەو هەرچی لەزاریەوە بهاتایەتە دەرەوە، بەبێ لێکدانەوەو شیکردنەوە دەستی بۆ بەرز دەکرایەوە.

بۆ پشوی نیوەڕۆ لەگەڵ جەمالی عەلی باپیرو زێڕۆی عەبدوڵڵا ڕێوی و ئازاد هەورامی و سالار عەزیز لەماڵی زێڕۆ لاماندا، بەرێکەوت هەڤاڵ (خەجێ یەشار) لەوێ بوو، خەجێ لەڕووی تیۆریی مارکسییەوە، لەگەڵ سەرکردەکانی کۆمەڵە بەراورد نەدەکرا! ئێمە ئەنجامی دەنگدانەکەمان سەبارەت بەپێناسەی کۆمەڵە بۆ گێڕایەوە. ئەو چاوی پەڕییە پشتی سەری و بڕوای نەدەکرد، ئەندامانی کۆمەڵە ئەو هەڵە کوشندەیەیان کردبێت! ئەو پێی لەسەر ئەوە داگرت، وەکو میوانێک بەشداری لەکۆبوونەوەی پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژەی کۆنفرانس بکات. ئەو زۆر لەسەر جیاوازی نێوان (بۆلشەویک) و (مەنشەویک) دوا. بۆ ئەندامانی کۆنفرانسی سەلماند، بڕیارەکەیان پێچەوانەی مارکسیەتەو کۆمەڵە بەرەو ڕێکخراوێکی فرە- چین و پان و پۆڕ نەک ڕێکخراوی کرێکاران دەبات، هەردوو داڕشتنەکە سەرلەنوێ خرایە دەنگدانەوە، سەیر ئەوەیە، نەوشیروان لەجاری دووەمدا، دەنگی بۆ داڕشتنەکەی ئێمەدا! ئەم داڕشتنە لەپەیڕەوی ناوخۆی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان لەساڵی ١٩٨١ جێگیر کرا.. هتد.

### ئاستی هۆشیاری:

ئەوەی لەتەپ و تۆزی گۆشەو کەناری ئەم کۆنفرانسە گوماناویەدا بۆ بەندە هەڵهێنجرا: پێشەکی: ژەهراو ڕژێنرا بوو: سیناریۆو شانۆگەری ئامادەکرابوو. کۆنفرانس جێگایەک بوو،

قوربانییەکـــان پێشـــکەش بکـــرێن بـــۆئەوەی دڵـــی رەشـــی کودەتاچییەکـان ئـاو بخـواتەوە. هەر بـۆ نمـونە: رۆژی دووەمـی کـۆنفرانس. هێرشـێکی توند کرایە سـەر (دژی ئۆپۆرتـۆنیزم)، مـن ناچار بووم روونکردنەوەیەک پێشکەش بکەم. گوتم: (من نـاوی کەسـم نەهێنـاوەو مەبەسـتم هـیچ کەسـێک نەبـووە: مەبەسـتم دیاردەیەک بووە، کە هەیە! ئایا لەریزەکـانی کـۆمەڵە دووڕوویـی هەیە یـان نییە؟ ئایا لەریزەکـانی کـۆمەڵەدا ئەمـبەرو ئەوبەر هەیە نییە؟ کۆمەڵە رێکخراوێکی مارکسـییە: ئایا هەمـوو ئەنـدامانی ئەم رێکخـراوە بەتیۆریی مارکسـی کاردەکەن؟ ..تـاد"، من لەقسـەکانم بوومەوە، نەوشیروان گوتی: "راسـتە ئەم هەمـوو دیاردەیە لەنـاو کۆمەڵەدا هەیە، بەڵام تـۆ مەبەسـتت مـن بـووە. ئەم (مقـالە)یەی تـۆ دوژمنانی کۆمەڵە سوودی لێوەردەگرن!"

دواتـر بـوار درا، کـای کـۆن بەبابـدا بکرێـت. لەکـۆنفرانس و کۆنگرەی ئاساییدا، لیژنەی سکاڵا دروست دەکرێت. کێ سـکاڵای هەیە دەتوانێت لەبەردەم ئەو لیژنەیە پێشکەشی بکات.

لێـرە بـۆ شـکاندن و ریسـواکردنی ئەم و ئەو، دەرگـای خستنەڕووی قسەی بازاڕی و درۆ هەڵبەستن خرایەڕوو.

بۆ نمونە: کەسێک پیشەکی فێرکرابوو، هەڵسێت و خۆی وەکو قوربـانی و غەدرلێکراوێـک پێشـکەش بکـات. بەچەپ و راسـتدا دەردی دڵ هەڵڕێژێـت. ئەم کـابرایە وەکـو ئەکتەرێـک، فرمێسـک بەچاویا دەهاتە خوارەوە، دڵی پڕبوو. گوایە: ئەندامێکی ناوەندی – کۆمەڵە مۆرەی لێکردووەو بەنیاز بووە فەلاقەی بکات.

ئەم جۆرە شانۆگەریە هەر بۆ ئەوە بوو، بەوروژاندنی سۆزی ئەندامانی کۆنفرانسەکە، بەئاسانتر لەباڵی (کۆمیتەی هەرێمەکان) بدرێت.

نوێنەرانی باڵی (کۆمیتەی هەرێمەکان) تاڕادەیەک پاشەکشەیان پێوەدیار بوو. کەسانێک لەناو بەرەی ئەو دیو هەبوو: بەدەستی خۆی چەندین کادرو ئەندامی دڵسۆزی کوشتبوو.

کەسانێک هەبوون ژیاننامەیان پەڵەی ڕەشی ئەوتۆی پێوەبوو، بەهەزار کۆنفرانس پاک نەدەکرایەوە. کەسێک نەبوو بەسکرتێر بڵێت: تۆ بەردەوام گاڵتە بەمارکسیەت و سۆسیالیزم دەکەیت، چۆن دەتوانیت لەناو ڕێکخراوێکی (م.ل) دا کاربکەیت؟ بۆ بەدوو پێشمەرگەوە بۆ ناو تەڵەو داوی شارەزوور چوویت؟.

ئەوانەی کە دەبوایە بخرێنە قەفەزی دادگاوە، بەپێچەوانەوە باڵی (کۆمیتەی هەرێمەکان) یان خزاندە ناو قەفەزەوەو لەمێژووی کۆمەڵە سڕێنرانەوە!

پێوەرێکیتر لەسەر نەخشەو پلانی پێشەکی دراو: دکتۆر کەمال خۆشناو بوو! یەک ڕۆژ پێش کۆنفرانس خۆی وەکو ئەندامی کۆمەڵە ڕاگەیاند. پێشتر ئەندامی (م.س) و نوێنەری هێڵی پان بوو. لەماوەی ئەم سێ ساڵەدا، کە پێکەوە کارمان کردووە، ڕۆژێک لەڕۆژان باسی ئەوەی نەکردووە، کە ئەندامی کۆمەڵەیەو بڕوای بەتیۆریی (م.ل) هەیە. کەچی هەرچەند سەعاتێک دوای ئەوەی خۆی وەکو ئەندامی کۆمەڵە ناساند، پاش نەوشیروان زۆرترین دەنگی هێنا. دیارە لەم کۆنفرانسەدا خەبات و دڵسۆزی پولێکی قەڵبی نەدەهێنا. پێشەکی بڕیار درابوو، زۆربەی دەنگەکان بۆ سەر کام ناو بچێت.

## هەڵێك سوودی لێوەرنەگیرا

لەدوا رۆژەکانی کۆنفرانس دەیان سەرکردەو کادری پێشکەوتووی کۆمەڵە وەکو (سالار عەزیز، ئازاد هەورامی، مەلا بەختیار، مولازم عومەر، بەکری حاجی سەفەر، دلێری سەید مەجید، جەمالی عەلی باپیر، مستەفا چاو رەش، شێخ جەعفەر، حامیدی حاجی خالید، شێخ عەلی کەشکۆڵ، مامۆستا پشکۆ، رۆستم کەرکوکی.. تاد) هەر هەموو لەتووژەڵە کۆبوونەوە بۆ لێدوان لەسەر بڕیارەکانی کۆنفرانس. چونکە ئەم ئەندامانە سور دەیانزانی رۆژگارێکی رەش و تاریک و پڕ ململانێ و (پاکردنەوە) چاوەڕوانی داهاتووی کۆمەڵە دەکەن.

نەوشیروان لەسەر ئەم رووداوە، ئەم چەند دێڕەی نووسیوە:

"دوای کۆنفرانس ئەم هاوڕێیانە تووڕەبوون و هەڕەشەیان کرد کە شۆڕش و کۆمەڵە جێ ئەهێڵن و ، ئەچن بۆ دەرەوە، من چەند جارێ سەردانم کردن و، زۆرم لەگەڵ وتن بۆئەوەی دڵیان بهێنمەوە جێگەی خۆی و بمێننەوە کاربکەن، بەڵێنم بەسالارو جەعفەردا کە هەر لە م.س یەکێتی دا بیانهێڵنەوە.. تاد)* ئەم بڕگەیە بڕگەیە و بڕگەکانی تری هەرسێ بەشی کتێبەکەی ئەوەی پەیوەندی بەبیرەوەرییەکانی خودی نوسەرەوە هەبێت نزیکەی ٢٠% زانیاریەکان راست و واقعین. رێژەی ٨٠% زانیاریەکان بەداخەوە بەرهەمی خەیاڵ و فەنتازیای نووسەرن. نووسەر و سەرکردە سیاسیەکانی وڵاتانی پێشکەوتوو، هەوڵیانداوە بابەتی

---

* نەوشیروان مستەفا ئەمین: پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن – دیوی ناوەوەی رووداوەکانی کوردستانی عێراق ١٩٧٩-١٩٨٣ بەرلین – ١٩٩٧ل ١٩٩.

بن و لەسەر لایەنی رەش و دزێوی ژیانی خۆشیان بێ بەزەییانە بنووسن. نەوشیروان لەم سێ کتێبەدا، باسی کەم کەسی بەباشی کردووە، قسەی دروستکردووەو لایەنی نەرێنی بۆ خەڵک داتاشیوە. وێنەی کاریکاتێری بۆ کەسانی فیداکارو سەربەرزی ئەو رێکخراوەی خۆی سکرتێریەتی بەرهەمهێناوە بەحیساب بۆئەوەی لەڕووی سیاسیەوە ئەو خەڵکە بشکێنێت.. ئەو بە یەک دێڕیش باسی یەک هەڵە، یەک تاوان، یەک کاری نەرێنی خۆی نەکردووە! هەر نووسەرێک دەنووکی لەسەر کەموکورتی خەڵک و قاچی خوارو گێڕی ئەم و ئەو بوو، باسی کەموکورتی و کاری ناڕەوای خۆی نەکرد، لای خەڵک ئەو نووسینە تان و پۆی راستگۆیی لەدەست دەدات، ئەمەی نەوشیروان لەسەرەوە نووسیویتی، هەوڵی هەڵگێڕانەوەی راستیەکانە، راستە ئێستا، کە من ئەم دێڕانە دەنووسم، نەوشیروان کۆچی دوایی کردووە، بەڵام زۆربەی ئەوانەی بەشداری دانیشتنەکان بوون ماون و راستیەکان دەزانن.

نەوشیروان، کە هات دیارە زانیاری هەڵەی پێگەیشتبوو، پێیوابوو: ئامانجی ئەم کۆبوونەوەو یەکتری بینینە، راگەیاندنی جیابوونەوەو دووبەرەکیە! ئەو سوور دەیزانی ئەو سەرکردانە، زۆربەی کادرو پێشمەرگەکان پشتیوانیان لێدەکەن و هەر هەڵوێستێک وەربگرن سەرجەم پلانەکانی ئەو هەڵدەوەشێتەوەو گڕ لەخەرمانەکەی بەردەبێت! بەشپرزەیی و هەڵەداوان خۆی گەیاندە تووژەڵە، قسەکانی بەوە دەستپێکرد:

"ئێوە هەموو خەڵکی قارەمان و تێکۆشەرن و ئێوە خاوەن شۆڕش و کۆمەڵەو یەکێتین. من پێشبینی ئەوەم نەکرد، دەنگ بەم

شێوەیە بدرێت و بەشێک لەمانەی ئێستا دەرچوون دەربچوونایە!
من هیوادارم ئێوە دڵتان هیچ نەکات و ئامادەم ئێوە هەرچی دەڵێن وابکەم. وەرنەوە بۆ ناو کۆبوونەوەکان و من ئامادەم لەسەر یەک بەیەکتان قسەی باش بکەم! ئەنجامەکانی هەڵبژاردنی کۆنفرانس هەڵدەوەشێتەوەو سەرلەنوێ هەڵبژاردن دەکەینەوە، من خۆم یەک بەیەک قسەی باش لەسەر یەکە بەیەکەتان دەکەم و دەڵێم: ئەمانە کوڕی ڕۆژی تەنگانەو ڕۆژە سەختەکان بوون و ئەمانە کۆمەڵەیان دروستکردۆتەوەو شۆڕشیان هەڵگیرساندووە..."
قسەکانی نەوشیروان بەر بەرد نەکەوت و لەژێی سۆزی سالار عەزیزدا. ئەو لەبری ئەوەی هەلەکە بقۆزێتەوەو بڵێت: "زۆر سوپاست دەکەین بۆ نیاز پاکیت و ئەم پێشنیازەت. ئێمەیش پێمان باشە ئەم جارەیان قسەکەت نەشکێنین و هەڵبژاردن دووبارە بکرێتەوەو ئەگەر خۆت هەریەکە لەکاندیدەکان هەڵسەنگێنیت، هەرچی هەوری گومان و دڕدۆنگی هەیە دەڕەوێتەوە".
سالار عەزیزو مەلا بەختیار زۆر سوپاسان کردو بەڵێنیان دا، پشتیوانی "سەرکردایەتی" نوێ بکەن و ئەمانیش هەر هەموو وەکو پێشمەرگە بەدڵ و بەگیان پشتیوانیان لێبکەن!
نەوشیروان هاتبوو بۆئەوەی (تنازل)ێکی گەورە بکات و هەموو ئەنجامەکانی پیلانگێڕی و بڕیارە نەرێنیەکانی کۆنفرانسی مالیمۆس بسڕێتەوەو پیلانەکە سەرکەوتوو نەبوو. ئەو هاتبوو بڵێت: سەنگەرەکان چۆڵکرانەوە، هەر کەس جارێکی دی بۆ جێگەی خۆی! هەڵوێست وەرنەگرتنی ئەم هاوڕێیانەی لەتووژەڵە کۆببونەوە دوا بزماری کوشندە بوو، کە لە تەرمی کۆمەڵە درا. لەم ڕۆژەوە ئیدی سەرکردایەتی کۆمەڵە بەرەهایی رادەستی

نەوشیروان و گروپی زیندان کراو گلۆڵەی (کۆمیتەی هەرێمەکان) کەوتە لێژی..*

راستیەکی گشتی هەیە: زانین و خستنەبەرچاو زیانی بۆ کەس نییە، خەڵکی کورد دوای هێز دەکەوێت، نەک دوای بیری راست و قسەی هەق! سەنگەرت چۆڵ کردو شوێنە قایمەکانت جێهێشت، کەس نایەت لەو دەشتاییە شەڕت بۆ بکات!.

---

* زۆرجار لە دانیشتنە تایبەتیەکاندا، باسی رووداوەکانی (مالیمۆس) دەکرێت. سالار عەزیزو مەلا بەختیار رووداوەکانی ناو کۆنفرانس‌و هاتنی نەوشیروان وەکو ئەوەی لەسەرەوە داڕێژراوە، شەن‌و کەو کراوە. سالار عەزیز بە ڕاشکاوانە رەخنەی لە هەڵوێستی خۆی گرتووە. خەجێ یەشار دەیان جار لەسەر کۆنفرانسی مالیمۆس پێکەوە قسەمان کردووە. دواجار شەوی ٢٠٢٠/٦/٢١ بە تلیفۆن گێڕانەوەکەی منی پشتڕاست کردەوە. ئەو ئێستا لە ڤییەنایەو وردەکاریەکانی بەباشی بیرماوە.

# تیرۆرکردنی ئۆپۆزسیۆنی نەبینراو
## (١)

بەیانی رۆژی (١٩٨١/٩/٢٢) لە بارەگای مەکتەبی راگەیاندن لە (گردە کوپان) سەرقاڵی بەرچاییو باسی کار و پلانی رۆژ بووین. لەپڕ (بێستونی مەلا عومەر)* وەکو رەشەبا لەناکاو دەرکەوت: پیاوێکی گورجوگۆڵ، پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلوول، قسەزانو چاونەترس. رۆژی پێشوتر، بەشداری رێوڕەسمی بەخاکسپاردنی نوری حەمەعەلی لە سلێمانی کردبوو. ئەو رۆژی (١٩٨١/٩/٢١) تیرۆر دەکرێتو هەموو شاری سلێمانی پرسەو شینی بۆ دەگێڕێت. پرسەی عەبدولی سۆران جارێ بەتەواوی کۆتایی پێنەهاتبوو، هەڤاڵێکی تری ئەم تێکۆشەرە دیارەی شاری سلێمانی دەکرێتە قوربانیی نەزانیو دەمارگیریی کوێرانە. بێستوونیش بەهەمان شێوە هەستی کردبوو، بۆ هەر کوێ دەچێت، کەسانی نەناسراو شوێنپێی هەڵدەگرنو بەدوایەوەنو بەچڕی چاودێریی دەکەن.

نوری حەمەعەلی وەکو زۆربەی هاووڵاتیانی کوردستان سەر بە خێزانێکی دەستکورت بوو. ساڵی ١٩٧٤ یەکێک لە چالاکترین فەرماندە بەتالیۆنەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستانو یاریدەدەری فەرماندەی هێزی خەبات بوو. بەتالیۆنەکەی

---

* بێستون لە ناو سلێمانی لەلایەن کەسێکی نەناسراوەوە چەند فیشەکێکی پێوەنرابوو، بە رێکەوت بەرنەکەوتبوو..پاش چەند ساڵێک لە ڕوداوەکەی سێروانە بە ژەهر شەهید بوو.

لەزۆربەی شەڕەکاندا دەورێکی کاریگەرو یەکلاکەرو بەرچاوی هەبوو. لە ڕۆژانی نسکۆی ساڵی ١٩٧٥، ئەو لایەنگری درێژەپێدانی شۆڕش‌و چەکدانەنان‌و بەرەنگاری بوو. لەساڵی ١٩٧٦ پەیوەندی لەگەڵ زۆربەی سەرکردەو کادرە پێشکەوتووەکانی کۆمەڵە باش بو. چەند جارێک بەنیازی چوونە شاخ، بڕێک ئامادەکاری کردبوو. برا و کەس‌وکار زانیبوویان، دەیەوێت بەرەو شاخ بداتە شەقەی باڵ، قرەقرو دەمەقاڵێی زۆریان لەگەڵدا کردبوو، ناچاری پەشیمانبوونەوەیان کردبوو.بێستوون دڵی زۆر پڕ بوو، بەڵام دەرینەدەبڕی. ئەو گوتی: "پتر لە بیست هەزار کەس بەدوای تەرمەکەی نوری حەمەعەلیەوە بوون. سەرانسەری شار پرسەو ماتەم‌و شینگێڕان بوو..".

من گوتم: "پێویستە شۆڕش تۆڵەی بکاتەوە. ڕژێم یەکەیەکە تێکۆشەرە گەورەکانمان لەناودەبات!"

بێستوون گوتی: "ڕژێم نوری حەمە عەلی نەکوشتووە".

من گوتم: "ڕژێم نوری حەمە عەلی‌و عەبدولی سۆرانی نەکوشتبێت، دەبێ کێ دەستی بچێتە خوێنی ئەم کەسایەتیە دڵسۆزانە؟".

بێستوون گوتی: "زۆربەی زۆری خەڵک دەڵێت: یەکێتی دەستی کردووە بە تیرۆری ئەوانەی ڕۆژێ لە ڕۆژان کادری سیاسی‌و عەسکەری پارتی بوون..".

من گوتم: "ئەگەر یەکێتی، یان ناوەندی کۆمەڵە ئەم بڕیارەیان دابێت، ئەوە من ئاگادار دەبووم. دڵنیابە تیرۆرکردنی خەڵک لەسەر بنەمای جیاوازی بیروباوەڕی سیاسی، ئەوە تاوانێکی

گەورەیەو من لێی بێدەنگ نابم. من زانیاریم هەیە، نوری دۆستی یەکێتی‌و کۆمەڵە بووە. کاتی خۆی ئێمە هەموو ئەندام‌و پێشمەرگەی پارتی بووین. یەکێتی سیاسەتی ئەوەی نییە، بە تیرۆر ئەندام‌و لایەنگرانی پارتی لەناوبەرێت..".

بێستوون گوتی: "کاکە من لەسەر بنەمای زانیاری قسە دەکەم. زۆربەی خەڵک دڵنیان، دەستی یەکێتی لەپشت تاوانەکانە!".

من گوتم: "کۆمەڵەو یەکێتی کاری دزێوی وا ناکەن‌و من هەر ئێستا دەڕۆم، مام جەلال دەبینم. بزانم یەکێتی یان کۆمەڵە ئەم کارەی کردووە، بەهەموو توانایەکمەوە دژی ئەم تاوانە دەوەستم‌و بەیان دژی ڕووداوەکە دەردەکەم!!".

# مام جەلال ئاگای لە تاوانەکە نەبوو
## (٢)

مام جەلال ئەوکاتە لە سەروچاوەی تووژەڵە بوو. لە بن دار گوێزێکی بەساڵاچووردا کۆکارەکانی ستالینی بە فارسی دەخوێندەوە. منی بینی کتێبەکەی داناو بەگەرمی پێشوازی لێکردم.

من گوتم: "مام جەلال ناوی نوری حەمە عەلیت بیستووە؟".

ئەو گوتی: "ئەو بە پێشمەرگەیەکی ئازاو مرۆڤێکی دڵسۆز، نیشتمانپەروەرو پاک ناسراوە. چۆنی ناناسم. هەر زۆر لە نزیکەوە دەیناسم، پیاوێکی ناسراو و بەرێزە!".

من گوتم: "دەنگوباسی سلێمانیت پێنەگەیشتووە؟".

مام جەلال: "هێشتا هیچ دەنگوباسێکم پێنەگەیشتووە!".

من گوتم: "نەتبیستووە، نوری حەمەعەلی شەهید کرابێت؟".

مام جەلال: "کەی شەهید کراوە؟".

من گوتم: "دوێنێ شەهید کراوە!".

مام جەلال: "بەڕاستی لەدڵەوە پێمناخۆشە، سەد حەیف، ئەمە کاری رژێمە، سادەترین گومان لە مرۆڤێکی دڵسۆز بکات لەناوی دەبات!".

من گوتم: "خەڵکی سلێمانی رووداوەکەیان زۆر پێناخۆشە، پتر لە بیست هەزار کەس دوای تەرمەکەی کەوتوون..".

مام جەلال: "بریا چوار پیاوی وەکو ئەو لەناوماندا بونایە، پیاوی وا زۆر بە زەحمەت دروست دەبێتەوە..".

مـــن گـــوتم: "ئەو بیســـت هەزارەی دوای تەرمەکەی ئەو کەوتوون، زۆربەیان لەوە دڵنیان یەکێتی ئەم تاوانەی کردووە..".

مام جەلال بە شڵەژانەوە قسەکەی پێبڕیم: "بۆ یەکێتی یەکێکی وەکو نوری حەمە عەلی بکوژێت؟".

من گوتم: "کاتێک پتر لە بیست هەزار کەس لەو بڕوایەدا بن یەکێتی دەستی لەم تاوانەدا هەبێت، ئەمە کارەساتە. واتە: ئێمە هەر لەئێستاوە متمانەی سەد هەزار کەسمان لەدەست داوە.. من هیوادارم راستی بۆ خەڵک دەربکەوێت، یەکێتی لە جێبەجێکردنی ئەم تاوانەدا بێبەریە!".

مام جەلال: "من بزانم یەکێتی ئەم کارەی کردووە، یان یەکێک لەپشت مەکتەب سیاسیەوە، ئەم تاوانەی کردووە، دەڕۆمە سەر ئێزگەو دەڵێم: من لەم تاوانە بێئاگامو ئەمە لەپشت مەکتەبی سیاسیەوە کراوە، من یەک رۆژ لەناو شۆڕش نامێنمەوەو هیچ پەیوەنـدیەکم بەیەکێتیـیەوە نیـیە! دەڕۆمو یەک رۆژ لەم وڵاتە نـامێنمەوە. چـۆن لەپشـت ئـێمەوە کەسـانی دڵسـۆز و نیشتمانپەروەر دەکوژن؟".

من گوتم: "لە سەرکردایەتی نوێی کۆمەڵە، کەس قسەیەکی بە گوێتا نەداوە. با کەسانی سەر بە پارتی، یان ئەوانەی کۆن لەناو پارتیدا بەرپرسیاریتیان هەبووە، لەپەناوە بکوژرێن..؟".

مام جەلال: "یەکێک چەکی پێبوو هاتە سەرت، ئەوە ناچاری داکۆکی لەخۆت بکەیت. کەسێک لەماڵی خۆی دانیشتبێتو هیچی نەکردبێت، بەگوێرەی کام قانونو کام بڕیار تۆ لەسەر بنەمای گومـان خەڵکی بێتاوان بەر گولله دەدەیت؟ شـۆڕش چـۆن وا دەکرێت؟".

من دڵنیا بووم مام جەلال ئاگای لە هیچ نەبووەو بەتوندی دژی ئەو زنجیرە تیرۆرکردنی "ژنان"و ئەندامانی حزب‌و رێکخراوی "نەیار"ی یەکێتییە. من دووبارەم کردەوە "ئایا سەرکردایەتی ناوخۆ مافی ئەوەیان هەیە، لیژنەی ئیغتیالات دروست بکەن‌و لیستی ناویان بدرێتێ؟".

مام جەلال: "من تا ئەو رۆژەی لە دنیادا بمێنم، بە کەسێک ناڵێم: برۆ لەسەر بیروباوەڕ، کەسێک بکوژە! ئەی تۆ لەناو سەرکردایەتی‌و کادرەکانی کۆمەڵە هیچت نەبیستووە؟".

من گوتم: "من تەنیا سەرقاڵی کاروباری مەکتەبی راگەیاندنم!".

مام جەلال گوتی: "با برۆین بۆ لای برایانی کۆمەڵە، رەنگە ئەوان زانیارییەکی ئەوتۆیان هەبێت، بتوانین سەر لەم مەتەڵە دەربکەین!".

بەدرێژایی رێگای نێوان توژەڵەو خرینێوزەنگ مام جەلال زوخاوی هەڵدەڕشت‌و دوعای دەکرد، کەسێک لە سەرکردەکان، دەستی لەم رووداوە قێزەونانەدا نەبێت.

لەوێ فەرەیدوون عەبدولقادر پێشوازی لێکردین. مام جەلال تۆزێ بە حیدەتەوە باسی رووداوەکانی کرد. هەڕەشەکەی دووپاتکردەوە "ئەگەر بزانم کەسێک لەپشت (م.س)ەوە بڕیاری کوشتنی خەڵک، دەرکردبێت، ئەوە من بەیانێک لە ئێزگەوە دەردەکەم‌و جانتاکانم دەپێچمەوەو دەڕۆم‌و یەک رۆژ لەناو شۆڕشدا نامێنمەوە..".

فەرەیدوون ویستی، سەرجەمی حەملەی تیرۆری سەرکردەو کادرە عەسکەری‌و سیاسیەکانی (پ.د.ک) بۆ هەلومەرجی

بـارگرژیو دەرهاویشـتەکانی (کارەسـاتی هەکـاری)و شـێوەی راگەیاندنی یەکێتی، کە بەرامبەر بە پارتی زۆر توندە، بگێڕێتەوە. قســەکانی ئەو لەم گـوێی مـام جەلالەوە چـوو، لەوەکەیـانەوە دەرچـوو. مـام جەلال گـوتی: "ئـێمە لەسـاڵی (١٩٧٦)ەوە لەسـەر یەکتری دەنووسینو چەندین شەڕی قورس لەنێوان ئێمەو قیادە مـوەقەتەدا روویـداوە. بەڵام ئـێمە وەکـو (م.س) داوامـان لە رێکخسـتنو سـەرکردایەتی نـاوخۆ، یـان لیـژنەی ئیفتیـالات نەکردووە، سەرکردەو کادری پارتی یان خەڵکی بێلایەن بکوژن. مـن ئەوە دەخـوێنمەوە: لەپشـت ئێمەوە، بەلارێدا چوونو کـاری لابەلا هەیە. تـۆ دەتەوێ بڵێیـت: کەسـانێک، لەبـن کـاریگەری راگەیاندنی ئێمە، لەخۆیـانەوە، دەستیان بە لەنـاوبردنی دۆسـتو لایەنگرانـی پـارتی کـردووە؟ ئەمەی کـراوە کـارێکی (رێکخـراو)ە: بڕیار دەرچووە بۆ لیژنەیەک: لیستی نـاو خراوەتە بەردەستیان: چەک، تەقەمەنـی، ئۆتۆمبێلیـان بـۆ دابـین کـراوە. ئەمە رێـکەوتو کـاری خۆڕسـک نییە. ئەمەی کراوە هەمـووی بە پـلانو بڕیـاری پێشەکی دراوکراوە.

چـۆن خەڵـک دەچێت نـوری حەمە عەلـی، عەبـدولی سـۆران، بـلەی حەمە خورشــە، بە رۆژی نیــوەڕۆ، لەبەردەم دەرگــای مـاڵەکەی خۆیـاندا دەکوژێت؟ مـن وەکـو سکرتێری گشـتی هـیچ پاسـاوێکی مەنتیقـی بـۆ ئەم کـارانە نـادۆزمەوە. بە ڕاشـکاوانە ئەوەتــان پێـدەڵێم: مــن بەتونـدی ئیـدانەی ئەم تاوانــانە دەکەمو ئەوەی کردوویەتـی دەبـێ موحاسـەبە بکرێت. ئەمڕۆش بەنـاوی مەکتەبی سیاسەوە بەیانێک دەردەکەم..".

# بەیانێك ژێر بەرەی خستە سەر بەرە
## (٣)

هەردووکمان پێکەوە گەڕاینەوە. بەدرێژایی ڕێگاکە مام جەلال هەر پێشـیدەخواردەوە.لە ناوەنـدی نـوێی کـۆمەڵە تێگەیشـتم: کاسـەکە بێ ژێر کاسـە نییە: (دایکەکەی دایکم چارۆکە ماوی، دەسـتە چەورەکەت بە منـدا ئەسـاوی)! مـام جەلال لە قسـەکانی فەرەیدوون باش باش تێگەیشت: بڕۆن لەناو کادێندا بۆ دەرزی بگەڕێن!

پاش سەعاتێک مام جەلال بەیانێکی یەک لاپەڕەیی بۆ ڕەوانە کردم: تووڕەیی، هەڵچوونو پەلەپەلی پێوە دیار بوو: هەستم کـرد ئەو بە راسـتەوخۆ دەیەوێت: تاوانەکـانی بخـاتە ئەسـتۆی کەسانێک، گوایە: ئەوان بەناوی شۆڕشەوە ئەم کارەیان کردووە، ئەمەش زیان بە ناو و ناوبانگی شۆڕش دەگەیەنێت.من پێموابوو: بڵاوکـردنەوەی بەیانێـک بەم شـێوەیە زیـان بە ناووناوبـانگی شـۆڕش دەگەیەنێـت، تەنیـا لەبەر یەک هـۆی سـەرەکی: لێتـوێژینەوەو لێپێچیـنەوەی ورد نەکـراوەو لایەنـی بڕیـاردەر نەدۆزراوەتەوە..بەیـانەکەم* بە کـاوەخۆ سـەرلەنوێ داڕشـتەوە، بەڵام بە لۆجیکو تێڕوانینێکی زۆر جیاواز. ئەوەی بیرم مابێت، بەم شێوەیە نووسرابوو:

".. لە چەند مـانگی رابـوردوودا زنجیرەیەک تـاوانی گەورە لە سلێمانی ئەنجـام دراون. چەنـد تێکۆشـەرێکی ناسـراوی وەکـو (نـوری حەمەعەلـیو عەبـدولی سـۆرانو..) شـەهید کـراون. ئەم

---

* ئەم بەیانە لە ئەرشیفی هاوڕێیەکی ئازیز تا ئەمڕۆ پارێزراوە.

شەهیدانە کەسانی دڵسۆزو نیشتمانپەروەرو ئازیادیخواز بوون. ئەمانە کەسانێک بوون بەدرێژایی ژیانیان دژی رژێمی فاشی بەغدا خەباتیان کردووەو قوربانیەکی زۆریان داوە. رژێم زانیاری وردی لەسەریان هەبووە، ئەمانە پاش ماوەیەکی کورت دەچنە ریزی شۆڕشەوە. بۆیە رژێم بە دەستێکی رەش ئەم تێکۆشەرو نیشتمانپەروەرانەی تیرۆر کردووە.

ئێمە لەکاتێکدا بەتوندی ئیدانەی ئەم تاوانانە دەکەین، دڵنیاتان دەکەینەوە خەباتی گەلەکەمان تا رووخاندنی رژێم بەردەوام دەبێت...".

بەیانەکە زۆر بە وردیی، لۆجیکی، حەماس، بەسۆزەوە داڕێژرابوو. دەستە چەورەکانی کەسانی ناسراوی نەناسراومان بە پشت ملی پیاوانی رژێمدا سوی. هەردوو دەقەکەم رادەستی ئومێدی سەعید گەوهەر کرد، بۆئەوەی پێشکەشی مام جەلالی بکات. بەهیوای ئەوەی خۆی هەردوو دەقەکە بخوێنێتەوەو بەراوردیان بکات. دەقەکەی خۆی بەدەستکاریەوە رەوانەمان بکاتەوە. کەچی ئەو دارشتنەکەی منی زۆر بەدڵ بوو. دەستخۆشیی لێکردمو بە حاجی ئومێدی گوتبوو: دەقەکەی مامۆستا جەعفەر تایپ بکەنو با یەک هەفتە لە ئێستگە لێی بدرێتەوە..

من دڵنیابووم مام جەلال بەهیچ شێوەیەک ئاگای لە بەبابەتەکە نییە. لە سالار عەزیزو مەلا بەختیارو مولازم عومەریشم پرسی، بێئاگایی خۆیان راگەیاند. هیچ سەرەداوێکم دەست نەکەوت. هەستم دەکرد: یەکێک بەبێ ئاگاداری (م.س)و (ناوەندی کۆمەڵە)و لەپشت سەرکردایەتی ناوخۆوە لیژنەیەکی ئیغتیالاتی تایبەتی پێکهێناوە، ملی کەسانی جیاجیای ناو یەکێتیو

دەرەوەی یەکێتی درووێنە دەکات. گومان لە فلان‌و فیسار دەکرا. بەڵام گومان‌و گریمانە بۆ لێکۆڵینەوەی فەلسەفی‌و سیاسی پێویستن‌و بەکاردەهێنرێن: بۆ دەستنیشانکردنی کەسانی خاوەن بڕیارو ئامرازەکانی جێبەجێکردن، دەبێ (بەڵگەی تاوان)ی یەکلاکەر بەدەستەوە بن.من لەبەرئەوەی بەدرێژایی ژیانم بڕوام بە تیرۆر نەبووە، تەنانەت دژی کوشتنی کەسانی سەر بە رژێمیش نەبووم. ئەم جۆرە بیرو کارە لەگەڵ گەشەکردنی سروشتی کۆمەڵ ناگونجێت‌و زیان بە بزاڤی سیاسی ئازادیخواز دەگەیەنێت. مارکس دژی تیرۆر بووە. لینین بڕوای بە زەبروزەنگ‌و شۆڕش هەبووە، کەچی بەتوندی دژی تیرۆری سیاسی بووە.

# وریاری وەستا وەهاب

## (٤)

عەبدولرەزاقی وەستا وەهابی نەقاڕ (١٩٥٦-١٩٨٣) کە بە (شەهید وریا) یان (وریای وەستا وەهاب) لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا ناسراوە، من وەکو (دیاردە)یەک نووکی قەڵەمەکەمی دەخەمە سەر، نەک وەکو ڕووداوێکی ئاسایی. پاژێکی دیاریکراو مەلەفەکەیان بەدەستەوە بووە: زنجیرەیەک هەڵەیان کردووەو هەڵەکانیشیان بە هەڵەی قورستر چارەسەر کردووە: بزاڤێکی سیاسی شۆڕشگێڕی ئازادیخواز، پێویستی بە تیرۆری سیاسیو ناسیاسی نییە. پێویستی بەوە نییە ئەندامێکی خۆی بکاتە بکوژو پاشان بە دڕندانەترین شێوە، ئەو ئەندامە فیداکارو بوێرەی خۆی بکوژێتەوە!

بەیانەکەی (م.س) کۆتایی بە (لیژنەی ئیغتیالات)و چالاکیو جموجوڵو تیرۆری (ڕێکخراو)ی ئەوان هێنا. سەرکردایەتی ناوخۆ ناچار بوو، دەستبەرداری ڕێکخراوی چەکداری شاریی ببێتو نەوێرێت لەخۆیەوە یان بە فەرمانی (سەرکردە)یەک، لەپشت دەزگای (م.س)ەوە بڕیاری کوشتنی ئەمو ئەو دەربکات. هیچ ئەندامو پێشمەرگەیەکیش نەیدەوێرا لەخۆڕا، بەشداری لەم جۆرە چالاکیانە بکات.ئەو لەناو شار دەبێت، کاتێک لە رادیۆوە گوێی لە بەیانەکەی (م.س) دەبێت. یەکسەر پەیوەندی بە هاوڕێکانیو کۆمیتەی سەرکردایەتی ناوخۆوە دەکات، کە خۆیشی ئەندامی ئەو کۆمیتەیە بووەو لێپرسراوی ڕێکخراوی چەکداری ناو شاریش بووە، کە لیژنەی ئیغتیالاتی پێدەگوترا.

لای هەر هەموویـان سـەرسـامیی خـۆی پێشـان دەدات: ئێـوە بە نامەی سـەرکردایەتی ناوخۆو سکرتێری کۆمەڵە، داواتـان لێکـردم کۆمەڵێـک جاسـووسو بەکرێگیـراو و پیـاوخراپو خـاین بکـوژم، کەچـی مەکتەبـی سیاسـی یەکێتـی ئەمـانەی هەمـوو بە شـەهیدی نیشـتمانپەروەرو دڵسـۆز دانـاوە! کـێ راسـت دەکـات، ئێـوەو سـکرتێری کـۆمەڵە، یـان (م.س)؟ ئەوان نوسـیویانە: بەکرێگیراوەکـانی رژێـم ئەم تێکۆشـەرانەیان شـەهید کـردووە! کەواتە: مـن بەکرێگیـراوەکەمو ئەوەی بڕیارەکەشـی دەرکـردوە ئەویش دەستی لەگەڵ رژێمدا هەیە!

وریا ساڵی ١٩٨١ تەمەنی (٢٥) ساڵ بوو. تا پۆلی (شەشەمی ئامادەیی بەشی ئەدەبی) خوێندووە. لەسـاڵی (١٩٧٥)ەوە ئەندامی کـۆمەڵە بـووەو هەر لەوکـاتەوە، بەبەردەوامـی دەمـانچەی پێبینراوە.

سـەرەتای ئۆکتـۆبەری (١٩٨١) رووودەکـاتە قەرەداغو هەسـت دەکـات رووبەڕووی کێشـەیەکی گەورە دەبێـتەوە. نـزیکەی (٤٠) نـامەو لیسـتی لا بـووە، کە داوای لێکـراوە، ئەوەی نـاوی لە لیستەکاندا هاتووە، بەزووترین کات لەنـاوببرێن. چەند ئەندامێکی سـەرکردایەتیو کـادری پێشـکەوتوو، دەزانـن وریـا نامەکـانی بەجوانی پاراستووەو پێشانی هـاوڕێو دۆستەکانی داوە. ئەوان بەبەردەوامـی داوای نامەکـانی لێـدەکەنەوە، ئەویـش دەڵێـت: نامەکـان بـۆ مـن هـاتوون، مـن پیـاوێکی حـزبیمو گـوێڕایەڵی بڕیارەکـانی رێکخسـتنم: مـن کێشـەم لەگەڵ سـکرتێری کـۆمەڵەدا هەیە. نـاتوانم نامەکـان رادەسـتی ئەو بـکەمەوە. چـاوەڕوانی بەستنی کۆنفرانسـی دووەمـی کـۆمەڵەم. لەوێ هەر چڵ نـامەکە رادەستی کۆنفرانس دەکەم.

وەستا وەهابی نەقاڕ (١٩٢٩-٢٠٠١) چەند جارێک وریا دەبینێتو بەکراوەیی قسەی لەگەڵدا دەکات: (کوڕم چارەنووسی تۆ لەم ولاتە ئیتر زۆر زەحمەتە: نامەکان رادەستیان بکەیتەوە، هەر دەتکوژنو رادەستیان نەکەیتەوە هەر دەتکوژن. چاکترین چارەسەر بۆ تۆ ئەوەیە بۆ ئۆروپا بڕۆیتو جارێکی تر روونەکەیتەوە ئێرە. من باری دارایيم زۆر باشە، چەند پارەت دەوێ دەتدەمێ، هەموو پشتیوانیەکت لێدەکەم، لێرە مەمێنەوە!).

دەیان پێشمەرگەی دڵسۆز ئامۆژگارییان کردووە، خۆی لە کێشەو بەلای ناگەهان بپارێزێت، کەچی ئەو لەسەر رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ خاوەن بڕیارو نامەکان سوور بووەو خۆی بۆ دووەمین کۆنفرانسی کۆمەڵە ئامادە کردووە.

ئەوان داوای لێدەکەن نامەکانیان بداتەوە، ئەمیش دەزانێت نامەکانیشیان بداتەوە هیچ سوودێکی ئەوتۆی نییە. سکرتێری کۆمەڵە زۆر پەست دەبێت لە هەڵوێستو گوتارە ئاگرینە راستەکانی لێپرسراوی رێکخراوی چەکداری ناوشار.وریا لە گوندی هەڵەدن بۆ ئێوارەخوانێک، رۆژی (١٩٨٣/٩/١١) بانگهێشت دەکرێت. ئەوان پێنج کەسی بەهێز و قایموقوڵ بوون. ئەم بچووکو لاوازو رەقەڵە بوو، کێشی (٥٠) کغم کەمتر بوو. ئەوان بە پلان بۆ ئەو ماڵە تایبەتە بانگی دەکەن. وریا پێشبینی ئەوەی نەکردووە، هاوڕێکانی لەپشتەوە خەنجەری ژەهراویی لێبدەن. ئەوان دڵنیا دەبن وریا دەستی بگاتە دەمانچەکەی بەئاستەم بواری دەربازبوونیان دەبێت. لەپڕ هەر چواریان پەلاماری دەدەنو هەردوو دەستی توند توند دەگرن (غ)

(*)تەورێـک بە پشـتە سـەریا دەماڵێـتو بـۆ نـاو گەورێـک رایدەکێشنو کۆتـایی بە ژیانی دەهێنن. بە بێگیانیی گیرفانەکانی دەگەڕێـن، هـیچ نـادۆزنەوە! نە نـامەو نە بەڵگەنامەیـان پـێ دەدۆزرێتەوە..ئەوانەی بڕیاریـان داوە و تاوانەکەیـان جێبەجـێ کـردووە، بیرەوەرییـان نووسـیوە، بە یەک دێـڕیش ئەم رووداوەیـان بەسـەر نەکـردۆتەوە. ئەوانە سـوور زانیویـانە ئەم کـارە دڕندانە نامرۆڤانەیە مـایەی خۆهەڵکێشـانو شـانازی نییە: مرۆڤ وەکو مرۆڤ کێشەکان چارەسەر دەکات!

بەم رەفتارو کردارە وریا جارێکیتر دەبێتە قوربانی:

- جـاری یەکەم: لەبـری ئەوەی گەنجێـک فێـری خەبـاتی سیاسـیو رووناکبیری بکرێت، فێری تیرۆری رەشـی بێسوودو بێهوودە دەکرێت.

- جـاری دووەم: لەبـری ئەوەی ئەو کەسـانە بڕیـاری کوشتنو لیستی قوربانیان رێکخستووە، لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکرێـت، لێپرسـراوی رێکخـراوی پێشـمەرگەی ناوشـار لەناودەبرێـت، تەنیـا لەبەر یەک هۆکـاری سـەرەکی تەواوی شـوێنپەنجەو شـوێنەوارو (بەڵـگەی تـاوان) لەهـیچ شـوێنێکدا نەمێنێتەوە!

دوای دیارنەمـانی وریـا، کەسوکـاری دەکەونە دەریـای خەمو پەژارەوە: ئـای وریـا چیـت لێبەسـەرهات؟ زەوی قـووتی دای، ئاسـمان هەڵیلووشـیت!وەسـتا وەهـابی نەقـاڕ، ئایشـە حەسـەن وەیسـی، سـروە وەهـابو گوڵزاری حەمە سـابیری هەڵەبجەیـی

---

(*) دەیان کەس ناوەکانی لایە.. من ناوەکان بنووسمو نەنووسم هیچ ترخێکی ئەوتـۆی نیـیە. بریـا ئەوانەی بیرەوەریـان نووسـیوەو بەشـدار بـوون لە رووداوەکاندا، ئەوەندە بوێر بونایەو دانیان بە هەڵەکانی خۆیاندا بنایە!

هاوسەری وریا، دەرگا نامێنێت لێینەدەن و کون نامێنێت سەری پێدا نەکەن. چوار پێنج جار سەردانی سکرتێری کۆمەڵە دەکەن. هەر جارە قسەیەک دەکات: جارێک دەڵێت: دەستبەسەرەو چل نامەمان لایەتی و دەبێ بماندات‌ەوە. جارێک دەڵێت: بۆ ئێران رۆیشتووە.

بۆ دواجار لە بالیسان سەردانی دەکەنەوە. قسەکانی سکرتێر بۆنی ئەوەی لێدێت، کورەکەیان لەژیاندا نەمابێت. وەستا وەهاب وەکو شێرێکی بریندار بەگژیا دەچێت و بەرۆکی یەکتری دەگرن و نەرە نەرو هات و هاوار بەرزدەبێتەوە. ژنەکان دەست دەکەنە رۆڵەرۆو قیژەقیژو گریان. بەردەم دەرگاکەی لێدەگرن و جوێنبارانی دەکەن. نەوشیروان بەپێی خاوسی دێتەدەرەوەو دەمانچە سمسەکە لە کیفەکەی دەردەکات و پەلاماریان دەدات و هاوار دەکات: "دەبێ چلی تریشتان لێبکوژم. تا نامەکانم بۆ نەهێننەوە وازتان لێناهێنم!".

"...دەیەوێت بە دەمانچەوە پەلاماری وەستا وەهاب بدات، سروە خان بەردەمی دەگرێت. تا هێزی تێدابێت یەک شەق بەناوگەڵی سروەخاندا دەکێشێت.." ئەمە گێڕانەوەی پێشمەرگەیەکە، کە خۆی لەوێ بووە. من داوام لە سروە خان کرد، کە ئێستا لە ئوستراليا ژیان بەسەردەبات رۆژی (٢٠٢٠/٣/١١) رووداوەکەی وەکو خۆی پشتڕاست کردەوە.

ژمارەیەک ئەندامی سەرکردایەتی لەوێ بوون و نەیانهێشتووە کێشەکە گەورەتر بکرێتەوەو داوایان لێکردوون سەردانی مام جەلال لە خەتێ بکەن.

# ترس‌و تارمایی

## (٥)

گەلانی رۆژاوایی، هەر رووداوێک لایان رووبدات، بە درۆو دەلەسە پەردەپۆشی ناکەن‌و لە هەموو رووییەکەوە لەسەری دەنووسن‌و کاری لەسەر دەکەن. لە رۆژهەلات رووداوێک پێش (١٠٠٠) سال روویدابێت، سالی (٢٠٢٠) رێگەت پێنادرێت بەشێوەیەکی بابەتی لەسەری بنووسیت!

بە من بێت، منیش وەک ئەوەکانی تر بێدەنگیی هەلدەبژێرم! لە ولاتێک پیاوکوژ بە "ئازا" و "پالەوان" دابنرێت. دزو ساختەچی‌و دەستبڕ بە "کەیاسەتی" گەورەو هێژا دابنرێت. مرۆڤی رووناکبیری بوێرو رەخنەگر، بە بێکەلکو بوودەلەو چەنەباز دابنرێت. سیاسەتی: بەرد لەسەردانان، گونجاوترین سیاسەتە بۆئەوەی گەردنت بە شکاندن نەچێت.

لەبن ساباتی بیرەوەرییەکانمدا، جێگایەک بۆ هەلواسینی شیعری پاکانە نادۆزمەوە. پاکانە نووسین ئەرکی ئەوانەیە، کە تا ئانیشکیان لەخوێنی هابیل سوورە. من لە (قابیل)ەکان بێدەنگ نەبووم. ئەوەی لەدەستم هاتبێت کردوومەو چەپلەم بۆ هیچ (قابیل)ێک لێنەداوەو میدالیای سەروەری‌و ستایشم لە بەرۆکی خوێناوی هیچ کەسێکیان نەداوە.

کەسانی بێویژدان، مشەخۆرو ماستاوچی، بە بۆنەو بەبێ بۆنە، دەنووسن (مامۆستا جەعفەر ئەندامی ناوەندی کۆمەلەو م.س بووە، کەواتە: ئەویش لە تاوان‌و تیرۆری ئەو خەلکەدا بەپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆ!). کەسانێک (لغایە فی نفس یعقوب

قضـــاها) لەپشـــت ســـكرتێری گشـــتیو دامەزراوەی مەكتەبـــی سیاسیەوە، باندی تیرۆریان دروستكردبێت، لەبری "كوردایەتی" كەســـانی كوردپەروەریـــان تیـــرۆر كردبێـــت، منـــی (دامـــاوی بەسزمان) بەگوێرەی كام قانونو دەستوور، دەبێ هـاوبەشو هاوپشكی بەپرسیارێتی زنجیرەی تاوانەكانی ئەوان بم؟!

لە چركە پڕ شـەرمەزارییەكانی ئاشكرابوونی كەتنو تـاوان، ئەوە دەبێ منیش هاوبەشی بەرپرسیارێتی ئەو كارە دزێوانە بـم. بەڵام كاتێک گەزۆ دەبارێتو بە (١٠) ملیۆنو (٢٠) ملیۆن دۆلار بەســـەر ئەمـانەدا، لە كلـكەی هەوری ئـاڵەوە، هەرەس دەهێنـــێ، ناوی ئێمە لەناواندا نییە! لەمەدا ئێمە هاوپشـک نەبووینو ناومـان لە كولەكەی تەرێشدا بەرچاو ناكەوێت. كەسێک پرسیاری ئەوەی لێكـردن بـۆ لە فـلانە شـوێن ئەو تـاوانە كـراوە، یەكسـەر نـاوی كەســێكەی وەكــو مــن دەبــێ بەرزبكـرێتەوە. پێشــینان چاكیــان فەرمووە: لە شەڕا شەریكینو لە خێرا تەریكین!

كـاری لێكۆڵیاری راستگۆ ئەوەیە: لیسـتی نـاوی قوربانیەكـان، ناسنامەی سیاسیو كاراكتەرەكانیان لەبن زەڕەبین دابنێت. ئینجا كەسایەتی لەرزۆکو مۆتیڤی كەسانی بڕیاربەدەستت لەم بـوارەدا بــۆ دەردەكەوێــت. مـــن نامەوێــت شــیكاری دەروونـــی بـــۆ كەسایەتییەكانو پاڵنەری راستەقینەی ئەوان بكەم: بۆ دەنووكیان لەســەر ئەو نـاوانەی لە لیسـتەكاندا ناویـان هـاتووە، دانـاوە. ئەمە كـاری مـن نییەو ئەركـی ئەوانەیە نـامەی ماجسـتێرو دكتـۆرا لە بواری مێژوودا دەنووسن!

مـن بیـرەوەری دەنووسـمو لەسـەر تاوانێـک پێش چـل سـاڵ روویداوە، مەلەفی لێبێچینەوە پێكەوەنـانێم. بیرەوەری دەنووسـم! لەبن بروسكەو چەخماخەی رمو خەنـجەرو دەمـانچەی بێدەنگدا،

رووبەری گێڕانەوەکانم یەک لەسەد تێناپەڕێنێت. قەڵەمبەدەستو رەخنەگرانی (حزبی) رێژەی یەک لەسەدیش بە بەندە رەوا نابینن. نەتوانم لەسەر یەک لە سەدی رووداو و گرێکوێرەکان بنووسم: بوونو نەبوونی بیرەوەرییەکانم وەکو یەک وایە!

پاژێک لە لیستەکانم بینیوە . تیشک دەخەمە سەر رووبەرێکی زۆر بچوکی ژیاننامەی چوار پێنج قوربانی لە قوربانیەکان. پێنان لە هەڵەو خەوشو کەموکورتی، کەتنو ئاست نزمیو کەچکردنی بەها ئەخلاقیەکان نییە! ئینکاریو پێ لێ نەنان لەم سەردەمەدا، لێکەوتەی سیاسی زۆر خراپی هەیە: هەر بۆ نمونە: هەڵوێستی دەوڵەتی تورکیا لە جینۆسایدی ئەرمەن، لە ناوەوەو دەرەوە، زیانی بە تورکیا گەیاندووە، هیچ قازانجێکی ئەوتۆی لێنەکردووە!

١- شەفیق ئاغای ئەحمەد ئاغای فەتاح چەلەبی (١٩١٢-١٩٨٠) لە تەمەنی (٦٨)ساڵیدا رۆژی (١٩٨٠/٦/٢٧) تیرۆر کرا. لە شەستەکانی سەدەی پێشوودا نوێنەری مەلا مستەفای بارزانی بووە تا ساڵی ١٩٧٠.

ساڵانی (١٩٧٠-١٩٧٤) ئەندامی لقی چواری سلێمانی بووە. لە کاتی شۆڕش (١٩٧٤-١٩٧٥) بە پارێزگاری سلێمانیو کەرکوک دادەنرێت. فەرەیدوون عەبدولقادر جێگری بووە.

٢- سدیق ئەفەندی (؟؟؟-١٩٨٠) تا ساڵی ١٩٧٠ لێپرسراوی لقی چواری سلێمانی بووە. پاش بەیانی ١/ی ئازاری ١٩٧٠ بە لێپرسراوی لقی سێی کەرکوک دادەنرێت. ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پارتی بووە. رۆژی (١٩٨٠/٦/٢٩) تیرۆر کراوە.

٣- برایم محەمەد شەریف: ناسراو بە (بلەی حەمە خورشە) (١٩٣٢-١٩٨٠) نووسینگەی بەڵێندەرایەتی هەبووە. لە ناوەڕاستی

شەستەکاندا لێپرسراوی پێشمەرگەی ناو شاری سلێمانی بووە. پێشمەرگەی یەکێتی بۆ ناو شار گەڕابێتەوە، دوو سێ شەو لەماڵێ برایم ماونەتەوە. دوو سێ مانگ پێش تیرۆرکردنی لە رۆژی (١٩٨٠/١٠/١) مام جەلال نامەیەکی بۆ دەنێرێتو داوای بڕی سێ هەزار دیناری لێدەکات. ئەو، ئەو بڕەی نابێت، دەچێت قەرزی بۆ دەکاتو بۆی رەوانە دەکات.

".. تیرۆرکردنی ئەم پیاوە پەیوەندی بە (سیاسەت)و (کوردایەتی)ەوە نەبووە. لەکۆتایی شەستەکاندا لە بارەگای باڵی (م.س) نەوشیروان قسەیەکی رەق بەرامبەری دەکات، ئەمیش هەڕەشەیەکی زۆر توندی لێدەکاتو پێدەڵێت: (جارێکی تر قسەی وا بکەیت... تاد)" ئەمە قسەی یەکێکە لە هاوڕێ نزیکەکانی بلەی حەمە خورشە بۆی گێڕامەوە!

٤- ئەنوەری کەریم ئەفەندی ئابلاخی. بریندار کراوە، بەرە بەرە چاکبۆتەوە. لە مام جەلالەوە زۆر نزیک بووە. ساڵی ١٩٧٤ دەچێتە ریزی شۆڕشەوە. بە گومانی ئەوەی لەناو رێکخراوێکی نهێنی کار دەکات، ماوەی هەشت نۆ مانگ دەستبەسەر دەبێت.

٥- عەبدولی سۆران (١٩٣٥-١٩٨١) دوای ١١/ی ئازاری ١٩٧٠ بە سەرۆکی شارەوانی سلێمانی دامەزرێنراوە. لێپرسراوی لقی چواری سلێمانی پارتیو ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بووە. تا دوارۆژی ژیانی، خۆی بە چەپو مارکسی داناوە. رۆژی (١٩٨١/٩/١٨) تیرۆر کراوە. هادی حەمەڕەشید ئاغا، کە بە هادیە سور ناسراوە، ماوەیەک بەڕێوەبەری گشتی پۆلیسی سلێمانی بووەو هاوڕێی زۆر نزیکی عەبدولی سۆرانو نوری حەمەعەلیو جەزای عەلی کاتب بووە. گوتی: "ئێمە ئەم چوارە زوو زوو یەکتریمان دەبینی. رۆژێک پێیانگوتم: ئێمە

هەرسێکمان یەکێتین. لەوە تێناگەین: بۆ یەکێتی دەیەوێت بمانکوژێت؟* من چەندین جار لە هادیو برای ترم پرسیووە: ساڵی ١٩٨١ ئەم سیانە یەکێتی یان پارتی بوون؟ هەموو گوتیان کاتی خۆی پارتیو دوای ١٩٧٦ ئەندامی یەکێتی بوون.

عەبدولی سۆران ساڵی ١٩٥٩ وێڕای شیهابی شێخ نوری سەر بە باڵی هەمزە عەبدوڵلا بوون. ئەم هاوڕێیەتیە تا گرتنی شیهابی شێخ نوری بەردەوام بووە.

# کولتووری بکوژپەرستی

## (٦)

بۆ دەبێ کولتووری بکوژپەرستی بەناو تونێلی ترس‌و تۆقاندندا تێپەڕێت؟ ئایا لەناو حزبی سۆسیال دیموکراتی سویدی دیاردەی بکوژپەرستی بەدی دەکرێت؟

کولتووری بکوژپەرستی پەیوەندی بە دواکەوتنەوە هەیە، یان سیاسەتێکی دیاریکراو زەمینەی لەباری بۆ خۆش دەکات؟

راستیەکی زەق‌و زۆپ هەیە، لەئەنجامی میکانیزمی داگیرکراوی‌و ژێردەستەیی، کۆمەڵی کوردی گەشەکردنی سروشتی‌و ئاسایی بەخۆیەوە نەبینیوە. ژمارەیەک رووناکبیر ویستویانە هێزێکی مەدەنی شاری دروست بکەن‌و باسی چەک‌و تەقەمەنی لەئارادا نەبووە، کەچی لەبەر لاوازی "چینی مامناوەند"و سیاسەتی زەبروزەنگ‌و پاکتاوی نەتەوەیی‌و رەگەزپەرەستی، لایەنی مەدەنی (سڤیل) لەبەرچاو بزر بووەو لایەنی چەکدار سەر شانۆی سیاسی بۆ خۆی داگیرکردووە.

هێزی سیاسی مەدەنی، بەرگی هێزی سەربازی لەبەرکردو تفەنگی کردە شانی، بیری سیاسی، ئەخلاق، فەرهەنگ‌و کولتوور و نەریتی کۆمەڵایەتیش گۆڕانی بەسەردا هات. لوولەی تفەنگ، فەرهەنگ‌و نەریت‌و پێوەری تایبەت بەخۆی بەرهەمدەهێنێت: بۆ شەڕی پارتیزانی کوردی: بلە، خلە‌و عەلە، هەزار ئەوەندەی ئەلبێرت ئاینشتاین گرنگترن. دەمانچەیەکی چواردەخوری سی لەسەر سی، هەموو کتێبەکانی پێشەنگای کتێبی نێودەوڵەتی فرانکفۆرت دەهێنێت.

مـن نـازانم بە پیرۆزکردنـی تیـرۆری سیاسـی لای کـۆمەڵە لەکوێـوە سـەرچاوەی گرتـووە؟ کۆمەڵە بەحیسـاب ڕێکخراوێکـی مارکسی بوو. تیرۆری سیاسـی لای مـارکس زۆر نامۆیە. لینین بـڕوای بە شـۆڕشوڕاپەڕینی چەکـداری هەبـووە، ئەویـش زۆر دژی تیرۆری سیاسی بووە. ڕۆزا لوکسمبۆرگ بڕوای بە (حزبی پۆلاین)ی لینینی نەبووەو شوراو ئەنجومەنی شۆڕشگێڕانەی لا گرنگ بووە!

سـالی ١٩٧٦ و ١٩٧٧ ئاڕاسـتەی دەم لـوولەی دەمـانچەی گروپە چەکدارەکانی نـاو شـار، سـەر سـنگی سـمبۆلەکانی ڕژێـم بـوو. سـەرەتای شـۆڕش دەسـتبردن بـۆ تیـرۆر دژی ڕەمزەکـانی ڕژێم پاساوی خۆی هەبـوو: گوایە: پارسـەنگێک بـۆ ناهاوسـەنگی سەربازیو تەکنۆلۆژی نێوان شـۆڕشو ڕژێـم دروسـت دەکرێت. پـاش ئەم دوو سـاڵە، دەمـی لـوولەی دەمانچەکـان، بەم لادا وەرچەرخێنـران. کەسـانی نیشـتمانپەروەر، دڵسـۆزو کـادری پێشـکەوتووی کـۆمەڵە، یەکێتـی، حسـیک، بە ڕۆژی نیـوەڕۆ، بەبەرچاوی خەڵکەوە ساردکرانەوە.

پاژێـک لە بـازنەی لێکۆڵیـارو چـاودێرە سیاسیەکانی ئەوسـاو ئەمڕۆ پێیانوایە: زۆربەی قوربانیەکان، پێشتر سـەرکردەو کادری ناوداری پارتی بوون. ئەو کەسـەی لەدوورەوە، بە نـووکە قەڵەم، لەپشـت شـاخەکانەوە، بڕیـاری تیرۆرکردنـی داوە، هەنگـاوێکی پێشوەختی ناوە، پێش ئەوەی پارتی ببوژێتەوە، بەزووترین کات لەملیـان بـدرێت. ئەم هەنگـاوە بە ئینگلیـزی پێـی دەگوترێـت: (Prevent War- واتا: شـەڕی پێشـلێگرتن)! گوایە: ئەو کەسـە چاوی لەسـەر داهـاتوو بـووە. ترسـی ئەوەی هەبـووە: پـارتی بـۆ سەر شانۆی سیاسی بگەڕێتەوە.

پـاژێکی تـر پێیـانوایە: ئەو کەسـە تەنیـا چـاوی لەسـەر تارماییەکـانی رابـوردوو بـووە: ویسـتویەتی بە دەسـەڵاتی 'ئەوکاتە'ی تۆڵە لە مۆتەکەو تارماییەکانی رابوردوو بکاتەوە.

قوربانیەکانی بە رێکەوتو 'رەشبگیر' بەرکەوتوون، یان یەکە یەکە هەڵبژێردراون؟ ئەوەی مـن بیستوومە: پاژێکیـان 'داخ'یـان بەدڵـیەوە نـاوە: نـوری حەمە عەلـی پـاش ١٩٧٦ پەیوەنـدی بە کـۆمەڵە و یەکێتـیەوە دەکـات. سـاڵی ١٩٧٤-١٩٧٥ لە شـەڕی بەرەنگاریدا وەک پاڵەوانێکی کەموێنە نـاوی دەرکرد. بلەی حەمە خورشـە کەسـایەتی ناسـراوی بـاڵی (م.س) بـوو، لێپرسـراوی پێشمەرگەی ناو شار بوو. جارێکیان لەناو بارەگای لقی سلێمانی بەبەرچاوی خەڵکەوە، ئەو قسـەیەکی بێتام بەرامبەر برایم حەمە شـەریف دەڵێـت. ئەویـش حیسـابی پووشـێکی بـۆ نەکـردووەو هەڕەشـەیەکی ئەوتـۆی لێـدەکات، تـا دوا رۆژی ژیـانی بیـری نەچێتەوە.. بەگـوێرەی ئەم خوێنـدنەوەیە بێـت، ئەو نەیتوانیـوە بەسەر پەرژینە دڕکاویە رەشەکانی رابوردوودا باز بدات.

تێڕوانینی مـن ئەوەیە: ئەو ویستویەتی بە تیرێک دوو نیشـان بشـکێنێت: بە شـیرێکی ژەنگـاوی کەپەرەوە، شـەڕی دۆڕاوی ئاشـەبا باڵـدارەکانی رابـوردووی کـردووە. خوێنڕشـتنی کەسـانی دڵسۆزو نیشتمانپەروەر نیشـانەی سـەرکەوتن نییە. مـن تیۆریی Prevent War بە گونجـاو نـازانم، دەرهاوێشتەو ئەنجـامگیری دەکەمە پێوەر. کـردەوەو رەفتـاری ئەو لە شـاخو لە شـار، پـارتی بەهێزتـر کـرد. ئەم قسـەیە سـاڵی ١٩٧٩ لە ناوەنـدی کـۆمەڵە گوتومە. مێژوو، درەنگ بێت یـان زوو، لە غەدرو تـاوانو بێدادی چاوپۆشی ناکات.

ئەو بڕیاربەدەستە ویستویەتی ترس‌و تۆقاندن بچێنێت. پێش ئەوەی پێ بخاتە شوێنێکەوە، دەنگوباسی دیلکوشتن، فیشەک بەناو دەمەوە نان، دەستپارێزی نەکردن لە کەسانی بەتەمەن، کەسانی تێکۆشەر، کادری کۆمەڵە.. ئەم شێوازە لە زەبروزەنگ جەنگیزخان، هۆلاکۆ، تەیمورلەنگ، زەرقاوی‌و بەغدادی کردە خاوەن هێزێکی ترسناک‌و تۆقێنەری بۆ دروستکردن. لەشکرو قەلەبالْغی لەسەر زەوی رۆژهەلاتدا، لە هەلومەرجی مێژوویی تایبەتدا، بە قسەی خۆش‌و شیعر هۆنینەوە نەهاتۆتە دی، رووباری خوێن، قەلای لە کەللەسەر دروستکراو، دەبێتە بزوێنەری قەلەبالْغی‌و لەشکری شێت‌و هارو تێکدەرو شێوێنەر.

ــ بڕوانامەی ماستەر لەساڵی ١٩٩٢ لەسۆسیۆلۆگیا زانستیو سیاسیدا ـ لەبەشی پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکان لەزانکۆی (جۆرج ئۆگست) لەئەڵمانیا وەرگرتووە.

ــ ١٩٧٠ یەکەم وتاری بەزمانی عەرەبی لەگۆڤاری (الف باء) ی بەغداییدا بڵاوکردۆتەوە.

ــ هەر لەهەمان ساڵدا پەیوەندی بە (یەکێتی قوتابیانی کوردستان)ەوە کردووە.

ــ لێپرسراوی لیژنەی ناوچەی خانەقی یەکێتی قوتابیانی کوردستان بووە.

ـ لەساڵی ١٩٧١دا بووە بە ئەندامی لقی دیالای یەکێتی قوتابیانی کوردستان.

ــ لەساڵی ١٩٧١ دا پەیوەندی کردووە بەکۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە، کە پێشتر ناوی (کملک) بوو.

ــ لەساڵی ١٩٧٤ــ ١٩٧٥ دا پەیوەندی کردووە بەهێزی پێشمەرگەوە، کە ئەوکاتە (پ. د. ک) بەسەرۆکایەتی مەلا مستەفا بەرزانی ڕێبەرایەتی دەکرا.

ـ ئەندامی لقی یەکێتی لاوانی کوردستان ـ لقی دیالا.

ـ بووەتە ئەندام لە (یەکێتی نوسەرانی کورد).

ــ ئەندامی کۆمیتەی باوەڕ لقی خانەقی (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان).

ــ ئەندامی (کۆمیتەی هەرێمی پێشڕەو) لقی بەغداو خانەقی لەساڵی ١٩٧٧.

ـ دامەزراندنی ڕێکخراوی (هەڵۆی سوور) لەبەغدا.

- سالّی ١٩٧٧چووەتە شاخو بەشداری لەدەستە چەكدارەكانی ئەردەاغو گەرمیان كردووە.
ـ لەسالّی ١٩٧٨دا بووەتە ئەندامی (ناوەندی كۆمەلّە) كە پێكهاتبوون لە (نەوشیروان مستەفا، ئازاد هەورامی، م. جەعفەر)
- ئەندامی مەكتەبی سیاسی یەكێتی نیشتیمانی كوردستان بووە.
ـ ١٩٧٩ لێپرسراوی ناوەندی راگەیاندنی یەكێتی نیشتیمانی كوردستان.
- ١٩٨٢ بەرەو ئەلّمانیا كۆچی كردووە.
- ١٩٩١ ئەندامی رێكخراوی یەكێتی نوسەرانی جیهان (PEN)
ـ ئەندامی دەستەی نوسەرانی گۆڤاری رووناكبیری بووە، كە ئەوكات لەستوكهۆلّم دەردەچوو.
ـ بەشداری لەچەندین سیمینارو كۆنگرەی جیهانیدا دەربارەی مەسەلەی كورد لەشارەكانی (برێمن، لۆزان، بۆن، دۆسلدۆرف، ئەمستەردام، بەرلین، گوێتنگن.. هتد) كردووە.
ـ ئەندام بووە لەلیژنەی دامەزرێنەری رێكخراوی دۆستایەتی ئەوروپی - كوردی.
ـ سالّی ٢٠٠٠ پیشاندانی فیلمی (نالی) كە سیناریۆكەی لەنووسینی مامۆستا جەعفەرە.
- لە (٢٠٠٣) گەڕاوەتەوە كوردستان
- لە (٢٠٠٤) بووەتە لێپرسراوی مەكتەبی بیروهۆشیاری (ی. ن. ك)
ـ یەكێكە لەدەستەی دامەزرێنەی (بنكەی ژین) بۆ چاپكردنو بلاوكردنەوەی بەلّگەنامەو بلاوكراوەی كوردی.
- لەكاتی ئێستادا لێپرسراوی ناوەندی مێژووی (ی. ن. ك)ە.

**بەرهەمو بڵاوکراوەکانی:**

١.خۆرگیران - کورتە چیرۆک خڕینیوزەنگ ١٩٨١

٢.راوەماسی - رۆمان ستۆکهۆڵم ١٩٨٦

٣.لەگێژاودا - کورتە چیرۆک ستۆکهۆلم ١٩٨٨

٤.هەڵۆی سوور - ( سیناریۆ) ٢٠٠١

٥.پێکهاتنی چوارچێوەی ئابوریو سیاسی ـ چینی بۆرجوازی لەشاری سلێمانی ٢٠٠٣

٦.التیارات والاتجاهات الادبیه والفکریه فی القرن التاسع عشر ـ التآخی ١٩٧٢.

٧.خانقین خلال ربع قرن (١٩٠٠ـ ١٩٢٥)، خمس حلقات ـ (التآخی) ١٠و ١١و ١٢و١٣و ١٤ حزیران ١٩٧٣.

(خانقین خلال ربع قرن (١٩٠٠ـ ١٩٢٥) بحث میدانی ـ السلیمانیه ـ ٢٠٠٥.

٨.الرومانتیکیه فی الادب الکردی ـ مجلة الثقافه، عدد (١)س (٤) ص (١٠١) بغداد ـ ١٩٧٤.

٩.لماذا سادت اللهجه الکورانیه فی الادب الکردی ـ مجله الثقافه ـ بغداد ١٩٧٣.

١٠.چەند لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی شەڕی پارتیزانی ـ خڕی نێوزەنگ. ـ ١٩٨١

١١. Fadil Ahmad: Die Stellung der Frau in der Kurdischen Gesllschaft.

In: VIA Magazin (Bonn).3 (1991) S. 1-120

•گوتاری: دەوری ژن لەکۆمەڵی کوردستاندا (بە ئەڵەمانی) لەگۆڤاری(V1A) دا بڵاوکراوەتەوە.

١٢. Fadil Ahmad: LUTTE ARMEE ENTRE LE MYTHE ET LAREALITE

In: HALKAWT HAKIM Les Kurdes par- dela 1. .Exode. Paris 1993

•وتاری خەباتی چەکدار لەنێوان ئەفسانەو راستیدا. لەلایەن (د. هەڵکەوت حەکیم)ەوە کراوەتە فەرەنسیو لەکتێبێکدا ساڵی ١٩٩٢ لەپاریس بڵاوکراوەتەوە. ئەم وتارە لەگۆڤاری یەکگرتندا بڵاوکراوەتەوەو چەندین کەس لەسەریان نووسیوە.

Fadil Ahmad Die Kurdische Befreiungsbewegung .١٢ zwischen Stammeskultur und politischer Erneurung. .Hildesheim.1994

•کتێبی: بزوتنەوەی رزگاری گەلی کورد لەنێوان کەلتووری عەشرەتگەریو مۆدێرکردنەوەی سیاسیدا. ئەمە نامەی ماجستێرەو ساڵی (١٩٩٤)ە و لەشاری هلدسهایم چاپکراوەو بڵاوکراوەتەوە.

١٤.ئەڵوەنو ئەفسانە رۆمان، سلێمانی، ٢٠٠٤

١٥.مێژووی بیری کوردی، لێکۆڵینەوە، سلێمانی ٢٠٠٥

١٦.الصقر الاحمر (سيناريو) (ترجمة: شهاب القرەلوسی)، السليمانية ٢٠٠٥

١٧.مێژووی خانەقین ، بەرگی یەکەم.

١٨.مانفێستی مەکتەبی بیروهۆشیاری بۆ مۆدێرن کردنەوەی (ی. ن. ک) سلێمانی ٢٠٠٦.

١٩.شاری سلێمانی، ململانێی گروپە کۆمەلایەتییەکان ١٨٢٠ ـ ١٩٢٠، سلێمانی، ٢٠٠٦.

٢٠.هەڵۆی سوور (چاپی دووەم) سلێمانی ـ ٢٠٠٧.

٢١.ئەزموونی سۆسیال دیموکراتی ئەڵەمانیا ـ سلێمانی ٢٠٠٧

٢٢.مام جەلال ـ سلێمانی، چاپی یەکەم، ٢٠٠٧

٢٣.هەرێمی کوردستانو تورکیا ـ سلێمانی، ٢٠٠٨

٢٤.	كەركوك بۆ مێژوو دەدوێت ـ ئا: عەدنان كاكە رەش ـ سەرپەرشتیار: مامۆستا جەعفەر ـ سلێمانی، ٢٠٠٧
٢٥- گۆران لەیادەوەری هاوچەرخەكانیدا، كتێبێكی هاوبەش لەگەڵ ڕێبوار حەمە تۆفیق، ب١ ـ سلێمانی، ٢٠٠٧
٢٦- كردستان والسياسة السوفيتية في الشرق الاوسط ـ تأليف فاضل رسول ـ ترجمة: غسان نعسان ـ تقديم ومراجعة: ماموستا جعفر ـ السليمانية، ٢٠٠٨
٢٧- مسالة ابادة الارمن امام المحكمة ـ الطبعة الاولي ـ ترجمة: غسان نعسان ـ تقديم ومراجعة: ماموستا جعفر ـ السليمانية ـ ٢٠٠٨
٢٨- مسألة ابادة الارمن امام المحكمة ـ الطبعة الثانية ـ ترجمة: غسان نعسان ـ تقديم ومراجعة: ماموستا جعفر ـ السليمانية ٢٠٠٨
٢٩- قيام نظام الاماراتي وسقوطه ـ د. سعد بشير اسكندر ـ ط٢ ـ تقديم: م جعفر (فاضل كريم احمد)
٣٠- ئیدارەی كوردی، سلێمانی، ٢٠٠٩
٣١- تاراوگەو گوڵە ژاكاوەكانی بەهەشت ـ كورتە چیرۆك، سلێمانی، ٢٠٠٩
٣٢- دەربارەی كورتە چیرۆكەكانی مامۆستا جەعفەر ئەم كتێبە بڵاوكراوەتەوە، غسان نعسان ، قصص فاضل كريم أحمد، تأبى المنفى اينما رحلت، السليمانية ٢٠٠٩
٣٣- بەرەو ستراتیژێكی نوێی هێزە سیاسییەكانی گەلی كوردستان، نامەیەك بۆ سەركردایەتی حزبە كوردستانییەكان، چاپی یەكەم، ساڵی ٢٠٠٩
٣٤- پاش بوومەلەرزەی هەڵبژاردن، مەكتەبی بیروهۆشیاری، دەزگای چاپو پەخشی حەمدی، سلێمانی ٢٠٠٩
٣٥- ماموستا جعفر (فاضل كريم أحمد)، تاريخ الفكر الكردی، ترجمة: د. بندر مندلاوی، مطبعه حمدی، السليمانية، ٢٠١١

٣٦- هەورێکــی نەزۆکو مێژوویەکــی نــاکۆک، مامۆســتا جەعــفەر، سلێمانی، ٢٠١١
٣٧- دەسەڵاتی کوردیو ئۆپۆزسیۆنی بێدەوڵەت، مامۆستا جەعفەر، ٢٠١١
٣٨- ســەرۆک وەزیـرانو تەکنیکی بەڕێـوەبردنی حکومەتی هەرێمـی کوردستان، دەزگای چاپو پەخشی حەمدی، سلێمانی ٢٠١٢
٣٩- گۆران لەیادەوەری هاوچەرخەکانیدا، بەرگی دووەم: بەهاوبەشـی لەگەڵا عەبدوڵلا زەنگەنەو ڕێبوار حەمە تۆفیق، سلێمانی ٢٠١٢
٤٠- کتێبی (کۆمەڵە لەسێدارەوە بەرەو ڕاپەڕین)، بەشێک لەژیاننامەی شــەهیدان (خــاڵە شیهابو جەعـفەرو ئەنـوەر) ئامـادەکردنو پێشــەکی نووسین (مامۆستا جەعفەر) چاپی یەکەمو دووەم ناوەندی مێژووی (ی. ن. ک)، سلێمانی ٢٠١٣
٤١- کتێبـــی (عەلـــی عەســـکەریو بـــزووتنەوەی سۆسیالیســـتی کوردســتان)، ئامــادەکردنو پێشــەکی بۆ نووســین مامۆستا جەعفەر، چاپی یەکەم، بڵاوکراوەکانی ناوەندی مێژووی (ی. ن. ک)، ســلێمانی ٢٠١٣
٤٢- سلێمانیو ململانێی گروپە کۆمەڵایەتییەکان، چاپی سێیەم، ٢٠١٤.
٤٣- مێژووی بیری کوردی، بەشی دووەمی لەژێر چاپدایە.
٤٤- مێژووی خانەقی، لە(١٥) بەرگ پێکهاتووەو ئامادەیە بۆ چاپ.



مامۆستا جەعفەر
(فازیل کەریم ئەحمەد)

بیرەوەرییەکانی مامۆستا جەعفەر وردترین و پڕ زانیاریترین نووسینە دەربارەی سەرەتاکانی شۆڕش و چالاکی ڕێکخراوی (هەڵۆی سوور)و دوا ڕۆژەکانی ژیانی شەهید ئارام و قۆناخی (حەملەی هەکاری) و پرۆسەی هەڵسانەوەی قەندیل و پاژێک لەژیاننامەی شەهیدو کەسایەتییەکانی ئەو سەردەمە تۆمار کردووە.. ڕووداوەکان بەبێ ڕتووش و ئارایش و جوانکاری خراونەتە بەرچاو، بە تەکنیک و زمانێکی ئەدەبی مۆدێرن داڕێژراون.

نرخی
8000 دینار